# الحكم بغير ما أنزل الله

لەسەر مەنهەجی **ئەهلی سوننە**

دوور لە

تەئصیلی **خەواریج** و تەنزیلی **مورجیئە**

نوسینی

**داستان محمد**

# الحُكمُ بِغَيرِ مَا أَنزَلَ الله

## حوكم كردن بە جگە لەوەی الله دایبەزاندووە

## لەسەر مەنهەجی ئەهلی سوننە

دوور لە

## تەئصیلی خەواریج و تەنزیلی مورجیئە


نوسینی

داستان محمد

پەیامێک بۆ خوێنەر:

گەر خاوەنی هەر عەقیدەیەکیت، ئەوا چاک بزانە کە نوسەری ئەم کتێبە هەموو ئەم حکومەتانەی ئەمڕۆ بە حکومەتی کوفری دەزانێت و بەرییە لە هەموویان، لە فەزلی اللە-یە کە چاوی کوێر نەکردووم لە ئاست حەقدا وەک هەندێک کەس ئەثەری (کفر دون کفر) بەسەر ئەم حکومەتانەی ئەمڕۆ دابەزێنم کە دوژمنی گەورەیان شەریعەتی اللە-یە، جا تۆی خوێنەر هەر چۆنێک لە کتێبەکە تێدەگەیت ئەوا شتێک مەدە پاڵم کە من لێی بەریم.

# پێرست

# پێشەكی

ابن عائشة دەڵێ: الله تعالی فرمانی بە بەندەكانی نەكردووە بە هیچ فەرمانێک ئیللا شەیتان لەم فرمانەدا دوو حەزی هەیە، یان بۆ زیادەڕەوی، وە یان بۆ كەمتەرخەمی، جا هەر كامیان بە دەست بهێنێ ئەوا پێی ڕازییە.

[رواه الخطابي في العزلة : لاپەرە 237]

ڕاستی و دروستی ئەم ووتەیە هەمووومان دەبینین و هەستی پێ دەكەین لە تەواوی ئەو فرمان و نەهیانەی كە لە دین هاتوون، هیچ فرمانێک نادۆزیتەوە ئیللا كەسانێک هەن زیادەڕەوی یان كەمتەرخەمی تێدا دەكەن، وە هیچ نەهیەک نادۆزیتەوە ئیللا بە هەمان شێوە زیادەڕەوی یان كەمتەرخەمی تێدا كراوە لەلایەن كەسانێكەوە.

ئەم بابەتەی ئێمەش كە بریتیە لە بابەتی حوكم نەكردن بە قورئان و حوكم بردنەوە بۆ لای ئەو كەسانەی كە حوكم بە قورئان ناكەن، دەبینین زیادەڕەوی و كەمتەرخەمی یەكجار زۆری تێدا كراوە، تەنانەت كەسانێک لەم بابەتەدا هەمان ووتەی خەواریج دووبارە دەكەنەوە بە جۆرێک ئەم بابەتەیان یەكسان كردووە بە پەرستنی كەسێكی تر لەگەڵ الله دا، تەنانەت گەیشتۆتە پلەیەک كە باسی ووشەی تەوحید دەكرێ جگە لەم بابەتە بیریان بۆ هیچی تر ناچێت، وە كەسانێكیش لە بەرامبەردا هەمان ووتەی جەهمیەكان دووبارە دەكەنەوە لە حوكمدان بەسەر كەسەكان لەم بابەتەدا، بە جۆرێک مەرجی نیمچە خەیاڵی دادەنێن بۆ تەكفیر كردنی حاكم، زمانحاڵیان دەڵێ: تاكو حاكم بە دەمی خۆی نەڵێ كافرم نابێ تەكفیر بكرێ، ئەگەرچی لە تەئصیلی بابەتەكەدا موافقی ئەهلی سوننەن بەڵام لە واقعدا دەبینین ئامانجیان تەكفیر نەكردنە لە بنەڕەتەوە، وە هەردوو لایەنیش لە زیادەڕەووەكان و كەمتەرخەمەكان ناویان لەخۆیان ناوە ئەهلی سوننە !!!

بەهۆی دەرکەوتنی ڕەوتێک لە سەدەی ڕابردوو بەناوی مەدخەلیەکان کە پاساو بۆ هەموو کوفرێکی حکومەتەکان دەهێننەوە کە سیاسەتیان بگونجێ لەگەڵیان، لە بەرامبەردا دەبینین لەو وولاتانەی کە سیاسەتی وولاتەکە ناگونجێ لەگەڵیان بۆ نموونە وولاتێک ئیخوان حوکمی تێدا دەکەن دەبینین مەدخەلیەکان ئەو سیاسەتەی کە بە دین بە خەڵکی دەفرۆشن و ناوی لێدەنێن شوێنکەوتنی سەلەف تەواو دەگۆڕێت، زولاڵترین دەنگیان هەیە بۆ ڕەخنە گرتن و دژایەتی کردنی حوکمەت لەو وولاتانەدا، جا مەبەست لێرەدا بەرگری کردن نیە لە ئیخوان بە هیچ جۆرێک چونکە گەر ئەوان ئیخوان بە بیدعەچی بزانن ئەوا من بە کافریان دەزانم نەک بیدعەچی، بەڵکو مەبەستەکە دەرخستنی دووفاقی و پیسی و گڵاوی ئەم ڕەوتەیە، لە وولاتانی تردا دژایەتی ئەوکەسانە دەکەن کە دژی حکومەتن، بەڵام لە وولاتێک کە ئیخوان حوکم بکات خۆیان دژایەتی حکومەت دەکەن، بیانووشیان بۆ ئەم دوو فاقیە ئەوەیە کە گوایە ئیخوان بە ناوی دینەوە ئەم کارە دەکەن بۆیە دژایەتیان دەکەین، بەڵام عەلمانیەکان بەناوی دینەوە نایکەین بۆیە هەڵوێستمان نەرمترە بەرامبەریان، وە هەرکاتێک باسی تەکفیری حاکم بێتە پێشەوە بەڵگە بە هەڵوێستی خروج نەکردنی ئیمام أحمد دەهێننەوە بەرامبەر خەلیفە عەباسیەکان تەنانەت دەڵێن تەکفیریشی نەکردوون ! ئەمە لە کاتێکدا مەعلومە کە المأمون و المعتصم و الواثق ووتنی قورئان مەخلوقە بە دینداریان دەزانی وکردبوویان بە دین لە خەڵکی، ئەی بۆ کاتێک کە باسی ئیخوان دەکرێ دەڵێن لەبەر ئەوە دژایەتیان دەکەین چونکە بەناوی دینەوە ئەم کارانە دەکەن، کەچی لە هەمان کاتدا بەڵگە بە هەڵوێستی ئیمام أحمد دەهێننەوە کە ڕێگای نەداوە خروج بکرێ لە سەردەمی فیتنەی خلق القرآن، کە یەکێک بوو لە گەورەترین کوفرەکان کە کرابوو بە دین بەسەرخەڵکیەوە، وە ئەهلی سوننە بەهۆیەوە دەکوژران و بەند دەکران ! گەر هەڵوێستی ئیمام أحمد دەکەن بە بەڵگە، کەوایە هەمان هەڵوێست بنوێنن بەرامبەر سەرۆکی تورکیا و ئەمیری قەتەر و سەرۆکی پێشووی مصر، لە کاتێکدا ئێوە پێتان وایە ئەمانە تەنها بیدعەچین کافر نین، بەڵام خەلیفە عەباسیەکان کەوتنە کوفرەوە، کەواتە دەبێ هەڵوێستی ئێوە زۆر نەرمتر بێت لە هەڵوێستی ئیمام أحمد، وە لە

کتێبی (أبو حنيفة: گومڕاکەی سەردەمی سەلەف و پێشەواکەی سەردەمی خەلەف) لە لاپەرە 514 تا 534 باسی هەڵوێستی ئیمام أحمد-م کردووە بەرامبەر هەر سێ خەلیفە عەباسیەکە، لە ڕووی تەکفیر و خروج نەکردنەوە، بگەڕێنەوە بۆی چونکە ئێرە شوێنی باسکردنی نیە.

جا بەهۆی دەرکەوتنی ڕەوتی مەدخەلی کە هەموو خەمێکی بەرگری کردن لە دەسەڵات و پاراستنی بەرژەوەندییەکانی خۆیانە، لە بەرامبەردا ڕەوتێک دروست بوون کە هێندە پڕ بوون لە کوفرەکانی ئەم حکومەتانە، هێندە پڕ بوون لە پاساو هێنانەوەی مەدخەلیەکان بۆ دەسەڵاتداران تا وای لێهات لەو بابەتانەی کە مەدخەلیەکان تەئصیلاتیان دروستیشە و موافقی ئەهلی سوننەیە هەر ڕەتی بکەنەوە و بە ئیرجاء و جەهمیەتی بزانن، ئەمەش وایکرد کۆمەڵێکی زۆر لە موسڵمانان بە جۆرێک لە جۆرەکان هەمان ووتەکانی خەواریج دووبارە بکەنەوە کە دوای وورد بوونەوە و لێکۆڵینەوە دەردەکەوێ کە تەئصیلاتیان بۆ بابەتی حوکم و تەحاکوم زۆر نزیکە لە خەواریج، بگرە هەندێکیان هەمان ووتەی خەواریجە، هۆکاری هەموو ئەمانەش دوور بوونە لە مەنهەج و کتێبەکانی سەلەف.

وە موافەقەکردنی ئەهلی سوننە لەلایەن مەدخەلیەکانەوە لە تەئصیلاتی ئەم بابەتە مانای ئەوە نیە کە مەدخەلیەکان شارەزا بن بە مەزهەبی سەلەف و شوێنکەوتەی سەلەف بن، بەڵکو ئەوەی مەدخەلیەکانی گەیاندووە بەم ئەنجامە زیاتر هۆکارەکەی ئەم پێشینە ئیرجائیەیە کە لە هەموو بابەتێکی تەکفیر هەیانە، زۆریش ئاساییە کەسێک کە ئەهلی سوننە نەبێت بگات بە هەمان ئەنجامی ئەهلی سوننە لە بابەتێکدا بەهۆی تەئصیلاتی خۆیەوە نەک بەهۆی شوێنکەوتنی سەلەفەوە، هەروەک دەبینین لە بابەتی قەدەر لە هەندێک شوێندا جەبریەکان موافقی ئەهلی سوننەن، بەڵام بەهۆی تەئصیلی خۆیانەوە گەیشتوون بەم ئەنجامە نەک بەهۆی ڕۆیشتن لەسەر مەنهەجی ئەهلی سوننە، قەدەریەکانیش بە هەمان شێوە لەو شوێنانەی کە هاوڕای ئەهلی سوننەن، وە هەروەها لە زۆر بابەتی تەکفیر هەیە

دەبینین مەنهەجی ئەهلی سوننە بریتیە لەوەی کە ئەم کارە یان ئەم ووتەیە کوفر نیە، بە خیلافی خەواریج کە بە کوفری دەزانن، کاتێک سەیری عەقیدەی مورجیئە دەکەین ئەوانیش بە کوفری نازانن، گەیشتنیان بە هەمان ئەنجامی ئەهلی سوننە بەهۆی ئیرجائەکەیانەوە بووە نەک بەهۆی شوێنکەوتنی ئەهلی سوننە، جا موافەقەکردنی مەدخەلیەکان بۆ سەلەف لە تەئصیلاتی بابەتی حوکم نەکردن بە قورئان بە هەمان شێوە پێشینە ئیرجائیەکەیان کاریگەری زۆرە کە گەیشتوون بەم ئەنجامە، هەروەک دەبینین بەشێکیان هەموو جۆرە کوفرێکی حکومەتەکان بە (کفر دون کفر) ناو دەبەن، یان حەلال کردن (استحلال) دەکەن بە مەرج بۆ کوفر، لە کاتێکدا لای ئەهلی سوننە حەلال کردن مەرجە بۆ تاوان نەک بۆ کوفر، وە زۆرینەیان هەموو کوفرەکانی حکومەت بە بابەتی ئیقامە حوججەوە پەیوەست دەکەن ئەگەرچی کوفرەکە وەک خۆر ڕوون بێت و لە بابەتە ئاشکرا و هەرە دیارەکان بێت، تەنانەت لە بابەتی حوکم کردن بە غەیری قورئان دەبینین هەمان ووتەی سەلەف دووبارە دەکەنەوە کەچی شتانێک لەم حکومەتانەدا بوونیان هەیە هەر بە ووتەی سەلەف کوفرە، کەچی لای ئەوان هەر نابێتە کوفر، ئەمەش بەڵگەیەکی ڕوونە کە ئەوان لە سەرەتاوە خۆیان یەکلا کردۆتەوە کە نابێت دەسەڵاتداران تەکفیر بکرێن نەک ئەوەی شوێنکەوتەی سەلەف بن، ئەگەرچی لە تەئصیلاتدا هەمان ووتەی سەلەف دووبارە بکەنەوە بەڵام لە واقعدا تەکفیر کردن سەرابە و بوونی نیە.

جا بەهۆی ڕێگا خۆشکردن بۆ مەدخەلیەکان و زۆری ژمارەیان و بڵاو کردنەوەی عەقیدەیان بە ئاسانی، لە بەرامبەردا ڕاوە دوونانی موسڵمانان و بەند کردنیان و ئازار دانیان و نەبوونی ئازادی قسە کردنیان، هەموو ئەمانە وایکردووە زۆرینەی ئەو موسڵمانانەی کە دەربارەی ئەم بابەتە شت دەنوسن خەریکی ڕەتدانەوەی مەدخەلیەکان بن نەک ڕەتدانەوەی زیادەڕەوی موسڵمانان لە بابەتەکە، تەنانەت زۆرێک لەوانەی کە دەربارەی ئەم بابەتە شت دەنوسن هەر خۆیان زیادەڕەوی تێدا دەکەن و دوور لە مەنهەجی سەلەف دەینوسن، کە

ئەمەش وایکردووە هەڵوێستی موسڵمانان زۆر لاواز بکەن بەرامبەر مەدخەلیەکان، لە ڕووی تەئصیلاتەوە مەدخەلیەکان زۆر نزیکتر بن لە سەلەف لە زۆربەی موسڵمانان، ئەگەرچی لە تەنزیل کردنی حوکمی تەکفیر بەسەر کەسەکاندا جەهمی بن، جا بۆیە ئەم کتێبە جیاواز لە زۆربەی نوسراوەکانی تر زیاتر بۆ ڕەتدانەوەی ئەم زیادەڕەوییانە نوسراوە کە موسڵمانان کردوویانە لەم بابەتەدا نەک بۆ ڕەتدانەوەی مەدخەلیەکان، ئەمەش لەبەر چەند هۆکارێک:

یەکەم: وەک باسم کرد بەهۆی پشتگوێ خستنی لایەنی زیادەڕەوی لەم بابەتە لەلایەن موسڵمانانەوە، وە تەنها خەریک بوون بە ڕەددانەوەی شلڕەوی مەدخەلیەکان.

دووەم: زۆرێک لە ڕەددانەوەی موسڵمانان بۆ مەدخەلیەکان لە ڕووی تەئصیلەوە دوورە لە مەنهەجی سەلەف، بەڵکو دەگاتەوە بە تەئصیلاتی خەواریج، بۆیە دەبێت تەئصیلێک لەسەر مەنهەجی سەلەف بۆ ئەم بابەتە بکرێ، تاکو چیتر هەڵوێستمان لاواز نەبێ بەرامبەر مەدخەلیەکان و بە دەستی خۆمان بیانوویان پێ نەدەین کە پێمان بڵێن خەواریج.

سێیەم: زۆرێک لە مەدخەلیەکان کەسانی عینادن و سەرەتا خۆیان یەکلا کردۆتەوە لەم بابەتەدا، گفتوگۆیەکی زانستی نابەخشن بە بابەتەکە، بەڵکو هەر کاتێک بزانن تۆ حاکمیووڵات بە کافر دەزانیت ئەوا ناوت لێدەنێن خەواریج و تەکفیری ئەگەرچی لەسەر هەمان تەئصیلاتی سەلەف بگەیت بە تەکفیر کردنیان، وە هەر کاتێک بتناسن و تەمەن و ئاستی زانستیت بزانن بە تەکفیری ناوت دەبەن و مامۆستاکانیشت بە سەرانی تەکفیر ناو دەبەن، وە هەرکاتێک نەتناسن دەڵێن: تۆ کەسێکی مەجهولی، دین لە کەسی مەجهول وەرناگیرێت، نازانین مامۆستاکانت کێن و لە کێ عیلمت وەرگرتووە، جگە لەمانەش ئەم کتێبە لە سنوورێکی دیاریکراو بڵاو دەبێتەوە و کەسانێکی دیاریکراو دەیبینن، چاپ ناکرێ و لەناو خەڵکیدا بڵاو ناکرێتەوە، جا زۆربەی ئەو کەسانەی کە ئەم کتێبە دەبینن بە جۆرێک لە جۆرەکان

زیادەڕەویان هەیە لەم بابەتەدا، هەر بۆیەش کتێبەکە زیاتر تایبەت کراوە بە ڕەددانەوەی ئەو زیادەڕەوییانەی کە لەم بابەتەدا کراون.

وە بۆ ئەوەی کەس بە جەهمی و مورجیئە و مەدخەلی ناومان نەبات، یان بەوە تۆمەتبارمان نەکات کە خەریکی فیتنەین و دوورین لە حیکمەت، بڵێین لە سەردەمێکی وەک ئەمڕۆدا کە حاکمێک و وڵاتێکی ئیسلامی نادۆزیتەوە، لەبری ئەوەی باسی کوفری ئەم حکومەتانە بکەن و ڕەددی مەدخەلیەکان بدەنەوە هاتوون ڕەددی زیادەڕەوەکان دەدەنەوە ! ئەمە کەی حیکمەتە ؟ هەر بۆیە لە کۆتایی بەشی یەکەمی ئەم کتێبە چەند کوفرێکی حکومەتەکانی ئەم سەردەمە دەخەینە ڕوو بە پێی مەنهەجی ئەهلی سوننە کە مەدخەلیەکانیش دانی پێ دەنێن ئەمانە کوفرن، ئەگەرچی لە دابەزاندنی حوکم بەسەر دەسەڵاتداران لە سەرەتاوە یەکلاییان کردۆتەوە کە نابێت تەکفیر بکرێن، چونکە گەر تەکفیریان بکەن ئەوکات دەبێت خروج کردن و جیهاد کردن لە دژیان بە دروست بزانن گەر توانایان هەبوو، یان هەر هیچ نەبێت حوکمیان بخەنە ڕوو بۆ خەڵکی، ئەوکاتیش هیچ جیاوازییەک نامێنێتەوە لەنێوان مەدخەلیەک و تەکفیریەک یان مەدخەلیەک و تیرۆرستێک !

ئەم ڕاستیەش ناشارمەوە کە کەسانێک کە لەم بابەتە تەئصیلاتی سەلەف بڵاو دەکەنەوە زۆر بێدەنگن بەرامبەر کوفری ئەم حکومەتە طاغوتیانە، هەموو خەمێکیان بۆتە ئەوە کە بۆ خەڵکی بسەلمێنن کە حوکم نەکردن بە قورئان لە بنەڕەتدا کوفری بچووکە، بە جۆرێک هەڵسوکەوت دەکەن وەک بڵێی لە سەردەمی خەلافەتی ئیسلامیدا بژین، کەچی دەنگیان نابیسترێ لە ڕەتدانەوەی مەدخەلیەکان کە هەرچی طاغوت هەیە کردوویانە بە وەلی ئەمر! ئەمەش کارێکی زۆر دوورە لە حیکمەتەوە، چونکە ئەگەرچی ڕەتدانەوەی خەواریج حەق بێت بەڵام باسکردنی ئەمە لای کەسانێک کە ئیرجائیان تێدایە کارێکی هەڵەیە، چونکە کارەکەت پشتگیرییەکی ناڕاستەوخۆیە بۆیان ئەگەرچی ئەو مەبەستەشت نەبێت، بە هەمان

شێوە ئەگەرچی ڕەتدانەوەی مورجیئە حەق بێت بەڵام باسکردنی ئەمە لای کەسانێک کە زیادەڕەویان هەیە کارێکی هەڵەیە، زانایەکی وەک علي بن المديني کە دەچوو بۆ کوفە فەزائیلی ئیمام عثمان-ی باس دەکرد بۆ خەڵکی، کە دەچوو بۆ بەصرە فەزائیلی ئیمام علي باس دەکرد بۆ خەڵکی، چونکە خەڵکی بەصرە پشتیوانی ئیمام عثمان بوون، خەڵکی کوفەش بە شیعەگەری ناسراون، یان منصور بن عبدالرحمن الغداني کاتێک فەرموودەی (هەر کۆیلەیەک ڕا بکات لە دەستی خاوەنەکەی ئەوا کوفری کردووە تاکو دەگەڕێتەوە) ڕیوایەت دەکات لە بەصرە، وەقفی دەکات لەسەر هاوەڵ جرير بن عبدالله البجلي، واتا رەفعی ناکات بۆ پێغەمبەرﷺ، پاشان دەڵێ: والله ئەم فەرموودەیە لە پێغەمبەرﷺ ڕیوایەت کراوە، بەڵام حەز ناکەم لە بەصرە ئەم فەرموودەیە لە منەوە ڕیوایەت بکرێ !

لەبەر ئەوە حەزی نەکردووە چونکە بەصرە موعتەزیلە و خەواریجی لێ بووە کە بەم تاوانانە حوکمی مانەوەی هەتا هەتایی دەدەن لە دۆزەخ بۆ موسڵمانان، هەروەها خەواریج تەکفیریشیان دەکەن، بۆیە منصور لە مەجلیسێکی تایبەت ئەمە بۆ کەسانی تایبەت ڕیوایەت دەکات و حەز ناکات لە مەجلیسی گشتی لە بەصرە ئەم فەرموودەیەی لێوە ببیستن، کەچی لەم سەردەمەدا موسڵمانانی ئاوا هەن بەرامبەر هەموو کوفرێکی ئەم دەسەڵاتانە بێدەنگن، لە ئاگادارکردنەوەی خەڵکی لە کوفری دەنگدان و حزبایەتی و چوونە پەرلەمان و دیموکراسی و عەلمانیەت بێدەنگن کەچی چەقۆیان تیژ کردۆتەوە لەم بابەتەدا هەمیشە خەریکی ورووژاندنی ئەم باسەن کە حوکم نەکردن بە قورئان کوفری بچووکە لە بنەڕەتدا، بەبێ ڕەچاو کردنی بارودۆخ و سەردەم، وەک بڵێی لە سەردەمی ئیمام علي بژین کە خەواریج دەرکەوتوونە دەڵێن (إن الحكم إلا لله) ئەویش هەموو هەوڵێکی بۆتە ڕەتدانەوەی خەواریج، هەر هیچ نەبێ گەر بتەوێ بەرامبەر گوێت بۆ بگرێ دەبێ هەڵوێستت ڕوون بێ بەرامبەر عەلمانیەت و پەرلەمان و دەنگدان و ئەم هەموو کوفرەی حکومەتەکان و پاساو هێنانەوەی مەدخەلیەکان بۆیان، نەک لەبەر ئەوەی دڵی خەڵک ڕازی بکەیت بەڵکو واقعەکە وایە و ئەمەش عادەتی سەلەف بووە کە دەڵێن: ئەوەی باسی مشبهة بكات جەهمیە، لە کاتێکدا

مشبهة گروپێکی کافرن کە سیفەتەکانی الله دەشوبهێنن بە سیفاتی مەخلوقات، بەڵام بۆچی سەلەف وادەڵێن ؟ چونکە لەو سەردەمەدا جەهمیەکان بە ئەهلی سوننەیان دەووت مشبهة، جا زانایەک لەو سەردەمە ژیا بێت هیچ دەنگێکی نەبوو بێت بەرامبەر جەهمیەکان، لە بەرامبەردا هەموو کتێبەکانی دەربارەی ڕەتدانەوەی مشبهة بێت، چۆن لێی دەڕوانیت ؟ گومانت زاڵ نابێت کە ئەمە کەسێکی جەهمی بووە ؟ لەم سەردەمەش کە مەدخەلیەکان ناو لەو کەسانە دەنێن خەواریج کە تەکفیری دەسەڵاتداران دەکەن، وە ئەثەرەکەی ابن عباس بۆ بەرژەوەندی خۆیان بەکاردێنن، تۆش هەمان ووتەکانی ئەوان دووبارە بکەیتەوە ئەگەرچی هەمان عەقیدەی ئەوانیشت نەبێ ئەوا دڵنیا بە خەڵک گومانیان بۆ ئەوە دەچێت کە تۆش مەدخەلی بیت، بە تایبەتی گەر کەسێک بیت نەناسرا بیت بە دژایەتی کردنیان و ڕەتدانەوەیان یان دەنگت زۆر کز و لاواز بێت بەرامبەریان، تەنانەت منیش گەر هەڵوێست و دەنگم نەبوایە دەربارەی کوفری حکومەتەکان و ڕەتدانەوەی مەدخەلیەکان، ئەوا بە هیچ جۆرێک حەقم بەخۆم نەدەدا قسە لەم بابەتە بکەم و زیادەڕوییەکان بخەمە ڕوو، تەنانەت ئەوانەی کە زیادەڕەویان لەم بابەتەدا هەیە بە هیچ جۆرێک گوێیان لە کەسێکی وەک من نەدەگرت گەر پێشتر هەڵوێستم ڕوون نەبوایە، وە هیچ بە دووریشم نەدەزانی منیش بە مەدخەلی ناو ببەن، بەڵام بارودۆخ هەر چۆنێک بێت لە کۆتاییدا هەر دەبێت حەق ڕوون بکرێتەوە، بەڵام تەئکید لەسەر ئەوە دەکەمەوە بۆ ئەوەی ئەو کەسانە گوێت بۆ بگرن کە تۆ ڕووی بانگەوازەکەت لەوان کردووە ئەوا دەبێ هەمیشە ڕەچاوی بارودۆخی هەر بابەتێک بکەیت کە دەتەوێ باسی دەکەیت، بە تایبەتی بابەتێکی وەکو ئەمە کە چۆن چۆنی باسی دەکەیت.

عەلمانیەت و دیموکراسی دوو کوفری هەرە دیار و ئاشکرای ئەم حکومەتانەی سەردەمن دوور لە بابەتی حوکم کردن بە غەیری قورئان کە مەدخەلیەکانیش دانی پێدەنێن عەلمانیەت و دیموکراسی کوفرن.

عەلمانیەت واتا: دوور خستنەوەی دین لە دەوڵەت، دین مافی نەبێت بێتە ناو کاری دەوڵەتەوە.

دیموکراسی واتا: حوکمی گەل، تەعزیم کردنی تاک و بە گەورە سەیر کردنی بڕیارەکانی.

سەیرەکە لەوەدایە مەدخەلیەکان دەڵێن: گەر کەسێکی عەلمانی یان کەسێکی دیموکراسی بزانێ عەلمانیەت یان دیموکراسی مانای چیە، ئینجا داوای بکات ئەوکات کافرە، ئایا دەگونجێ ئەو حزبە سیاسیانەی کە ئەم فکرەی عەلمانیەت و دیموکراسیان هێناوەتە ناو وڵاتانی ئیسلامی نەزانن عەلمانیەت مانای چیە ؟ نەزانن دیموکراسی مانای چیە ؟ تۆیەکی مەدخەلی لە ژیانت ئەم دوو ووشەیەت بیستبوو گەر ئەم حزبانە نەیان هێنابوایە بۆ وڵاتەکەت ؟ ئایا دەکرێ کۆمپانیایەکی کوردی کە وەکیلی کۆمپانیایەکی جیهانی بێت و بەرهەمی ئەوان بهێنێتە کوردستان، خەڵکی کوردستان لە ڕێگای ئەم کۆمپانیا کوردیەوە بەرهەمەکە بناسن، پاشان بووترێ خاوەنی کۆمپانیەکە نازانێ ئەم بەرهەمە چیە، ئێمە دەزانین چیە ؟! گەر ئەم حزبانەی کوردستان عەلمانیەت نەهێننەوە کوردستان و باسی دیموکراسی نەکەن و بە خەڵکی ئاشنا نەکەن گەلی کورد کەی ئەم دوو ووشەیەی بیستبوو؟ پاشان هەر بە کردار عەلمانیەتیان جێبەجێ کردووە، ئەمەش بەڵگەی ئەوەیە کە باش لێی تێگەیشتوون دەزانن عەلمانیەت واتا جیا کردنەوەی دین لە دەوڵەت، تەنانەت ئەو دیموکراسیەی ئێوە بە کوفری دەزانن ئەوان ناو لە حزبەکەیان دەنێن دیموکراسی، تەنانەت گەر بیانەوێ لایەنێک تۆمەتبار بکەن بەوە تۆمەتباری دەکەن کە (دیموکراسی نیە، یان دژی دیموکراسیە) تەنانەت چەندین جار ئێوەی مەدخەلی لەلایەن عەلمانیەکانەوە پێتان دەووترێ: (ئێوەی سەلەفی دژی دیموکراسین) ئایا دەکرێ کەسانێک شانازی بە دیموکراسی بکەن و خەڵکی تۆمەتبار بکەن بەوەی کە دیموکراسی نین، وە ناو لە حزبەکانیان بنێن دیموکراسی، وە دیموکراسی بکەن بە دروشمی یەکەم و پێشینەیان، وە بیکەن بە ویردی سەر زاریان لە

هەموو بۆنەیەکدا باسی بکەن و لە ناوی الله زیاتر دووبارەی بکەنەوە، هەموو ئەمانەی کە باسمان کرد یەک دەگرێتەوە لەگەڵ ئەوەی کە بووترێ: ئەم حزبانە نازانن دیموکراسی چیە بۆیە کافر نین، یان بۆ خۆدزینەوە لە تەکفیر کردنیان بووترێ: گەر بزانن مانای چیە ئەوا کافرن، کە دانانی ئەم ئەگەرە تەنها بۆ هەڵواسین و ڕاگرتنی تەکفیرکردنیانە ئەگینا تۆ بەهۆی ئەوانەوە بەم ووشەیە ئاشنا بوویت، دەکرێ تۆ ماناکەی بزانیت ئەوان نەیزانن ؟!

ئەمە دوو کوفری هەرە دیار و سەرەکی ئەم حکومەتانەی سەردەم کە تەواوی کوفرەکانی تریان لەم دوو سەرچاوەیە هەڵقوڵاون، ئینجا لە بابەتی حوکم نەکردنیش بە قورئان کۆمەڵێک کوفریان هەیە کە مەدخەلیەکانیش دانی پێ دەنێن ئەمانە کوفرن کە دواتر باسی دەکەین.

# حوکم کردن بە جگە لەوەی الله داییەزاندووە

هەر کاتێک باسی حوکم نەکردن بە قورئان بکرێت ئەوا چەند ئایەتێکی سورەتی المائدة بە تایبەتی ئایەتی (٤٤) دەبێتە ناوەڕۆکی باسەکە و بە گوێرەی ئەم ئایەتە لێکدانەوە بۆ بابەتەکە دەکرێت، بۆیە ئێمەش لەم بەشەدا بە ووردی قسە لەسەر ئەم ئایەتە و ئایەتەکانی تری سورەتی المائدة دەکەین کە پەیوەستن بە حوکم نەکردن بەوەی الله داییەزاندووە، وە پێش هەموو شتێک هۆکاری دابەزینی ئایەتەکان دەخەینە ڕوو کە ئەمەش هۆکارێکی ئاسانکەرە بۆ تێگەیشتن لە ئایەتەکان، ئەگەرچی قاعیدەیەکی بەناوبانگ هەیە کە دەڵێ: (العبرة بعموم اللفظ لا بخصوص السبب) پوختەی ماناکەی ئەمەیە: (لەفزی ئایەتەکان حیسابی بۆ دەکرێت نەک هۆکاری دابەزینیان)، بەڵام ئەم قاعیدەیە بە ڕەهایی وەرناگیرێت، خۆ گەر بێتو بە ڕەهایی وەربگیرێت ئەوا هیچ مانایەک بۆ زانینی سەبەب نزول نامێنێتەوە و ئەم زانستە هەڵدەوەشێتەوە یان وەک ئەو زانستەی لێدێت کە زانینی سودی نیە و نەزانینی زیانی نیە، لە کاتێکدا دەبینین زانایان چەندە گرنگیان بەم زانستە داوە و کتێبیان بۆی تەرخان کردووە و لە زۆربەی کتێبە درێژەکانی تەفسیر هەر ئایەتێک سەبەب نزولی هەبێت هەوڵیان داوە باسی بکەن، تەنانەت هەندێک ئایەت هەن گەر سەبەب نزولی نەزانرێت ئەوا تێگەیشتنی مەحاڵە، بۆیە دەبینین لە ژمارەیەک تەفسیری پوخت و ئاسان کە نوسەرەکانیان تەنها پوختەی مانای ئایەتەکان دەخەنە ڕوو بەبێ ڕۆچوون لە بابەتەکانی تر، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا لە هەندێک ئایەت هیچ چاریان نیە ئیللا دەبێت سەبەب نزولەکەی باس بکەن، چونکە دەزانن بەبێ باسکردنی سەبەب نزولی ئایەتەکە تێگەیشتی ئەستەم دەبێت بۆ خوێنەر، بگرە بە هەڵە تێدەگات لە ئایەتەکە.

# دوو نموونە دەربارەی گرنگی زانینی سەبەب نزول:

**الطبري** دەڵێ:

حدثنا ابن حميد حدثنا يعقوب القمي عن جعفر بن أبي المغيرة عن ابن أبزى ووتی:

پیاوێک لە خەواریج هاتە لای ابن أبزى ئەم ئایەتەی بەسەردا خوێندەوە: ﴿ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ وَجَعَلَ ٱلظُّلُمَٰتِ وَٱلنُّورَۖ ثُمَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِرَبِّهِمۡ يَعۡدِلُونَ﴾ **[الأنعام: ١]**، پیاوەکە پێی ووت: ئایا ئەوانەی کافرن هاوبەش دادەنێن بۆ الله ؟ ابن أبزى ووتی: بەڵێ، جا پیاوەکە ڕۆیشت لەلای، پیاوێک لەوێدا ووتی: ئەی ابن أبزى ئەم پیاوە تەفسیری ئەم ئایەتەی بە جۆرێکی تر دەویست، ئەم پیاوە لە خەواریج بوو، ابن أبزى ووتی: بۆمی بگەڕێننەوە، جا کاتێک پیاوەکە هات بۆ لای، ابن أبزى ووتی: ئایا دەزانی ئەم ئایەتە دەربارەی کێ دابەزیوە، پیاوەکە ووتی: نەخێر، ابن أبزى ووتی: ئەم ئایەتە دەربارەی ئەهلی کیتاب دابەزی، بڕۆ نەکەی ئایەتەکە بەسەر شتێکی تر دابەزێنی.

**[تفسير الطبري : 148/9]**

**البخاري** (دەربارەی خەواریج) دەڵێ:

ابن عمر بە خراپترین دروستکراوی اللە-ی دەزانین، وە وتوویەتی: ئەوان بەرەو ئایەتانێک ڕۆیشتن کە دەربارەی کافران دابەزی بوون، جا بەسەر ئیمانداراندا دابەزاند.

**[صحيح البخاري / باب قتل الخوارج والملحدين بعد إقامة الحجة عليهم : لاپەرە 1454]**

# هۆکاری دابەزینی ئایەتەکانی سورەتی المائدة:

ئایەتەکانی ٤١ تا ٥٠ لە سورەتی المائدة دەربارەی دوو ڕووداو دابەزیون، یەکێکیان: زینا کردنی ژن و پیاوێکی یەهودی بوو کە هەردووکیان خێزاندار بوون، دووەمیان: کەسێک لە بەنی نضیر کەسێکی کوشت لە بەنی قریظة، ئەگەرچی ئایەتەکانی (٤١ تا ٤٤) دەربارەی ڕووداوی زینا کردنەکە دابەزیوە بە تایبەت، وە ئایەتی (٤٥) دەربارەی ڕووداوی کوشتنەکە دابەزیوە بە تایبەت، بەڵام تەواوی ئەم ١٠ ئایەتەی سورەتی المائدة لەسەر یەک بابەتە ئەویش بابەتی حوکم نەکردنە بە کتێبی الله، هەروەک لەم ڕیوایەتانەدا تەواوی ووردەکاری دوو ڕووداوەکە و هۆکاری دابەزینی ئایەتەکان دەهێنین.

قال الله تعالى:

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلرَّسُولُ لَا يَحْزُنكَ ٱلَّذِينَ يُسَٰرِعُونَ فِى ٱلْكُفْرِ مِنَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓا۟ ءَامَنَّا بِأَفْوَٰهِهِمْ وَلَمْ تُؤْمِن قُلُوبُهُمْ ۛ وَمِنَ ٱلَّذِينَ هَادُوا۟ ۛ سَمَّٰعُونَ لِلْكَذِبِ سَمَّٰعُونَ لِقَوْمٍ ءَاخَرِينَ لَمْ يَأْتُوكَ ۖ يُحَرِّفُونَ ٱلْكَلِمَ مِنۢ بَعْدِ مَوَاضِعِهِۦ ۖ يَقُولُونَ إِنْ أُوتِيتُمْ هَٰذَا فَخُذُوهُ وَإِن لَّمْ تُؤْتَوْهُ فَٱحْذَرُوا۟ ۚ وَمَن يُرِدِ ٱللَّهُ فِتْنَتَهُۥ فَلَن تَمْلِكَ لَهُۥ مِنَ ٱللَّهِ شَيْـًٔا ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَمْ يُرِدِ ٱللَّهُ أَن يُطَهِّرَ قُلُوبَهُمْ ۚ لَهُمْ فِى ٱلدُّنْيَا خِزْىٌ ۖ وَلَهُمْ فِى ٱلْءَاخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿٤١﴾ سَمَّٰعُونَ لِلْكَذِبِ أَكَّٰلُونَ لِلسُّحْتِ ۚ فَإِن جَآءُوكَ فَٱحْكُم بَيْنَهُمْ أَوْ أَعْرِضْ عَنْهُمْ ۖ وَإِن تُعْرِضْ عَنْهُمْ فَلَن يَضُرُّوكَ شَيْـًٔا ۖ وَإِنْ حَكَمْتَ فَٱحْكُم بَيْنَهُم بِٱلْقِسْطِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُقْسِطِينَ ﴿٤٢﴾ وَكَيْفَ يُحَكِّمُونَكَ وَعِندَهُمُ ٱلتَّوْرَىٰةُ فِيهَا حُكْمُ ٱللَّهِ ثُمَّ يَتَوَلَّوْنَ مِنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ ۚ وَمَآ أُو۟لَٰٓئِكَ بِٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٤٣﴾ إِنَّآ أَنزَلْنَا ٱلتَّوْرَىٰةَ فِيهَا هُدًى وَنُورٌ ۚ يَحْكُمُ بِهَا ٱلنَّبِيُّونَ ٱلَّذِينَ أَسْلَمُوا۟ لِلَّذِينَ هَادُوا۟ وَٱلرَّبَّٰنِيُّونَ وَٱلْأَحْبَارُ بِمَا ٱسْتُحْفِظُوا۟ مِن كِتَٰبِ ٱللَّهِ وَكَانُوا۟ عَلَيْهِ شُهَدَآءَ ۚ فَلَا تَخْشَوُا۟ ٱلنَّاسَ وَٱخْشَوْنِ وَلَا تَشْتَرُوا۟ بِـَٔايَٰتِى ثَمَنًا قَلِيلًا ۚ وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَٰفِرُونَ ﴿٤٤﴾

وَكَتَبْنَا عَلَيْهِمْ فِيهَآ أَنَّ ٱلنَّفْسَ بِٱلنَّفْسِ وَٱلْعَيْنَ بِٱلْعَيْنِ وَٱلْأَنفَ بِٱلْأَنفِ وَٱلْأُذُنَ بِٱلْأُذُنِ وَٱلسِّنَّ بِٱلسِّنِّ وَٱلْجُرُوحَ قِصَاصٌ ۚ فَمَن تَصَدَّقَ بِهِۦ فَهُوَ كَفَّارَةٌ لَّهُۥ ۚ وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٤٥﴾ وَقَفَّيْنَا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم بِعِيسَى ٱبْنِ مَرْيَمَ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ ٱلتَّوْرَىٰةِ ۖ وَءَاتَيْنَٰهُ ٱلْإِنجِيلَ فِيهِ هُدًى وَنُورٌ وَمُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ ٱلتَّوْرَىٰةِ وَهُدًى وَمَوْعِظَةً لِّلْمُتَّقِينَ ﴿٤٦﴾ وَلْيَحْكُمْ أَهْلُ ٱلْإِنجِيلِ بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فِيهِ ۚ وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ ﴿٤٧﴾ وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ بِٱلْحَقِّ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ ٱلْكِتَٰبِ وَمُهَيْمِنًا عَلَيْهِ ۖ فَٱحْكُم بَيْنَهُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ ۖ وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَآءَهُمْ عَمَّا جَآءَكَ مِنَ ٱلْحَقِّ ۚ لِكُلٍّ جَعَلْنَا مِنكُمْ شِرْعَةً وَمِنْهَاجًا ۚ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَجَعَلَكُمْ أُمَّةً وَٰحِدَةً وَلَٰكِن لِّيَبْلُوَكُمْ فِى مَآ ءَاتَىٰكُمْ ۖ فَٱسْتَبِقُوا۟ ٱلْخَيْرَٰتِ ۚ إِلَى ٱللَّهِ مَرْجِعُكُمْ جَمِيعًا فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ ﴿٤٨﴾ وَأَنِ ٱحْكُم بَيْنَهُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَآءَهُمْ وَٱحْذَرْهُمْ أَن يَفْتِنُوكَ عَنۢ بَعْضِ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ إِلَيْكَ ۖ فَإِن تَوَلَّوْا۟ فَٱعْلَمْ أَنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ أَن يُصِيبَهُم بِبَعْضِ ذُنُوبِهِمْ ۗ وَإِنَّ كَثِيرًا مِّنَ ٱلنَّاسِ لَفَٰسِقُونَ ﴿٤٩﴾ أَفَحُكْمَ ٱلْجَٰهِلِيَّةِ يَبْغُونَ ۚ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ ٱللَّهِ حُكْمًا لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ ﴿٥٠﴾﴾

**[المائدة: ٤١-٥٠]**

**مسلم** دەڵێ:

حدثنا يحيى بن يحيى و أبو بكر بن أبي شيبة كلاهما عن أبي معاوية -قال يحيى أخبرنا أبو معاوية- عن الأعمش عن عبدالله بن مرة عن **البراء بن عازب ووتی:**

یەهودییەکی دەم و چاو ڕەش کراو بە خەڵوز کە قامچی لێدرا بوو بەلای پێغەمبەر ﷺ تێپەڕێندرا، **پێغەمبەر ﷺ بانگی کردن، فەرمووی: بەم شێوەیە حەددی زیناکەر دەبینن لە کتێبەکەتاندا ؟ ووتیان: بەڵێ**، پێغەمبەر ﷺ بانگی پیاوێکی کرد لە زاناکانیان، فەرمووی: سوێندت دەدەم بە الله کە تەوراتی دابەزاند بۆ سەر موسی،

بەم شێوە حەددی زیناکەر دەبینن لە کتێبەکەتاندا ؟ ووتی: نەخێر، گەر لەبەر ئەوە نەبوایە کە سوێندت دام بەمە ئەوا پێم نەدەووتی، **لە تەوراتدا ڕەجم هەیە**، بەڵام لەبەر ئەوەی زینا کردن زۆر بوو لەناو ڕێزدار و دەسەڵاتدارەکانمان، گەر کەسێکی ڕێزدارمان زینای کردبوایە وازمان لێی دەهێنا، وە ئەگەر کەسێکی لاواز زینای کردبوایە حەددی ڕەجممان لەسەری جێبەجێ دەکرد، جا ووتمان: وەرن با کۆ ببینەوە لەسەر شتێک کە لەسەر کەسانی ڕێزدار و نزم جێبەجێی بکەین، جا خەڵوز دان لە دەم و چاو و قامچی لێدانمان لە شوێنی ڕەجم دانا، پێغەمبەری الله ﷺ فەرمووی: اللهم من یەکەم کەسم فرمانی تۆ زیندوو دەکەمەوە کاتێک مراندیان، جا فرمانی پێکرد ڕەجم کرا، جا الله ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿لَا يَحۡزُنكَ ٱلَّذِينَ يُسَٰرِعُونَ فِي ٱلۡكُفۡرِ﴾ تاکو ﴿إِنۡ أُوتِيتُمۡ هَٰذَا فَخُذُوهُ﴾ [المائدة: ٤١]، دەڵێ: بڕۆن بۆ لای محمد ﷺ گەر فرمانی پێکردن بە دەم و چاو ڕەش کردن و قامچی لێدان ئەوا وەریبگرن، وە ئەگەر فەتوای بۆ دان بە ڕەجم کردن ئەوا خۆتان بپارێزن، جا الله تعالی ئەم ئایەتانەی دابەزاند: ﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾ ، ﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ﴾ ، ﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ﴾ **هەمووی دەربارەی کافران دابەزی.**

**[صحيح مسلم : ژمارە 1700]**

**عبدالرزاق** دەڵێ:

عن معمر عن الزهري ووتی:

ئێمە لەلای سعيد بن المسيب دانیشتبووین، پیاوێک لە هۆزی (مزينة) پێی ڕاگەیاندین

لە أبو هريرة-وە ووتی: پیاوێک و ژنێک لە یەهود زینایان کرد، جا هەندێکیان بە هەندێکیانی ووت: بڕۆن بۆ لای ئەم پێغەمبەرە، ئەو پێغەمبەرێکە بە سوک کردنی حوکمەکان نێردراوە، جا گەر فەتوای بۆ داین بە فەتوایەک جگە لە ڕەجم ئەوا قبوڵی دەکەین و لەلای الله-ش دەبێتە بەڵگە بۆمان، دەڵێین فەتوای پێغەمبەرێک لە پێغەمبەرانت بوو، جا هاتن بۆ لای پێغەمبەر ﷺ ئەویش دانیشتبوو لە مزگەوت لەناو هاوەڵانیدا، ووتیان: ئەی باوکی القاسم دەڵێی چی دەربارەی پیاوێک و ژنێک لە یەهود زینایان کردبێ ؟ پێغەمبەر ﷺ هیچ قسەیەکی لەگەڵ نەکردن تاکو چوو بۆ ئەو شوێنەی کە یەهودییەکان تێیدا کتێبەکانیان دەخوێند، جا وەستا لەسەر دەرگا، **فەرمووی: سوێندتان دەدەم بە الله کە تەوراتی دابەزاند بەسەر موسى بن عمران، لە تەوراتدا چ حوکمێک هەیە دەربارەی کەسی زیناکەر گەر خێزاندار بێت ؟ ووتیان: خەڵوز دەدرێت لە ڕووی، وە هەردوو زیناکەرەکە سواری سەر پشتی گوێ درێژ دەکرێن پشتیان لەیەکتر دەبێت و بەناو خەڵکیدا دەگێڕدرێن**، گەنجێک لەناویان بێدەنگ بوو، کاتێک پێغەمبەر ﷺ بینی گەنجەکە بێدەنگ بوو، زۆری کرد لەسەر سوێند دانی گەنجەکە، **جا گەنجەکە ووتی: مادام سوێندت داین ئەوا ئێمە لە تەوراتدا ڕەجم دەبینین**، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: یەکەم جار کە فرمانی الله-تان سوک کرد کامە بوو ؟ ووتی: پیاوێک زینای کرد خزمی پاشایەک لە پاشاکانمان بوو، پاشاکە ڕەجم کردنی لەسەر دواخست، پاشان لەدوای ئەو کەسێک لە خەڵکی زینای کرد، پاشا ویستی ڕەجمی بکات، قەومەکەی ڕێگریان لێیکرد، ووتیان: هاوەڵەکەمان ڕەجم ناکرێ تاکو تۆش هاوەڵەکەت دەهێنی و ڕەجمی دەکەیت، جا ڕێککەوتن لەسەر ئەم سزایە لە نێوانیان، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: من

حوکم دەکەی بەوەی کە لە تەوراتدا هەیە، جا فەرمانی پێکردن ڕەجم کران.

**الزهري دەڵێ: پێمان گەیشتووە ئەم ئایەتە دەربارەیان دابەزی:** ﴿إِنَّآ أَنزَلۡنَا ٱلتَّوۡرَىٰةَ فِيهَا هُدٗى وَنُورٞۚ يَحۡكُمُ بِهَا ٱلنَّبِيُّونَ ٱلَّذِينَ أَسۡلَمُواْ﴾ **[المائدة: ٤٤]**، پێغەمبەر ﷺ لەوانە بوو کە حوکمی پێکرد.

**[تفسير عبدالرزاق : ژمارە 706]**

**الطبري** دەڵێ:

حدثني المثنى قال حدثنا سويد بن نصر قال أخبرنا ابن المبارك عن معمر عن الزهري ووتی:

من لەلای سعید بن المسیب دانیشتبووم، وە لەلای سعید پیاوێکی لێبوو کە سعید ڕێزی لێدەگرت، ئەو پیاوە کەسێک بوو لە هۆزی (مزینة) باوکی ئامادەی حودەیبیە ببوو، پیاوەکە لە هاوەڵانی أبو هريرة بوو، ووتی: أبو هريرة ووتی: من لەلای پێغەمبەری الله ﷺ دانیشتبووم، پیاوێک هاتە لای لە یەهود، لەناو خۆیاندا ڕاوێژیان کردبوو دەربارەی هاوەڵێکیان کە زینای کردبوو دوای خێزانداری، جا هەندێکیان بە هەندێکیانی ووتبوو: ئەم پێغەمبەرە نێردراوە، **وە ئێوە دەزانن کە لە تەوراتدا ڕەجمتان لەسەر فەرز کراوە کە شاردووتانەتەوە، وە لەنێوانی خۆتان ڕێککەوتن بە سزایەکی سووکتر لە ڕەجم**، با بڕۆین پرسیار لەم پێغەمبەرە بکەین، گەر فەتوای بۆ داین بەوەی کە لە تەورات لەسەرمان فەرز کراوە لە ڕەجم کردن ئەوا وازی لێدەهێنین، ئێمە وازمان لە ڕەجم هێنا لە تەورات، جا تەورات لەپێشترە لەو پێغەمبەرە کە گوێڕایەڵی بکرێت و بە ڕاست دابنرێت، جا هاتن بۆ لای پێغەمبەری الله ﷺ ووتیان: ئەی باوکی القاسم هاوەڵێکمان زینای کردووە خێزانداریشە، چ سزایەک دەبینیت بۆی ؟ أبو هريرة ووتی: پێغەمبەری الله ﷺ وەڵامی نەدانەوە تاکو

هەڵسایەوە ئێمەش هەڵساینەوە لەگەڵی، دەرچوو بۆ لای قوتابخانەی یەهودییەکان تاکو چوو بۆ لایان، بینی مودارەسەی تەورات دەکەن لە قوتابخانەکەدا، **جا پێی ووتن: ئەی کۆمەڵی یەهود، سوێندتان دەدەم بە الله کە تەوراتی دابەزاندووە بەسەر موسی، چ سزایەک دەبینن لە تەورات بۆ ئەو کەسەی کە زینای کردبێ و خێزانداریش بێ ؟ ووتیان: ئێمە ڕوو ڕەش کردن بە خەڵوز و قامچی لێدان دەبینین لە تەورات،** زاناکەیان بێدەنگ بوو لە سوچێکی ماڵەکەدا، کاتێک پێغەمبەری الله ﷺ بینی بێدەنگە زۆری لێکرد لە سوێند دانی، جا زاناکەیان ووتی: لەبەر ئەوەی سوێندت داین پێتی دەڵێم، ئێمە لە تەوراتدا سزای ڕەجم دەبینین لەسەریان، پێغەمبەری الله ﷺ پێی فەرموو: کامە یەکەم جار بوو کە فرمانی الله-تان سووک کرد ؟ ووتی: کوڕی مامی پاشا زینای کرد پاشا ڕەجمی نەکرد، پاشان پیاوێک لە خێزانێکی ئاسایی زینای کرد پاشا ویستی ڕەجمی بکات، قەومی پیاوەکە ڕێگریان لێیکرد، ووتیان: والله ڕەجمی ناکەیت تا فلانیش ڕەجم نەکەیت، واتا کوڕی مامی پاشا، جا لەنێوان خۆیان ڕێککەوتن لەسەر سزایەک سووکتر بێ لە ڕەجم، جا وازیان لە ڕەجم هێنا، پێغەمبەری الله ﷺ فەرمووی: من بەوە حوکم دەکەم کە لە تەوراتدا هەیە، جا الله لەبارەیەوە ئەم ئایەتانەی دابەزاند: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلرَّسُولُ لَا يَحۡزُنكَ ٱلَّذِينَ يُسَٰرِعُونَ فِي ٱلۡكُفۡرِ﴾ تا ئایەتی: ﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾ **[المائدة: ٤١-٤٤].**

**[تفسير الطبري : 8/416-418]**

**الطبري** دەڵێ:

حدثنا ابن وكيع قال حدثنا أبي (عن الأعمش) (ح)

وحدثنا هناد قال حدثنا أبو معاوية عن الأعمش (ح)

وحدثنا هناد قال حدثنا عبيدة بن حميد عن الأعمش

عن عبدالله بن مرة عن **البراء بن عازب ووتی:**

یەهودییەکی دەم و چاو ڕەش کراو بە خەڵوز کە قامچی لێدرا بوو بەلای پێغەمبەر ﷺ تێپەڕێندرا، **پێغەمبەر ﷺ پیاوێکی لە زاناکانی یەهود بانگ کرد، فەرمووی: بەم شێوەیە حەددی زیناکەر دەبینن لە تەوراتدا ؟ ووتی: بەڵێ**، فەرمووی: سوێندت دەدەم بەوەی کە تەوراتی دابەزاند بۆ سەر موسی، بەم شێوە حەددی زیناکەر دەبینن لە تەوراتدا ؟ ووتی: نەخێر، گەر لەبەر ئەوە نەبوایە کە سوێندت دام بەمە ئەوا پێم نەدەووتی، **بەڵکو ڕەجم هەیە لە تەوراتدا**، بەڵام لەبەر ئەوەی زینا کردن زۆر بوو لەناو ڕێزدار و دەسەڵاتدارەکانمان گەر کەسێکی ڕێزدارمان زینای کردبوایە وازمان لێی دەهێنا، وە ئەگەر کەسێکی لاواز زینای کردبوایە حەددی ڕەجممان لەسەری جێبەجێ دەکرد، جا ووتمان: وەرن با کۆ ببینەوە شتێک لە شوێنی ڕەجم دابنێین، جا ئەم شتە لەسەر کەسی بە دەسەڵات و کەسی لاواز جێبەجێ دەکرێ، جا خەڵوز دان لە دەم و چاو و قامچی لێدانمان لە شوێنی ڕەجم دانا، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: اللهم من یەکەم کەسم فرمانی تۆ زیندوو دەکەمەوە کاتێک مراندیان، جا فرمانی پێکرد ڕەجم کرا، جا الله ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿لَا يَحْزُنكَ ٱلَّذِينَ يُسَٰرِعُونَ فِى ٱلْكُفْرِ﴾ تا کۆتایی ئایەتەکە [المائدة: ٤١].

**[تفسير الطبري : 8/415-416]**

ووتم: (عن الأعمش) لە سەنەدی یەکەم کەوتووە، خۆم زیادم کردووە چونکە بە پێی سەنەدەکە هەر دەبێت بەم شێوەیە بێت.

**الطبري** دەڵێ:

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلرَّسُولُ لَا يَحۡزُنكَ ٱلَّذِينَ يُسَٰرِعُونَ فِي ٱلۡكُفۡرِ مِنَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ ءَامَنَّا بِأَفۡوَٰهِهِمۡ وَلَمۡ تُؤۡمِن قُلُوبُهُمۡۛ وَمِنَ ٱلَّذِينَ هَادُواْۛ سَمَّٰعُونَ لِلۡكَذِبِ سَمَّٰعُونَ لِقَوۡمٍ ءَاخَرِينَ لَمۡ يَأۡتُوكَۖ﴾ **[المائدة: ٤١]**

الله جل ثناؤه بە پێغەمبەرەکەی محمد ﷺ دەفەرمووێ: ئەی پێغەمبەر خەمبارت نەکات ئەو مونافیقانەی کە بە زمان باوەڕ هێنان بە تۆ دەردەبڕن و لە دڵەوەش بە درۆت دەزانن لە خێرا کردنیان بۆ کوفر، وە خێرا کردنی یەهود بۆ ئینکاری کردنی پێغەمبەرایەتی تۆ خەمبارت نەکات، پاشان الله جل وعز وەصفی کردن بۆ پێغەمبەرەکەی، وەصفی کردن بە صیفەتە ناشرینەکانیان و کردەوە خراپەکانیان، الله وەک دڵدانەوە بۆ پێغەمبەرەکەی بەهۆی ئەو خەمەی کە توشی دەبێت لە بە درۆ دانانی لەلایەن ئەوانەوە لە کاتێکدا دەزانن ڕاستگۆیە، **پێی ڕاگەیاند کە ئەوان ئەهلی حەلال کردنی حەڕامەکانن، ئەهلی خواردنی نانی خراپ و پیسن لە بەرتیل و سوحت، وە ئەهلی بوهتان و درۆ کردنن بە ناوی الله، وە ئەهلی تەحریف کردنی کتێبەکەین**، پاشان پێی ڕاگەیاند کە ئەوان سزای سەرشۆڕی و ڕیسوایی لە دونیادا توشیان دەبێت، وە سزای دواخراویش لە ڕۆژی دوایی، فەرمووی: ﴿سَمَّٰعُونَ لِلۡكَذِبِ﴾ واتا ئەو مونافیقانەی یەهود، واتا ئەوان گوێ لە درۆ دەگرن، **وە گوێ گرتنیان لە درۆ بریتیە لە گوێ گرتنیان لە ووتەی زاناکانی یەهود کە دەڵێن: حوکمی زیناکەری خێزاندار لە تەوراتدا خەڵوز لێدان لە دەم و چاو و قامچی لێدانە.**

[تفسیر الطبري : 8/419-420]

بڕوانە ووتی: یەهود ئەهلی حەلال کردنی حەڕامەکان و تەحریف کردنی کتێبی الله و درۆ کردنن بە ناوی الله-ن، وە حوکمە دانراوەکەی خۆیان دەربارەی زیناکەر دەدەنە پاڵ الله دەڵێن لە تەوراتدا ئەمە هاتووە.

**البخاري** دەڵێ:

حدثني إبراهيم بن المنذر حدثنا أبو ضمرة حدثنا موسى بن عقبة عن نافع عن ابن عمر رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا ووتی:

یەهود هاتن بۆ لای پێغەمبەر ﷺ بە پیاوێک و ژنێک لەخۆیان کە زینایان کردبوو، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموون: یەکێک لە ئێوە زینا بکات چی لێ دەکەن ؟ ووتیان: ڕوویان ڕەش دەکەین و لێیان دەدەین، **پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: لە تەوراتدا ڕەجم نابینن ؟ ووتیان: هیچ شتێکی ئاوای تێدا نابینین**، عبدالله بن سلام پێی ووتن: درۆتان کرد، تەورات بهێنن بیخوێننەوە گەر ڕاست دەکەن، جا ئەو کەسەی کە تەوراتی دەخوێندەوە دەستی لەسەر ئایەتی ڕەجم دانا، ئایەتەکانی پێش دەستی و دوای دەستی دەخوێند ئایەتی ڕەجمی نەدەخوێند، ووتی: ئەمە چیە ؟ کاتێک بینیان ووتیان: ئەمە ئایەتی ڕەجمە، جا پێغەمبەر ﷺ فرمانی کرد ژن و پیاوەکە ڕەجم کران لە نزیک شوێنی نوێژ کردن لەسەر مردووان.

عبدالله دەڵێ: بینیم پیاوەکە خۆی دایە بەردەم ئافرەتەکە دەیپاراست لە بەردەکان.

**[صحيح البخاري : ژمارە 4556]**

**الطبري** دەڵێ:

﴿وَمِنَ ٱلَّذِينَ هَادُواْ سَمَّٰعُونَ لِلۡكَذِبِ سَمَّٰعُونَ لِقَوۡمٍ ءَاخَرِينَ لَمۡ يَأۡتُوكَۖ يُحَرِّفُونَ ٱلۡكَلِمَ مِنۢ بَعۡدِ مَوَاضِعِهِۦۖ﴾ **[المائدة: ٤١]**، (دوای باسکردنی سەبەب نزولی ئایەتەکە پاشان دەڵێ) ئەمە صیفەتی

کەسانێکە لە یەهود، گوێ بیستی درۆ بوون کە بە ناوی الله-وە کرا دەربارەی حوکمی ئەو ئافرەتە یەهودییەی کە زینای کرد و خێزاندار بوو، **ووتیان حوکمەکەی لە تەوراتدا ڕوو ڕەش کردن بە خەڵوز و قامچی لێدانە.**

**[تفسير الطبري : 422/8]**

**الطبري** دەڵێ:

حدثني يونس قال أخبرنا ابن وهب ووتی:

**ابن زيد** دەربارەی فەرمایشتی الله: ﴿سَمَّٰعُونَ لِلۡكَذِبِ سَمَّٰعُونَ لِقَوۡمٍ ءَاخَرِينَ﴾ **[المائدة: ٤١]**، ووتی: گوێ لە کەسانێکی تر دەگرن لە ئەهلی کیتاب کە نەهاتوون بۆ لات، ئەمانەی کە هاتوون بۆ لای پێغەمبەر ﷺ گوێ بۆ ئەوانەی تر دەگرن کە نەهاتوون بۆ لای پێغەمبەر ﷺ، **بە درۆ پێیان دەڵێن: محمد درۆزنە، ڕەجم لە تەوراتدا نیە باوەڕی پێ مەکەن.**

**[تفسير الطبري : 8/422-423]**

ووتم: (ابن زيد) عبدالرحمن بن زيد بن أسلم-ە.

**الطبري** دەڵێ:

﴿يُحَرِّفُونَ ٱلۡكَلِمَ مِنۢ بَعۡدِ مَوَاضِعِهِۦۖ﴾ **[المائدة: ٤١]**

الله تعالى ذکرە دەفەرمووێ: ئەوانەی کە گوێ دەگرن بۆ درۆ لە کەسانێکی تر لە یەهود کە نەهاتوون بۆ لات، **تەحریفی ووشەکان دەکەن، وە تەحریفەکەیان بریتیە لە گۆڕینی حوکمی الله تعالى ذکرە کە لە تەورات دایبەزاندووە دەربارەی**

**ژنان و پیاوانی خێزاندار لە زیناکەران، گۆڕینی لە ڕەجم کردنەوە بۆ قامچی لێدان و ڕوو ڕەش کردن بە خەڵوز.**

**[تفسير الطبري : 423/8]**

## الطبري دەڵێ:

حدثني محمد بن الحسين حدثنا أحمد بن مفضل قال حدثنا أسباط عن **السدي:**

**دەربارەی فەرمایشتی الله:** ﴿وَمِنَ ٱلَّذِينَ هَادُواْ سَمَّٰعُونَ لِلۡكَذِبِ سَمَّٰعُونَ لِقَوۡمٍ ءَاخَرِينَ لَمۡ يَأۡتُوكَۖ يُحَرِّفُونَ ٱلۡكَلِمَ مِنۢ بَعۡدِ مَوَاضِعِهِۦۖ﴾ **[المائدة: ٤١]**، **ووتی:** ... (دوای باسکردنی ڕووداوی گۆڕینی ڕەجمی زیناکەر بۆ قامچی لێدان و ڕوو ڕەش کردن بە خەڵوز لەلایەن یەهودەوە، پاشان دەڵێ) **جا الله عز وجل ئەم ئایەتەی دابەزاند:** ﴿وَمِنَ ٱلَّذِينَ هَادُواْ سَمَّٰعُونَ لِلۡكَذِبِ سَمَّٰعُونَ لِقَوۡمٍ ءَاخَرِينَ لَمۡ يَأۡتُوكَۖ يُحَرِّفُونَ ٱلۡكَلِمَ مِنۢ بَعۡدِ مَوَاضِعِهِۦۖ﴾ **کاتێک تەحریفی ڕەجمیان کرد، کردیان بە قامچی لێدان.**

**[تفسير الطبري : 8/421-422]**

ووتم: بڕوانە ووتی (تەحریف) واتا حوکمەکە دەگۆڕن و دەیدەنە پاڵ الله، نەک دان بەوە بنێن ڕەجم حوکمی الله-یە و قامچی و خەڵوز حوکمی خۆیانە.

## ابن أبي حاتم دەڵێ:

حدثنا أبي حدثنا (أبو) صالح حدثني معاوية بن صالح عن علي بن أبي طلحة عن **ابن عباس:**

دەربارەی ئایەتی: ﴿يُحَرِّفُونَ ٱلۡكَلِمَ﴾ [المائدة: ٤١]، **ووتی: واتا حدودەکانی الله دەگۆڕن لە تەورات.**

**[تفسير ابن أبي حاتم : 78/5]**

ووتم: (أبو) لە چاپدا نەنوسراوە.

**ابن أبي حاتم** دەڵێ:

حدثنا أبو سعيد الأشج حدثنا أبو معاوية عن الأعمش عن عبدالله بن مرة عن **البراء ووتی:** یەهودییەک ڕووی بە خەڵوز ڕەش کرا بوو، وە قامچی لێدرا بوو، بەلای پێغەمبەر ﷺ تێپەڕێندرا، **جا بانگی کردن فەرمووی: بەم شێوەیە حەددی زیناکەر هاتووە لە کتێبەکەتان ؟ ووتیان: بەڵێ.**

**[تفسير ابن أبي حاتم : 79/5]**

**مقاتل بن سليمان** دەڵێ:

﴿أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَمۡ يُرِدِ ٱللَّهُ أَن يُطَهِّرَ قُلُوبَهُمۡۚ﴾ **[المائدة: ٤١]**

﴿أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ﴾ واتا: یەهود، ﴿لَمۡ يُرِدِ ٱللَّهُ أَن يُطَهِّرَ قُلُوبَهُمۡۚ﴾ الله نەیویستووە دڵیان پاک بکاتەوە لە کوفر **کاتێک حوکمی ڕەجم و وەصفی محمد-یان ﷺ شاردەوە.**

**[تفسير مقاتل بن سليمان : 478/1]**

**آدم بن أبي إياس** دەڵێ:

﴿يُحَرِّفُونَ ٱلۡكَلِمَ مِنۢ بَعۡدِ مَوَاضِعِهِۦۖ﴾ **[المائدة: ٤١]**

حدثنا ورقاء عن ابن أبي نجيح عن **مجاهد ووتی:**

واتا: ڕەجم، لە تەوراتدا ڕەجم هەبوو، جا کاتێک کەسێکی سوک و بێ دەسەڵات زینای کردبوایە ڕەجمیان دەکرد، وە ئەگەر کەسێکی گەورە و ڕێزدار زینای کردبوایە خەڵوزیان لە ڕووی دەدا و دەیانگێڕا بەناو خەڵکدا، جا داوای فەتوایان لە پێغەمبەر ﷺ کرد، ئەویش فەتوای ڕەجمی بۆ دان، **جا پرسیاری ئەوەی لێکردن حوکمی زیناکەر چیە لە تەوراتدا ؟ ئەوانیش شاردیانەوە تەنها پیاوێکیان نەبێ کە چاوێکی کوێر بوو، ووتی: درۆیان لەگەڵت کرد ئەی پێغەمبەری اللە، لە تەوراتدا ڕەجم هەیە.**

**[تفسير مجاهد : لاپەرە 308]**

ووتم: ئەم تەفسیرە کە بەناوی تەفسیری مجاهد چاپ کراوە دوو چاپی هەیە، خۆی لە ڕاستیدا تەفسیری (آدم بن أبي إياس)ە، کە زانایەکی ئەهلی سوننەیە ساڵی (220 هـ) وەفاتی کردووە، هەروەک حکمت بشير ياسين لە کتێبی **[استدراكات على تاريخ التراث العربي : 2/23-30]** بە ژمارەیەک بەڵگە ئەمەی ڕوون کردۆتەوە، لەبەر ئەوەی آدم بن أبي إياس سودی زۆر دیوە لە تەفسیری مجاهد و ژمارەیەکی زۆری لێ ڕیوایەت کردووە ئیترکراوە بە تەفسیری مجاهد لەلایەن نوسەری دەستنوسەکە، محققی یەکەم هەمان هەڵەی دووبارە کردۆتەوە، محققی دووەمیش بە هەمان شێوە، ئەگینا هەرلەم کتێبەدا آدم لە کۆمەڵێک هاوەڵان و تابعین تەفسیر ڕیوایەت دەکات جگە لە مجاهد، جا لەبەر ئەوەی محقق بەناوی (تفسير مجاهد) بڵاوی کردۆتەوە منیش ناچارم هەربەم ناوە بینوسم، بەڵام کە دەڵێین تەفسیرەکە هی مجاهد نیە واتا کتێبەکە هی مجاهد نیە، ئەگینا تەفسیری ئایەتەکە مجاهد کردوویەتی بەڵام آدم خاوەنی کتێبەکەیە.

**يحيى بن سلام** دەڵێ:

لە عکرمة-وە باسیان کردووە کە دەڵێ: دوو یەهودی بردران بۆ لای پێغەمبەری اللەﷺ

کە زینایان کردبوو، پێغەمبەر ﷺ پرسیاری لێکردن کامتان زاناترینن ؟ ووتیان: ابن صوریا، کە چاوێکی کوێرە، پێغەمبەری الله ﷺ پرسیاری لێکرد تۆ زاناترینی یەهودی؟ ابن صوریا ووتی: ئەوان وادەڵێن، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: من سوێندت دەدەم بەوەی کە دەریای شەق کرد بۆ بەنی ئیسرائیل و تەوراتی دابەزاند بەسەر موسی، وە المن و السلوی دابەزاند بەسەر بەنی ئیسرائیل، چ حوکمێک دەبینن لە کتێبەکەتاندا ؟ ابن صوریا ووتی: پرسیارت لێکردم بە زاتێکی گەورە کە ناکرێ لێتی بشارمەوە، **لە کتێبی ئێمەدا ڕەجم هەیە، بەڵام ئێمە لەنێوان خۆماندا دەیشارینەوە**، جا پێغەمبەری الله هەردووکیانی ڕەجم کرد.

[مختصر تفسير يحيى بن سلام لهود بن محكم الهواري : 472/1]

**الطبري** دەڵێ:

﴿سَمَّٰعُونَ لِلۡكَذِبِ أَكَّٰلُونَ لِلسُّحۡتِۚ﴾ [المائدة:٤٢]

الله تعالی ذکرە دەفەرمووێ: ئەوانەی یەهود کە وەصفی صیفەتەکانیانم بۆ کردیت ئەی محمد، گوێ دەگرن لە ووتەی باطل و درۆ، وەک ووتنی هەندێکیان بۆ هەندێکیان: محمد درۆزنە پێغەمبەر نیە، وە ووتەی هەندێکیان: **حوکمی زیناکەری خێزاندار لە تەوراتدا قامچی لێدان و ڕوو ڕەش کردنە بە خەڵوز، وە جگە لەمانەش لە شتانی باطل و بوهتان، وە بەرتیل وەردەگرن و دەیخۆن لە بەرامبەر درۆ کردنیان بە ناوی الله و بوهتان کردنیان بۆ الله.**

[تفسير الطبري : 428/8]

## مقاتل بن سليمان دەڵێ:

﴿وَمَآ أُوْلَٰٓئِكَ بِٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾ [المائدة: ٤٣]. ئەوانە ئیمانیان نیە **کاتێک ئەوەیان تەحریف کرد کە لە تەوراتدا هەبوو.**

[تفسير مقاتل بن سليمان : 479/1]

## ابن أبي حاتم دەڵێ:

قرأت على محمد بن الفضل حدثنا محمد بن علي أنبأنا محمد بن مزاحم حدثنا بكير بن معروف عن **مقاتل بن حيان:** دەربارەی فەرمایشتی الله: ﴿وَكَيۡفَ يُحَكِّمُونَكَ وَعِندَهُمُ ٱلتَّوۡرَىٰةُ فِيهَا حُكۡمُ ٱللَّهِ﴾ [المائدة: ٤٣]، **ووتی: الله دەفەرمووێ: تەورات ڕەجمی تێدایە بۆ پیاو و ژنی زیناکەری خێزاندار، وە ئیمان هێنان بە محمد ﷺ و بە ڕاست دانانی.**

[تفسير ابن أبي حاتم : 92/5]

ووتم: کتێبەکانی الله پڕاوپڕن لە تەوحید، حوکمەکانی الله لە کتێبەکانیدا تەنها حدودەکان نین بەڵکو بەر لە هەموو شتێک تەوحید و بڕوا هێنانە بە پێغەمبەران.

## ابن أبي حاتم دەڵێ:

حدثنا أحمد بن عثمان بن حكيم الأودي -فيما كتب إلي- حدثنا أحمد بن مفضل حدثنا أسباط عن **السدي:** دەربارەی فەرمایشتی الله: ﴿فَلَا تَخۡشَوُاْ ٱلنَّاسَ وَٱخۡشَوۡنِ﴾ [المائدة: ٤٤]، **ووتی: الله دەفەرمووێ: لە خەڵکی نەترسن ئەو شتە بشارنەوە کە دامبەزاندووە.**

[تفسير ابن أبي حاتم : 100/5]

## ابن أبي حاتم دەڵێ:

قرأت على محمد بن الفضل حدثنا محمد أنبأنا محمد بن مزاحم حدثنا بكير بن معروف عن **مقاتل:**

دەربارەی فەرمایشتی الله: ﴿فَلَا تَخْشَوُاْ ٱلنَّاسَ﴾ [المائدة: ٤٤]، ووتی: واتا لە خەڵکی مەترسن دەربارەی محمد ﷺ و حوکمی ڕەجم، **الله دەفەرمووێ: ئەوەی دەربارەی محمد ﷺ و ڕەجم هاتووە دەری بخەن.**

**[تفسير ابن أبي حاتم : 100/5]**

## ابن أبي حاتم دەڵێ:

بە هەمان سەنەدی پێشوو لە **مقاتل بن حيان-ەوە:**

دەربارەی فەرمایشتی الله: ﴿وَٱخْشَوْنِ﴾ [المائدة: ٤٤]، ووتی: واتا لە من بترسن لە شاردنەوەی، **واتا: شاردنەوەی هاتنی محمد و ڕەجم.**

**[تفسير ابن أبي حاتم : 101/5]**

**الطبري** لە تەفسیری ئایەتی ﴿فَلَا تَخْشَوُاْ ٱلنَّاسَ وَٱخْشَوْنِ وَلَا تَشْتَرُواْ بِـَٔايَٰتِي ثَمَنًا قَلِيلًاۚ﴾ دەڵێ:

الله تعالی ذکرە بە زاناکانی یەهود دەفەرمووێ: لە خەڵکی مەترسن لە جێبەجێ کردنی ئەو حوکمەم کە داومە لەسەر بەندەکانم و ڕواندنی بەو شێوەیەی کە فرمانم پێی کردووە، خەڵکی ناتوانن زیانتان لێ بدەن و سودتان پێ بگەیەنن تەنها بە ئیزنی من نەبێ، **وە ڕەجم مەشارنەوە کە کردوومە بە حوکم لە تەورات لەسەر ژن و پیاوی خێزانداری زیناکەر**، بەڵکو لە من بترسن نەک لە خەڵکی، چونکە سود و زیان بە دەستی منە، **وە لە سزام بترسن بەهۆی شاردنەوەتان بۆ ئەو حوکمانەی**

**کە لە کتێبەکەمدا هەیە** کە ئێوە کرا بوون بە ئەمین و پارێزەر لەسەری، ... (ئینجا دوای هێنانی ڕوایەتێک پاشان الطبري دەڵێ) وە سەبارەت بە فەرمایشتی الله: ﴿وَلَا تَشۡتَرُواْ بِـَٔايَٰتِي ثَمَنٗا قَلِيلٗاۚ﴾ الله دەفەرمووێ: بەرامبەر واز هێنان لە حوکم کردن بە ئایەتەکانی کتێبەکەم کە بۆ موسی-م دابەزاند شتێکی هیچ و کەم وەرمەگرن ئەی زاناکانی یەهود کە بریتیە لە نرخێکی کەم، **الله تعالی ذکرە ویستی نەهیان لێ بکات لە خواردنی بەرتیل بەرامبەر گۆڕینی کتێبی الله، وە گۆڕینی حوکمی الله کە دەربارەی ژن و پیاوی خێزانداری زیناکەر داویەتی، وە جگە لەمەش لەو حوکمانەی کە گۆڕییان تاکو بەرتیلی پێوەر بگرن.**

**[تفسير الطبري : 455/8]**

**الشافعي** دەڵێ:

الله پێغەمبەرەکەی ﷺ نارد، لەو کاتەدا خەڵکی دوو جۆر بوون:

**یەکێکیان: ئەهلی کیتاب بوون، کە حوکمەکانی الله-یان گۆڕی بوو، وە کافر بوون بە الله، جا درۆیان دروست کرد بە زمانەکانیان دایانڕشت، جا تێکەڵیان کرد بەو حەقەی کە الله بۆی دابەزاندبوون،** جا الله تبارك و تعالی هەندێک لە کوفرەکانیانی بۆ پێغەمبەرەکەی ﷺ باسکرد، فەرمووی: ﴿وَإِنَّ مِنۡهُمۡ لَفَرِيقٗا يَلۡوُۥنَ أَلۡسِنَتَهُم بِٱلۡكِتَٰبِ لِتَحۡسَبُوهُ مِنَ ٱلۡكِتَٰبِ وَمَا هُوَ مِنَ ٱلۡكِتَٰبِ وَيَقُولُونَ هُوَ مِنۡ عِندِ ٱللَّهِ وَمَا هُوَ مِنۡ عِندِ ٱللَّهِ وَيَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلۡكَذِبَ وَهُمۡ يَعۡلَمُونَ﴾ **[آل عمران: ٧٨]**، پاشان فەرمووی: ﴿فَوَيۡلٞ لِّلَّذِينَ يَكۡتُبُونَ ٱلۡكِتَٰبَ بِأَيۡدِيهِمۡ ثُمَّ يَقُولُونَ هَٰذَا مِنۡ عِندِ ٱللَّهِ لِيَشۡتَرُواْ بِهِۦ ثَمَنٗا قَلِيلٗاۖ فَوَيۡلٞ لَّهُم مِّمَّا كَتَبَتۡ أَيۡدِيهِمۡ وَوَيۡلٞ لَّهُم مِّمَّا يَكۡسِبُونَ﴾ **[البقرة: ٧٩]**.

**[الرسالة : لاپەرە 8-9]**

ووتم: بڕوانە ئەم ئایەتانەی ئیمام الشافعي هێنای باسی چی تێدا هاتووە.

**ابن كثير** (دەبارەی ئایەتەکانی ٤١ تا ٤٤ سورەتی المائدة) دەڵێ:

وە ئەوەی دروستە ئەوەیە کە ئەم ئایەتانە دەربارەی دوو زیناکەرە یەهودییەکە دابەزین، **ئەوان کتێبی الله-یان گۆڕی بوو کە بە دەستیانەوە بوو، لە ڕەجم کردنی ئەو کەسەی زینا دەکات لەوان و خێزاندارە، جا تەحریفیان کرد و ڕێککەوتن لەنێوان خۆیاندا لەسەر 100 قامچی لێدان، وە ڕەش کردنی ڕوخساریان و سوارکردنیان بەسەر پشتی گوێ درێژ بە پێچەوانەوە**، جا کاتێک ئەم ڕووداوی زینا کردنە ڕوویدا دوای کۆچی پێغەمبەرﷺ، یەهود لەنێوان خۆیاندا ووتیان: با بڕۆین حوکم ببەینەوە بۆ لای محمد، گەر حوکمی کرد بە قامچی لێدان و ڕوو ڕەش کردن ئەوا لێی وەربگرن، وە بیکەن بە بەڵگە لەنێوان خۆتان و الله دا بەوەی کە پێغەمبەرێک لە پێغەمبەرانی الله ئەم حوکمەی کردووە لەنێوانتاندا، وە ئەگەر حوکمی کرد بە ڕەجم ئەوا شوێنی مەکەون لەمەدا.

**[تفسير ابن كثير : 113/3]**

هەموو ئەو ڕیوایەت و ووتانەی هێنامان بە ڕوونی ئەوە دەردەخەن کە ئەم ئایەتانە دابەزیون دەربارەی گۆڕینی حوکمی الله لەلایەن یەهودەوە، کاتێک لە تەوراتدا ڕەجم هاتبوو بۆ زیناکەری خێزاندار ئەوان گۆڕییان بۆ قامچی لێدان و ڕوو ڕەش کردن بە خەڵوز و گێڕانی بەناو خەڵکدا لەسەر پشتی گوێ درێژ، وە کاتێک پێغەمبەرﷺ لێیان دەپرسێ: ئەم حوکمە هەیە لە تەوراتدا ؟ لە وەڵامدا دەڵێن: بەڵێ ! واتا حوکمە دانراوەکەی خۆیان دەدەنە پاڵ الله

دەڵێن ئەمە حوکمی الله-یە، ئەمەیە گۆڕینی حوکمی الله کە حوکمێک دابنێیت و بیدەیتە پاڵ الله کە یەهود ئەنجامیاندا، وەک ئەوەی کە بووترێ: حوکمی دز لە قورئاندا بەند کردنە دەست بڕین نیە، یان بڵێی دەست بڕین نەهاتووە لە قورئاندا کە ئەمەش شاردنەوەی حوکمی الله-یە و بە هەمان شێوە کوفرە، کە یەهود ئەم کوفرەشیان ئەنجامدا، وەک لە کۆمەڵێک ڕیوایەت هێنامان کاتێک پێغەمبەرﷺ پرسیار لە یەهود دەکات دەربارەی حوکمی زیناکەری خێزاندار، حوکمەکەی دەشاردنەوە، وە یەهود لەناو خۆیاندا دانە بەوە دەنێن کە حوکمی ڕەجمیان شاردۆتەوە، وە ئینکاری حوکمی ڕەجم دەکەن کاتێک پێغەمبەرﷺ پرسیاریان لێ دەکات ڕەجم نابینن لە تەوراتدا ؟ لە وەڵامدا دەڵێن: هیچ شتێکی ئاوای تێدا نابینین ! هەروەها شاردنەوەیان بۆ وەصفی پێغەمبەرﷺ کە بەو جۆرەی وەصف کرابوو لە تەوراتدا گۆڕییان بۆ وەصفێکی تر، هەروەها گۆڕینی چەندەها ئایەتی تر لە تەوراتدا، بەڵام ئەم چوار ئایەتەی سورەتی المائدة تایبەت بە ڕووداوی زینا کردنەکە دابەزین هەروەک لە ڕیوایەتەکاندا هاتووە، ئەگینا دەستکاری کردنی تەورات لەلایەن یەهودەوە تەنها لە گۆڕینی ڕەجم کۆنەبۆتەوە، بەڵام زانینی ئەمە گرنگە کە ئایەتەکانی ٤٤ و ٤٥ و ٤٧ دەربارەی چی و کێ دابەزیون، وە حوکمەکانیان چەندە پەیوەستن بە هۆکاری دابەزینیان هەروەک دواتر باسی دەکەین.

## وەڵامدانەوەی گومانێکی حزبە بەناو ئیسلامیەکان:

خاڵێک هەیە لە ڕووداوی ڕەجم کردنی دوو زیناکەرەکە کە ئەو حزبانەی چوونەتە پەرلەمان و ڕازی بوونە بە دیموکراسی و یاسا دانراوەکان دەیکەن بە بیانوو بۆ ئەم کوفرانەیان، دەڵێن: ئەوەتا پێغەمبەرﷺ حوکمی بە تەورات کرد کە کتێبێکی تەحریف کراوە ! پەنا بە الله دەیانەوێ کوفرە ڕۆشنەکانیان بەمە پەردەپۆش بکەن و ئەم کارە قێزەونە بدەنە پاڵ پێغەمبەرﷺ کە هەر کەسێک تۆزێک ئیمانی لە دڵدا بێت جورئەت ناکات ئەم قسەیە بکات، چونکە حوکم کردن بە غەیری شەرعی الله لە گەورەترین حاڵەتیدا کە کوفرە تاکو بچووکترین حاڵەتی کە تاوانە، هەرکامیان بدرێتە پاڵ پێغەمبەرﷺ ئەوا بێ ڕێزی کردنە بەرامبەری لە ڕووداوێکی لەم جۆرەدا، ئەگەرچی پێغەمبەران توشی تاوانی بچووکیش دەبن، تەنانەت گەر بووترێ لەم کارەدا کەوتۆتە هەڵەوە بەڵام عوزری هەبووە بۆیە تاوانبار نیە ئەوا هەر بێ ڕێزی کردنە بەرامبەری لە ڕووداوێکی لەم جۆرەدا، ئایا هیچ موسڵمانێک دەڵێ: پێغەمبەرﷺ حوکمی بە کتێبێک کردووە کە دەزانێ ئەم کتێبە تەحریف کراوە، وە دڵنیا نیە ئەو حوکمەی لەناو کتێبەکەدا هەیە حوکمی الله-یە یان تەحریفی یەهودە ؟!!!

لە وەڵامی ئەم گومانە قێزەون و پیسە دەڵێین: پێغەمبەرﷺ بە وەحی پێی ڕاگەیەندرا کە حوکمی زیناکەری خێزاندار ڕەجمە، ئەویش بە وەحی حوکمی کرد نەک حوکم بگەڕێنێتەوە بۆ کتێبێک کە نەزانرێ کامەی کەلامی الله-یە و کامەی کەلامی یەهودە، یان سیقە بە ووتەی کەسانێک بکات کە دەزانێت کافرن و کتێبی الله-یان تەحریف کردووە.

بەڵگەکان لەسەر ئەوەی کە پێغەمبەرﷺ حوکمی بە وەحی کرد لە ڕەجم کردنی دوو زیناکەرە خێزاندارەکە، وە پرسیار کردنی لە یەهود دەربارەی حوکمی الله لە تەوراتدا هەر بە وەحی بوو نەک پشت بەستن بێ بە ووتەی یەهود دەربارەی حوکمی الله.

**مقاتل بن سليمان** دەڵێ:

كعب بن الأشرف و مالك بن الضيف و كعب بن أسيد و أبو لبابة هاتن بۆ لای پێغەمبەر ﷺ، ووتیان: پێمان بڵێ حوکمی دوو زیناکەری خێزاندار چیە ؟ **جا جبريل ﷺ هات بۆ لای پێغەمبەر پێی ڕاگەیاند کە حوکمەکەی ڕەجمە، پاشان جبريل ﷺ بە پێغەمبەری ووت: ابن صوريا بکە بە شایەت لەنێوان خۆت و ئەواندا.**

**[تفسير مقاتل بن سليمان : 1/475-476]**

**الثعلبي** دەڵێ:

كعب بن الأشرف و كعب بن أسيد و سعد بن عمرو ومالك بن الصيف و كنانة بن أبي الحقيق و عباس بن قيس و أبو نافع و أبو يوسف عازار و سلول هاتن بۆ لای پێغەمبەری الله ﷺ ووتیان: ئەی محمد پێمان بڵێ پیاو و ژنی زیناکەر گەر خێزاندار بن حەددیان چیە ؟ لە کتێبەکەتدا چ حوکمێک هاتووە ؟ پێغەمبەری الله ﷺ پێی فەرموون: ئایا ڕازی دەبن بە حوکمی من لەم بابەتە ؟ ووتیان: بەڵێ، **جا جبريل دابەزی بە حوکمی ڕەجم**، یەهود ڕازی نەبوون وەری بگرن، **جبريل ووتی: لەنێوان خۆت و ئەواندا ابن صوريا بکە بە شایەت.**

**[تفسير الثعلبي : 4/64]**

**ابن كثير** (دوای هێنانی ئەو فەرموودانەی کە پێغەمبەر ﷺ پرسیاری لە یەهود کرد دەربارەی حوکمی زیناکەر لە تەوراتدا، ئەوانیش دانیان پێدانا کە حوکمەکەی ڕەجمە، پێغەمبەریش ﷺ ڕەجمی

کردن) پاشان دەڵێ:

ئەم فەرموودانە بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە پێغەمبەری الله ﷺ حوکمی کردن بە هەمان حوکمی تەورات، ئەمەش ئیلزام کردنی یەهود نیە بە تەورات، چونکە ئەوان فرمانیان پێکراوە شوێنی شەرعی محمدی بکەون هیچ چاریان نیە. **بەڵام ئەمە بە وەحی تایبەت بوو لەلایەن الله ﷻ بۆ پێغەمبەرەکەی کە حوکمی زیناکەر ڕەجمە.**

**[تفسير ابن كثير : 116/3]**

**ابن تيمية** دەڵێ:

مەزهەبی جمهوری سەلەف و پێشەوایان ئەوەیە کە شەرعی پێش خۆمان شەرعە بۆ ئێمەش مادام شەرعی خۆمان بە خیلافی ئەو نەهاتبێ.

**[الجواب الصحيح لمن بدل دين المسيح : 436/2]**

ووتم: بەهۆی تەحریف کردنی ئینجیل و تەورات پێویستیمان بەوە هەیە بزانین کامە حوکم تەحریف نەکراوە تاکو بڵێین ئەمە شەرعی پێش خۆمانە و شەرعە بۆ ئێمەش، ئەمەش لە ڕێگای وەحیەوە دەزانرێ، جا بۆیە لە ڕووداوی ڕەجم کردنی دوو زیناکەرەکە لەلایەن پێغەمبەرەوە ﷺ هیچ گومانێک نامێنێتەوە بۆ کەسانی دڵ نەخۆش کە دەستی پێوە بگرن و بۆ مەرامی گڵاوی خۆیان بەکاری بهێنن چونکە لە ڕێگای وەحی حوکمەکەی پێ ڕاگەیەندرا.

# تەفسیری ئایەتەکانی سورەتی المائدة:

﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾ [المائدة: ٤٤]

﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ﴾ [المائدة: ٤٥]

﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ﴾ [المائدة: ٤٧]

سفيان الثوري دەڵێ:

عن ابن طاوس عن أبيه ووتی:

به ابن عباس ووترا: ﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾ **ووتی: ئەمە کوفرەکەیەتی، بەڵام وەک ئەو کەسە نیە کە کافرە بە الله و ڕۆژی دوایی.**

[تفسير سفيان الثوري : لاپەرە 59]

سفيان الثوري دەڵێ:

عن ابن جريج عن **عطاء ووتی:**

**كفر دون كفر، وفسق دون فسق، وظلم دون ظلم.**

[تفسير سفيان الثوري : لاپەرە 59]

سفيان الثوري دەڵێ:

عن رجل عن **طاوس ووتی:**

**کوفرێکی لە دین دەرخەر نیە.**

[تفسير سفيان الثوري : لاپەرە 59]

ووتم: (عن رجل) لە ڕیوایەتی تردا ئەم پیاوە ناوی هاتووە بە (سعيد المكي)، فەرمووودەناس طارق بن عوض الله لە تەحقیقی (مسائل الإمام أحمد رواية أبي داود) دەڵێ: (سعيد المكي) ناوی سعيد بن حسان المكي-ە، سیقەیە.

وە أمين بن أحمد السعدي محققی کتێبی (التوضيح عن توحيد الخلاق في جواب أهل العراق) دەڵێ: ناوی سعيد بن زياد الشيباني المكي-ە، مەقبولە.

لێرەدا ووتەکەی طارق بن عوض الله لە پێشترە چونکە ئەو ئەهلی ئەم زانستەیە بە پێچەوانەی محققی کتێبی (التوضيح عن توحيد الخلاق) کە بەپێی تەعلیقەکانی لەسەر سەنەدەکان لەوە ناچێت شارەزاییەکی ئەوتۆی هەبێت لە زانستەکانی فەرموودە.

جگە لەمەش لە کتێبی (مجلسان من إملاء النسائي) هاتووە النسائي دەڵێ: حدثنا محمد بن يحيى حدثنا محمد بن خنيس ووتی: چووینە لای سفيان الثوري نەخۆش بوو سەردانمان کرد، بینیمان سعيد بن حسان المخزومي لەلایەتی، جا سفيان بە سعيد-ی ووت: ئەو فەرموودەیەی بۆت گێڕامەوە لە أم صالح عن صفية بنت شيبة عن أم حبيبة، بۆمی دووبارە بکەرەوە، **بڕوانە [جزء فيه مجلسان من إملاء النسائي : لاپەرە 50]**.

بەڵام البخاري لە التاريخ الكبير تەرجەمەی سعيد بن حسان المخزومي المكي و سعيد بن زياد الشيباني المكي و سعيد المكي هەرسێکیانی بە جیا هێناوە واتا سعيد المكي بە هیچ کام لەم دوو سعيد-ە نازانێت، لە تەرجەمەکەی تەنها ئەمەندە دەڵێ: (سعيد المكي: عن طاوس قوله) واتا: ووتەی طاوس-ی ڕیوایەت کردووە لە طاوس.

مەبەستی ئەوەیە ڕاستەوخۆ لە طاوس ڕیوایەتی کردووە بەبێ واسطة، وە مەبەستی ئەوەشە تەنها ووتەی طاوس-ی ڕیوایەت کردووە نەک فەرموودە ڕیوایەت بکات لە طاوس یان ئاثاری هاوەڵان، وە ڕەنگە البخاري مەبەستی ئەم ڕیوایەتە بێت کە لێرەدا سفيان هێناویەتی، والله أعلم، جا ئەم سعيد المكي-ە هەر کەسێک بێت گرنگ نیە، تەنانەت ئەم سەنەدە بوونیشی نەبوایە ئەوا هیچ لە بابەتەکە ناگۆڕێت، چونکە ئەم ووتەیەی ابن عباس و عطاء و طاوس هێندە بەر بڵاوە بە دەگمەن دەبینیت زانایان باسی نەکەن لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا،

زۆرینەیان ئەم ووتەیە دووبارە دەکەنەوە و ڕەددی خەواریجی پێ دەدەنەوە، بە جۆرێک ژمارەیەکی هێندە زۆر لە زانایان ئەم ووتەیە دووبارە دەکەنەوە وەک دواتر دەیهێنین تا وای لێدێت ئەو کەسەی کە ڕۆژێک لە ڕۆژان وتوویەتی ئەثەری کفر دون کفر زەعیفە، لەگەڵ بینینی ئەم هەموو ووتەیە ئارەقەی شەرمەزاری بڕێژێت و بڵێ من لەکوێ و ئەهلی عیلم لەکوێ! سەدە دوای سەدە هەموو زانایان دووبارەی دەکەنەوە و بەڵگەی پێ دەهێننەوە، یەک کەسیان ڕەخنە لە سەنەدەکانی ناگرێت لە هیچ سەردەمێک و هیچ مەزهەبێک، کەچی منیش تازە هاتووم جارێک بەهۆی هشام بن حجیر تەزعیفی دەکەم لە کاتێکدا ئەو زانایانەی ئێمەیان فێرکردووە حاڵی هشام بن حجیر چۆنە هەر ئەوان بەڵگە دەهێننەوە بە ڕیوایەتەکەی، جارێک دەڵێم ڕیوایەتەکە مدرج-ە ووتەی ابن طاوس خراوەتە ناو ووتەی ابن عباس، وەک بڵێی ابن طاوس ئەهلی عیلم نەبێت ووتەکەی هیچ سەنگی نەبێت، ئەی پاشان بۆ زانایان ڕەخنەیان لەم ووتەیەی ابن طاوس نەگرت ؟! ئەی بۆ کەسیان ڕیوایەتەکەی ابن عباس-یان تەعلیل نەکرد بە بیانووی ئەوەی ووتەکە هی ابن طاوس-ە ؟! ئەصلەن بۆ هەموویان هەمان ووتە دووبارە دەکەنەوە و کردوویانە بە عەقیدەی خۆیان ؟ وە جارێک دەڵێم (عن سعيد المكي) ئەم کەسە مەجهولە و نابێتە بەڵگە، وەک بڵێی سەلەف لە بابەتێکی ئاوا گرنگدا پشتیان بە کەسێک بەستبێ کە نەزانن کێیە و نەناسراو بێ لەلایان، وە هیچ بەڵگەیەکی تریان بە دەستەوە نەبوو بێت جگە لەمە ! وە جارێک دەڵێم ڕیوایەتی تر هاتووە لە ابن عباس کە دەڵێ: ئەمە کوفرە، بەبێ باسکردنی کوفری بچووک، بۆیە ڕیوایەتەکان دژ بەیەکن، وە ئەوەیان کە باسی کوفر دەکات بە ڕەهایی سەنەدەکەی صەحیحە، بۆیە ئەوەی تریان مونکەرە کە دەڵێ کفر دون کفر ! زانایانی متقدمین لە زانستی فەرموودە عیللەتی ئاوا شاراوە دەدۆزنەوە لە ڕیوایەتەکان کە سەرت دەسوڕمێنێ تەنانەت لە بابەتانی زۆر لەمە سادەتر، کەچی لە بابەتێکی ئاوا گرنگدا کە بابەتی کوفر و ئیمانە تێناگەن کە ئەم دوو ڕیوایەتە دژی یەکترن کە جارێکیان کوفر بە تەنها هاتووە و جارێکیان کوفری بچووک هاتووە، وە نازانن ئەو ڕیوایەتەی کە کوفر بە تەنها هاتووە صەحیحترە ! بۆیە تەنها ڕیوایەتی کفر دون کفر باس دەکەن و بەڵگەی پێ

دەهێننەوە و ڕەددی خەواریجی پێ دەدەنەوە، کەسیشیان لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا ناڵێ: وە لە ڕیوایەتی تردا هاتووە ابن عباس دەڵێ: کوفرە بەبێ باسکردنی کوفری بچووک ! ئەم ووتەیە هیچ مانایەکی نیە جگە لە خیانەت کردن لە ئاثاری هاوەڵان و گومڕا کردنی خەڵک لەلایەن سەلەفەوە، یان ئەو پەڕی نەزانینی سەلەفە بە زانستەکانی فەرموودە و تەصحیح و تەزعیف کردن کە ئەم ڕیوایەتەی باسی کوفر دەکات بە ڕەهایی ئاوڕی لێ نادەنەوە، تەنها ئەو ڕیوایەتە دەهێنن کە باسی کفر دون کفر دەکات !

وە تۆی نەزانی کە لە مانای ڕیوایەتەکە تێنەگەیشتووی، وە بێ ئاگای لە ڕیوایەتەکانی تر کە ابن عباس خۆی ئەم کوفرە ڕوون دەکاتەوە مەبەست پێی چیە، کە دەڵێ کوفرە، دواتر هەر خۆی دەڵێ: بەڵام وەک ئەو کەسە نیە کە کافرە بە الله و بە ڕۆژی دوایی، یان وەک ئەو کەسە نیە کە کافرە بە الله و بە فریشتەکانی و بە کتێبەکانی و بە پێغەمبەرانی، تەنانەت گەر لە شوێنێک تەنها بڵێ: (هي به کفر) بەبێ ڕوونکردنەوە ئەوا هەر مانای کوفری گەورە نادات، بە بەڵگەی ئەوەی پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: (اثنتان في الناس هما بهم كفر، الطعن في النسب و النياحة على الميت) [صحيح مسلم : ژمارە 67] واتا: دوو شت هەیە لە خەڵکیدا کوفرە تێیاندا، ئەوانیش تانەدان لە ڕەچەڵەک و گریانە لەسەر مردوو بە دەنگی بەرز و قیژاندان.

جا گەر ئەوەی پێغەمبەرﷺ فەرمووی کوفری بچووک بێت ئەوا ووتەکەی ابن عباس-یش هەمان شتە، بە تایبەتی ابن عباس خۆی لە ووتەی تردا ڕوونی دەکاتەوە کە ئەم کوفرە وەک کافربوون نیە بە الله و بە ڕۆژی دوایی، یان دەڵێ: کوفرێک نیە لە دین دەرخەر بێت، یان دەڵێ: کفر دون کفر، تەنانەت قوتابیەکانی خۆی هەمان شت دووبارە دەکەنەوە، ئایا ئەوانیش لێی تێنەگەیشتن مەبەستی کام جۆری کوفرە، تەنها ئێوە تێگەیشتن و ئوممەتتان ئاگادار کردەوە لەم هەڵە زەقە کە هەموو سەلەف و خەلەف تێی کەوتوون بە قوتابیەکانیشیەوە ؟!

جا گەر کەسێک هەر عینادی بکات و بڵێ من ئەم ووتانەم قبوڵ نیە و ئەثەری (کفر دون کفر) زەعیفە، ئەوا تیرێک دەدەین لەسەر دڵی و جووڵەی ناهێڵین کاتێک ڕیوایەتەکەی سفیان الثوري بۆ دەهێنین کە بە مەبەست یەکەمجار ئەم ڕیوایەتەم هێنا تاکو زوو بێدەنگ بکرێن

بواری فێڵ لەخۆ کردن و هەڵخەڵەتاندنی خۆیان نەبێت، ئەمەش ڕیوایەتەکە دووبارەی دەکەمەوە، با بزانین چ کەسێک لە زانا و نەزان جورئەتی ئەوە دەکات بڵێ زەعیفە.

(سفيان الثوري عن ابن طاوس عن طاوس) دەڵێ: بە ابن عباس ووترا: ﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾ ووتی: ئەمە کوفرەکەیەتی، بەڵام وەک ئەو کەسە نیە کە کافرە بە الله و ڕۆژی دوایی.

ئەمە ئەو سەنەدەیە کە هەموو ئەوانەی ئەثەری (كفر دون كفر) لە بنەڕەتدا ڕەت دەکەنەوە هەرگیز باسی ناکەن و قسەی لەسەر ناکەن، بە جۆرێک وەک بڵێی ئەم سەنەدە هەر بوونی نیە ! کەچی هەمیشە باسی ئەو سەنەدانە دەکەن کە ڕاوی کێشە لەسەریان تێدایە.

سفيان الثوري: ئیمامە، قسەی لەسەر ناکرێت
ابن طاوس (عبدالله بن طاوس) ئیمامە، قسەی لەسەر ناکرێت
طاوس بن كيسان: ئیمامە، قسەی لەسەر ناکرێت

ئەم سێ کەڵە پیاوە مەزنە لە سەنەدەکە دان، کێ جورئەت دەکات تەزعیفی بکات یان بە ڕێگایەک لە ڕێگاکان بیەوێ تانەی لێ بدات ؟

کەسانی واش هەن بەناوی عیلمەوە قسە دەکەن و خۆیان دەهێننەوە ئاستێکی زۆر نزم بە جۆرێک شەرم لە ووتەکانیان دەکرێ، دەڵێن: مادام ابن طاوس-یش دەڵێ: وەک ئەو کەسە نیە کە کافرە بە الله و بە فریشتەکانی و بە کتێبەکانی و بە پێغەمبەرانی، ئەوا لە ئەصلدا ووتەکە هی ئەوە بەڵام بە هەڵە دراوەتە پاڵ ابن عباس، کاتێک ڕاوی ڕیوایەتێک دەگەڕێتەوە لەکۆتاییدا ووتەی خۆی تێدەکات، ئەوەی دەیبیستێ وادەزانێ ووتەکەی کۆتاییش هەر لە ڕیوایەتەکە دایە، نازانێ ووتەی کۆتایی ووتەی ڕاویەکەیە، ئەم ڕیوایەتەش بەم جۆرەیە، ابن

عباس تەنها وتوویەتی: (هی به کفر)، بەڵام ابن طاوس لەکۆتاییدا ئەم ووتەیەی شەرح کردووە وتوویەتی: بەڵام وەک ئەو کەسە نیە کە کافرە بە الله و بە ڕۆژی دوایی، جا ئەوەی بیستوویەتی وادەزانێ ئەم ووتەیەی کۆتاییش هەر ووتەی ابن عباس-ە. !!!

سەرەتا ئەمە تانەدانە لە ابن طاوس کە ئیمامێکی گەورەیە کوڕی تابعی گەورە طاوس بن کیسان-ە، گەر ئەم ووتەیە ووتەی جەهمی و مورجیئە بێت و سەلەف لێی بەری بن، ئەوەی وابڵێ مەدخەلی بێت، ئایا حوکمی ابن طاوس چیە لەلای ئێوە ؟ جەهمیە یان مورجیئە؟ یان بە کرێگیراوی دەسەڵاتە ؟ ئەی باشە هەڵوێستی سەلەف چی بوو بەرامبەر ئەم ووتەیەی ابن طاوس ؟ ووتیان تۆ مورجیئەی لە ووتەی ابن عباس تێنەگەیشتووی هاتووی بە ئارەزووی خۆت شەرحی دەکەیت ؟ هێرشیان کردە سەری هەروەک ئەمڕۆ هێرش دەکرێتە سەر هەر کەسێک کە بڵێ ئەم کوفرە کوفری بچووکە ؟ وە ئایا کەسیان ڕوونیان کردەوە بڵێن ئەمە مدرج-ە ووتەی ابن طاوس تێکەڵ کراوە بە ووتەی ابن عباس ؟ یان تەنها عەللامەکانی ئەمڕۆ ئەم عیللەتە شاراوەیان دۆزییەوە ؟

پاشان ئێمە لە (سفيان الثوري عن ابن جريج عن عطاء) ڕیوایەتمان کرد کە دەڵێ: كفر دون كفر، و فسق دون فسق، و ظلم دون ظلم، کە سەنەدێکی صەحیحە وەک تیشکی خۆرە، وە لە (سفيان الثوري عن سعيد المكي عن طاوس) ڕیوایەت کراوە کە دەڵێ: کوفرێک نیە لە دین دەرخەر بێت، عطاء بن أبي رباح و طاوس بن کیسان دوو قوتابی ابن عباس بوونە، ابن طاوس لە چینی ئەم دووانە نەبووە بە حوکمی ئەوەی تەمەنی بچووکترە، وە بە ابن عباس نەگەیشتووە، جا گەر سەرچاوەی (كفر دون كفر) ابن طاوس بێت یەکەم کەس ئەو ئەمەی ووتبێ، ئەی چۆن طاوس کە باوکیەتی و پێش خۆی ژیاوە، وە عطاء هاوڕێی باوکیەتی و پێش خۆی ژیاوە بە هەمان شێوە دەڵێن (كفر دون كفر) ؟! ئایا ئەوانیش کە قوتابی ابن عباس بوونە نەیانزانیوە مەبەستی ابن عباس چیە، چاوەڕێیان کردووە تا کوڕەکەی طاوس گەورە دەبێت ئەو بۆیان ڕوون دەکاتەوە ؟! یان ئەوانیش ووتەکەی ابن طاوس-یان لێ تێکەڵ بووە لەگەڵ ووتەکەی ابن عباس ؟!

ئایا لە لای ئێوە ناکرێ مامۆستا قسەیەک بکات و عەقیدەیەکی هەبێت لە پاشان قوتابیەکانی هەمان قسە بکەن و لەسەر هەمان مەنهەج برۆن ؟ گەر مامۆستا فەتوایەکی دا قوتابیەکانی هەمان فەتوایاندا، ئایا ناکرێ لە مامۆستاکەیان وەرگرتبێ ؟ ئیللا دەبێت فەتواکە هی قوتابیەکە بێت بە هەڵە درا بێتە پاڵ مامۆستاکە ؟ ئەمە چ قسەیەکە کە دەڵێن: مادام ابن عباس وتوویەتی کفر دون کفر، طاوس یان ابن طاوس-یش وتوویەتی کفر دون کفر، ئەوا ووتەکە ئیللا دەبێت هی طاوس یان ابن طاوس بێت بە هەڵە درا بێتە پاڵ ابن عباس !!! هەموو زانایانیش لە سەردەمی ابن عباس-ەوە تاکو سەدەی ڕابردووش بە هەڵە ئەم ووتەیان داوەتە پاڵ ابن عباس کەسیان ئەم هەڵەیەی نەدزۆیەوە و لە گومڕاییەکی فراواندا بوون و عەقیدەیان بنیات نا لەسەر ئەم ووتەیە، بەڵام ئێوە لەم سەردەمە توانیتان هەڵەکە بدۆزنەوە و عەقیدەی خەڵکی ڕاست بکەنەوە !!!

ئینجا ئێستا ڕیوایەتێک دەهێنین کە ئەم بیانووەشتان پوچەڵ بکاتەوە کە دەڵێن: ووتەکە هی طاوس-ە یان هی ابن طاوس-ە بە هەڵە دراوەتە پاڵ ابن عباس.

محمد بن نصر المروزي دەڵێ:
حدثنا إسحاق أخبرنا وكيع عن سفيان عن معمر عن ابن طاوس عن أبيه ووتی:
بە ابن عباس-م ووت: ئەوەی حوکم بە قورئان نەکات کافرە ؟ ووتی: ئەمە کوفرە، بەڵام وەک ئەو کەسە نیە کە کافرە بە الله و فریشتەکانی و کتێبەکانی و پێغەمبەرانی و ڕۆژی دوایی.
**[تعظيم قدر الصلاة : ژمارە 572]**

ڕاویەکانی سەنەدەکە هەمووی ئیمامن، إسحاق بن راهويه، وكيع بن الجراح، سفيان الثوري، معمر بن راشد، عبدالله بن طاوس، طاوس، ئەمە لە ڕووی سەنەدەوە بیانووی تەزعیف کردن نیە.

لە ڕووی مەتنەوەش کە دەڵێن ووتەکە مدرج-ە ووتەی ابن طاوس یان طاوس تێکەڵ کراوە بە ووتەی ابن عباس، ئەوا مەتنەکە زۆر ڕوونە کە طاوس دەڵێ: پرسیارم لە ابن عباس ئەوەی حوکم بە قورئان نەکات کافرە، لە وەڵامدا ووتی: کوفرە بەڵام وەک ئەو کەسە نیە کە کافرە بە الله، ئایا کەسی عاقڵ دەڵێ: ابن عباس کە وەڵامی طاوس-ی دایەوە تەنها ووتی کوفرە هیچی تری نەووت، وە مەبەستی کوفری گەورە بوو، بەڵام طاوس لە وەڵامەکەی ابن عباس تێنەگەیشت لەخۆیەوە تەئویلی کرد، ئەمەی بۆ زیاد کرد کە مەبەستی کوفری بچووک بووە!!!

نامەوێت ئەم کتێبەش درێژ بکەمەوە بە قسە کردن لەسەر سەنەدەکان و حاڵی ڕاویەکان، ئەمەندەی ووترا بەس بوو، تەنها ڕیوایەتەکەی سفیان الثوري بەسە بۆ کەسێک کە حەقی بوێت، بۆیە لێرەوە چیتر باسی سەنەدەکان و حاڵی ڕاوییەکان ناکەم، هێندە ووتەی زانایان نەقل دەکەم دەربارەی ئەثەری (کفر دون کفر) بە وەرگرتن و قبوڵ کردنی، وە بەبێ ڕەخنە لێ گرتنی و قسە کردن لەسەر سەنەدەکانی، تا وای لێدێت ئەو کەسەی بیر لە زەعیفی ئەم ئەثەرە دەکاتەوە لەبەر زۆری بەڵگەکان هەست بە شەرمەزاری بکات و بڵێ: بەسە تێگەیشتم.

**عبدالرزاق** دەڵێ:

عن معمر عن ابن طاوس عن أبيه ووتی:

پرسیار لە ابن عباس کرا دەربارەی فەرمایشتی الله تعالى: ﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾ **ووتی: ئەمە کوفرە.**

**ابن طاوس دەڵێ: وەک ئەو کەسە نیە کە کافر بێت بە الله و فریشتەکانی و پێغەمبەرانی.**

[تفسير عبدالرزاق : ژمارە 713]

**سفيان الثوري** دەڵێ:

عن حبيب بن أبي ثابت عن أبي الطفيل ووتی:

به حذيفة ووترا: ئەم ئایەتە دەربارەی بەنی ئیسرائیل دابەزی ﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ﴾ ؟ حذيفة ووتی: باشترین برا بۆ ئێوە بەنی ئیسرائیلە، تاڵی بۆ ئەوانە و شیرینی بۆ ئێوەیە ! ئێوەش ڕێبازی ئەوان دەگرنە بەر بە قەدەر قەیتانی نەعل.

**[تفسير سفيان الثوري : لاپەرە 59-60]**

ووتم: مەبەستی حذيفة ئەمەیە کە ئێوەش گەر هەمان کاری ئەوان بکەن ئەوا هەمان حوکمی ئەوان دەتانگرێتەوە، ناکرێ هەردووکتان یەک کار ئەنجام بدەن و سزاکەش تەنها بۆ ئەوان بێت و ئێوە نەگرێتەوە، جا هەر کەسێک وەک یەهود حوکمی الله بگۆڕێت و ئینکاری لێ بکات ئەوا حوکمی ئایەتەکە ئەوایش دەگرێتەوە، بەڵام سەبارەت بە دابەزینی ئایەتەکە بە فەرموودە هێنامان لە صەحیحی مسلم کە هەر سێ ئایەتەکە دەربارەی کافران دابەزیون.

سەبارەت بەوەش کە دەڵێ: (بە قەدەر قەیتانی نەعل) ئەوکات نەعل بە قەیتان پێشەکەی دادەخرا تاکو پێ بگرێت و نەیەتە دەرەوە، جا مەبەستی ئەوەیە کە ئەم ئوممەتە هێندە شوێنی یەهود و نەصارا دەکەون و لاساییان دەکەنەوە تەنانەت لە شتانی زۆر بچووکیش لاساییان دەکەنەوە پێ بە پێی ئەوان دەڕۆن وەک بڵێی هەمان شتن هێندە لەیەکتر دەچن.

**سفيان الثوري** دەڵێ:

عن منصور عن **إبراهيم ووتی:**

﴿وَلۡيَحۡكُمۡ أَهۡلُ ٱلۡإِنجِيلِ بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فِيهِۚ وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ﴾ [المائدة:٤٧]، دەربارەی بەنی ئیسرائیل دابەزیوە، وە ڕازی بووە پێی بۆ ئەم ئوممەتەش.

**[تفسير سفيان الثوري : لاپەرە 60-61]**

ووتم: واتا ئەم ئوممەتەش دەگرێتەوە گەر وەک ئەوان بکەن.

**سفيان الثوري** دەڵێ:

عن جابر عن **الشعبي ووتی:**

﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ﴾ ئەم ئایەتانە یەکەمی دەربارەی ئەم ئوممەتە دابەزیوە، دووەمی دەربارەی یەهود دابەزیوە، سێیەمی دەربارەی نەصارا دابەزیوە.

**[تفسير سفيان الثوري : لاپەرە 61]**

**سفيان الثوري** دەڵێ:

عن زكريا عن **الشعبي ووتی:**

هەمان تەفسیری پێشوو (مثله).

**[تفسير سفيان الثوري : لاپەرە 61]**

ووتم: الشعبي بەم ووتەیە ناسراوە، وە پێم وانیە هیچ کام لە سەلەف بەم دەقە بڵێن ئایەتی یەکەم دەربارەی موسڵمانان دابەزیوە جگە لە الشعبي، ئەگەرچی هەندێکیان دەڵێن موسڵمانانیش دەگرێتەوە بەڵام دان بەوە دەنێن کە دەربارەی بەنی ئیسرائیل دابەزیوە، کە فەرموودەش هەبوو لەم بارەیەوە لە پێشترە وەربگیرێت، وە زانایانی خەلەفیش لە موفەسیرین موناقەشەی ووتەی سەلەفیان کردووە دەربارەی دابەزینی ئایەتەکان وەک دواتر دەیهێنین، بەڵام ئەمە مانای ئەوە نیە کە الشعبي بڵێ: هەر کەسێک لە موسڵمانان حوکم بە قورئان نەکات کافرە، بەڵکو لە مەرجی تەکفیر کردن هاوڕای سەلەفە گەر وەک ئینکارکردن و گۆڕینی حوکمی الله کاری پێ نەکات ئەوکات کافرە.

## ابن أبي حاتم دەڵێ:

حدثنا أبي حدثنا أبو صالح حدثني معاوية بن صالح عن علي بن أبي طلحة عن **ابن عباس:**
دەربارەی فەرمایشتی الله: ﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ﴾ ووتی: الله دەفەرمووێ: هەر کەسێک **ئینکاری حوکم کردن بەوە بکات کە الله دایبەزاندووە ئەوا کافر بووە.** وە هەرکەسێک دانی پێ بنێت و حوکمی پێ نەکات **ئەوا زاڵم و فاسقە.**
دەفەرمووێ: هەرکەسێک ئینکاری یەکێک لە حدودەکانی الله بکات ئەوا کافر بووە.

**[تفسير ابن أبي حاتم : 103/5]**

## ابن أبي حاتم دەڵێ:

حدثنا أحمد بن عثمان بن حكيم الأودي -فيما كتب إلي- حدثنا أحمد بن مفضل حدثنا أسباط عن **السدي:** دەربارەی فەرمایشتی الله: ﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ﴾ ووتی: هەرکەسێک حوکم بەوە نەکات کە دامبەزاندووە، بە ئەنقەست تەرکی بکات و لێی لا بدات و زوڵم بکات و حوکمی الله-ش بزانێ ئەوا لە کافرانە.

**[تفسير ابن أبي حاتم : 103/5]**

ووتم: ئەمە تاکە تەفسیرە کە لە سەلەفەوە هاتبێ و ڕووکەشەکەی تەکفیر کردن بێ تەنها بەهۆی حوکم نەکردن بە قورئان بەبێ باسکردنی هیچ مەرجێک، ئەم ووتەیەی السدي-ت بیرنەچێ دواتر قسەی لەسەر دەکەین.

## ابن أبي حاتم دەڵێ:

قرأت على محمد بن الفضل حدثنا محمد بن علي حدثنا محمد بن مزاحم عن بكير بن معروف عن

**مقاتل بن حيان:** دەربارەی فەرمایشتی الله: ﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ﴾ **[المائدة: ٤٤]**، ووتی: الله دەفەرمووێ: ئەوەی حوکم بەوە نەکات کە الله دایبەزاندووە لە ڕەجم و **ئیمان هێنان بە محمد ﷺ و بە ڕاست دانانی، ئەوا ئەمانە کافرن.**

**[تفسير ابن أبي حاتم : 103/5]**

## ابن أبي حاتم دەڵێ:

أخبرنا أبو يزيد القراطيسي -فيما كتب إلي- حدثنا أصبغ بن الفرج حدثنا **عبدالرحمن بن زيد بن أسلم:** دەربارەی فەرمایشتی الله: ﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾ **[المائدة: ٤٤]**، ووتی: هەر کەسێک حوکم بەو کتێبە بکات کە بە دەستی خۆی نوسیویەتی، وە واز بهێنێت لە کتێبی الله، **وە پێی وابێت کتێبەکەی خۆی لەلایەن الله-وە نێردراوە، ئەوا کافر بووە.**

**[تفسير ابن أبي حاتم : 5/103-104]**

ووتم: ئەم ووتەیە ڕێک لەسەر یاسا دانراوەکان جێبەجێ دەبێت، واتا بە دانانی یاساش کافر نابێت تا یاساکەی خۆی دەداتە پاڵ حوکمی الله، کە یەهود ئەمەیان ئەنجامدا.

## ابن أبي حاتم دەڵێ:

﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾ **[المائدة: ٤٤]**، دەربارەی یەهود دابەزیوە، وە ڕیوایەت کراوە لە (عبدالله بن عباس و عبيدالله بن عبدالله و الحسن البصري و أبو رجاء و أبو مجلز) بە هەمان شێوە، تەنها الحسن البصري ئەمەی زیاد کردووە: لەسەر ئێمەش واجبە.

**[تفسير ابن أبي حاتم : 104/5]**

**ابن أبي حاتم** دەڵێ:

حدثنا محمد بن عبدالله بن يزيد المقرئ حدثنا سفيان عن هشام بن حجير عن طاوس عن **ابن عباس:** دەربارەی فەرمایشتی الله: ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَٰفِرُونَ﴾ **ووتی: ئەو کوفرە نیە کە ئەوان بۆی دەچن.**

[تفسير ابن أبي حاتم : 5/106-107]

**ابن أبي حاتم** دەڵێ:

حدثنا أبي حدثنا أبو الوليد -عبدالملك بن الأصبغ بن محمد بن مرزوق- حدثنا الوليد حدثنا أبو عمرو الأوزاعي حدثني النضر بن عمرو المقرئ ووتی:

پرسیارم لە الحسن کرد دەربارەی فەرمایشتی الله: ﴿وَكَتَبْنَا عَلَيْهِمْ فِيهَآ أَنَّ ٱلنَّفْسَ بِٱلنَّفْسِ وَٱلْعَيْنَ بِٱلْعَيْنِ وَٱلْأَنفَ بِٱلْأَنفِ وَٱلْأُذُنَ بِٱلْأُذُنِ وَٱلسِّنَّ بِٱلسِّنِّ وَٱلْجُرُوحَ قِصَاصٌ ۚ فَمَن تَصَدَّقَ بِهِۦ فَهُوَ كَفَّارَةٌ لَّهُۥ ۚ وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ﴾ ئەم ئایەتە تایبەتە بە ئەهلی کیتاب ؟ الحسن ووتی: بەڵکو لەسەر ئەوانیش و گشت خەڵکیشە.

[تفسير ابن أبي حاتم : 5/107-108]

**ابن أبي حاتم** دەڵێ:

حدثنا أحمد بن عثمان بن حكيم الأودي حدثنا أحمد بن مفضل حدثنا أسباط عن **السدي ووتی:**

هەندێک کەس لە یەهود موسڵمان بوون، وە هەندێکیشیان مونافیق بوون، بەنی قريظة و بەنی النضير لە جاهیلیدا گەر پیاوێک لە بەنی النضير کوژرابوایە لەلایەن بەنی قريظة، ئەوا بەنی النضير لێیان دەکوشتنەوە، وە ئەگەر پیاوێک کە لە بەنی

قريظة کوژرابوایە لەلایەن بەنی النضير، ئەوا بەنی النضير 60 وەسق لە خورمایان بەرامبەر حەقی خوێنەکە دەدا بە بەنی قريظة. کاتێک کەسانێک لە بەنی قريظة و بەنی النضير موسڵمان بوون، پیاوێک لە بەنی النضير پیاوێکی کوشت لە بەنی قريظة، حوکمیان بردەوە بۆ لای پێغەمبەر ﷺ، ئەو کەسەی لە بەنی النضير بوو ووتی: ئەی پێغەمبەری الله ئێمە لە سەردەمی جاهیلیدا حەقی خوێنەکەمان پێدەدان، ئەمڕۆش حەقی خوێنەکەیان پێدەدەین، بەنی قريظة ووتیان: نەخێر، ئێمە برای ئێوەین لە ڕەچەڵەک و لە دین، وە خوێنمان وەک خوێنی ئێوەیە، بەڵام ئێوە لە سەردەمی جاهیلیدا زاڵ بوون بەسەرماندا ئێستا ئیسلام هاتووە، جا الله تعالى ئایەتی دابەزاند کارەکەی عەیبدار کردن، فەرمووی: ﴿وَكَتَبۡنَا عَلَيۡهِمۡ فِيهَآ أَنَّ ٱلنَّفۡسَ بِٱلنَّفۡسِ﴾ **[المائدة: ٤٥]**، پاشان باسی ووتەی کەسەکەی بەنی النضير-ی کرد کە ووتی: ئێمە لە سەردەمی جاهیلیدا 60 وەسقمان پێدەدان، ئێمە لە ئەوانمان دەکوشتەوە، ئەوان لە ئێمەیان نەدەکوشتەوە، فەرمووی: ﴿أَفَحُكۡمَ ٱلۡجَٰهِلِيَّةِ يَبۡغُونَۚ﴾ **[المائدة: ٥٠]**.

**[تفسير ابن أبي حاتم: 334/4]**

ووتم: 1 وەسق = 60 صاع، 1 صاع = 4 چنگ، هەر چنگێک پڕ بە دوو دەستی مامناوەندە، نە زۆر کراوە بێت و نە زۆر داخراو بێت.

## ابن أبي حاتم دەڵێ:

حدثنا أحمد بن سنان الواسطي حدثنا أبو معاوية عن الأعمش عن عبدالله بن مرة عن **البراء:** دەربارەی فەرمایشتی الله: ﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ﴾ **ووتی: دەربارەی یەهود دابەزی.**

ابن أبي حاتم دەڵێ: وە ڕیوایەت کراوە لە (ابن عباس و الشعبي و الحسن و مقاتل بن

حیان) نزیک لەمەوە.

[تفسير ابن أبي حاتم : 5/114-115]

### ابن أبي حاتم دەڵێ:

حدثنا أبو سعيد الأشج حدثنا أبو أسامة عن سفيان عن ابن جريج عن **عطاء:**

دەربارەی فەرمایشتی الله: ﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ﴾ **ووتی: ظلم دون ظلم.**

[تفسير ابن أبي حاتم : 5/115]

### ابن أبي حاتم دەڵێ:

قرأت على محمد بن الفضل حدثنا محمد بن علي حدثنا محمد بن مزاحم عن بكير بن معروف عن **مقاتل بن حيان:** دەربارەی فەرمایشتی الله: ﴿وَلۡيَحۡكُمۡ أَهۡلُ ٱلۡإِنجِيلِ بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فِيهِۚ﴾ [المائدة:٤٧]، ووتی: الله فرمانی بە زانا و عابیدەکانی نەصارا کرد حوکم بەوە بکەن کە الله دایبەزاندووە لە ئینجیل، وە فرمانی بە زانا و عابیدەکانی یەهود کرد حوکم بەوە بکەن کە الله دایبەزاندووە لە تەورات پێش ئەوەی ئینجیل دابەزێنێ، جا کافر بوون ئەوانەی کافر بوون لە ئەهلی تەورات و ئینجیل بەهۆی باوەڕ نەهێنانیان بە محمد ﷺ، وە ووتنی عزیر کوڕی الله-یە، وە مەسیح کوڕی الله-یە، وە الله یەکێکە لە سێ خواکە، وە عیسی الله-یە، وە دەستی الله داخراوە، وە الله هەژارە و ئەوان دەوڵەمەندن، **گەر ئەوان حوکمیشیان کردبوایە بە ڕەجم و کوشتنەوەی بکوژو تۆڵەکردنەوە لە بابەتی برینداركردن ئەوا هەر کافر بوون بە الله، بەهۆی باوەڕ نەهێنانیان بە محمد ﷺ و قسە کردنیان دەربارەی الله بە درۆ و بوهتان.**

[تفسير ابن أبي حاتم : 5/118]

ووتم: بڕوانە باوەڕ نەهێنان بە پێغەمبەرﷺ، وە ووتنی ئەوەی عیسی کوڕی الله-یە و عزیر کوڕی الله-یە، ئەمانە بە کوفر و حوکم نەکردن بە کتێبی الله دادەنێت، هەروەک لە ووتەی پێشووتری حوکم نەکردن بە کتێبی الله بە باوەڕ نەهێنان بە پێغەمبەر تەفسیر کرد، نەک وەک هەندێک کەس لەبڕی ئەوەی باسی نەبوونی تەوحید بکەن لەم حکومەتانە، دێن سەرەتا باسی ئەوە دەکەب بۆ دەستی دز نابڕن بەندی دەکەن ! تەوحیدیان نیە ئیتر هەموو حەددەکانیش جێبەجێ بکەن هەر کافرن.

ابن أبي حاتم دەڵێ:

حدثنا أبو سعيد الأشج حدثنا أبو معاوية عن الأعمش عن عبدالله بن مرة عن **البراء:**

ووتی: الله ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ﴾ **هەموویان دەربارەی کافران دابەزین.**

[تفسير ابن أبي حاتم : 119/5]

ووتم: (هەموویان دەربارەی کافران دابەزین) مەبەستی ئایەتەکانی (فأولئك هم الكافرون) و (فأولئك هم الظالمون) و (فأولئك هم الفاسقون)ە.

ابن أبي حاتم دەڵێ:

حدثنا أحمد بن سنان حدثنا عبدالرحمن بن مهدي عن سفيان عن ابن جريج عن **عطاء:**

دەربارەی فەرمایشتی الله: ﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ﴾ **ووتی: فسق دون فسق.**

[تفسير ابن أبي حاتم : 120/5]

ابن أبي حاتم دەڵێ:

حدثنا علي بن الحسن الهسنجاني حدثنا مسدد حدثنا يحيى عن أشعث عن **الحسن ووتی:** دەربارەی ئەهلی شیرک دابەزیوە.

**[تفسير ابن أبي حاتم : 106/5]**

ووتم: واتا ئایەتی: ﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾.

**الطبري** لە تەفسیری ئایەتی: ﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾ دەڵێ: **الله تعالى ذكره دەفەرمووێ: هەر کەسێک حوکمی الله بشارێتەوە کە دایبەزاندووە لە کتێبەکەی و کردوویەتی بە حوکم لەنێوان بەندەکانی**، جا بیشارێتەوە و حوکم بە غەیری ئەو بکات، وەک حوکمی یەهود دەربارەی ژن و پیاوە زیناکەرە خێزاندارەکە بە سوارکردنیان بەسەر پشتی گوێ درێژ، پشتیان بەرەو یەکتر بێ و بە خەڵوز ڕوویان ڕەش بکرێت، **وە شاردنەوەیان بۆ حوکمی ڕەجم**، وە حوکمدانیان لە هەندێک لە کوژراوەکانیان بە پێدانی حەقی خوێنەکە بە تەواوی، وە لە کوژرانی هەندێکیان نیوەی حەقی خوێنەکە بدەن، وە ئەگەر کەسانی بە دەسەڵات و ڕێزدار کوژران تۆڵەی کوشتن لە بکوژ بکرێتەوە، وە ئەگەر کەسانی نزم و لاواز کوژران ئەوا حەقی خوێنەکەیان بدرێ تۆڵە نەکرێتەوە، وە الله هەموویانی یەکسان کرد لە حوکمدان لەسەریان لە تەورات، ﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾ الله دەفەرمووێ: ئەوانەی کە حوکمیان بەوە نەکرد کە الله دایبەزاندووە لە کتێبەکەی **بەڵکو حوکمی الله-یان گۆڕی و ئەو حەقەیان شاردەوە کە لە کتێبەکەی دایبەزاندووە**، ﴿هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾ **الله دەفەرمووێ: ئەوانەن کە ئەو حەقەیان شاردەوە کە لەسەریان**

**بوو ئاشکرای بکەن و ڕوونی بکەنەوە، وە دایان پۆشی لەبەرچاوی خەڵک و حوکمێکی تریان بۆ دەرخستن و حوکمیان پێی کرد بەهۆی ئەو بەرتیلەی کە وەریان گرتبوو لە خەڵکی لەسەر ئەم کارە.**

**[تفسير الطبري : 456/8]**

**الطبري** دەربارەی ئایەتی: ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَٰفِرُونَ﴾ دەڵێ: ئەهلی تەفسیر خیلافیان تێکەوت لە تەفسیر کردنی ووشەی (کوفر) لەم ئایەتەدا، هەندێکیان نزیک لە قسەکەی ئێمەیان کرد کە مەبەست پێی ئەو یەهودییانەن کە تەحریفی کتێبی اللە-یان کرد و حوکمی اللە-یان گۆڕی، (ئینجا دوای هێنانی کۆمەڵێک ڕیوایەت لە سەلەف کە لەسەر ئەم تەفسیرەن پاشان دەڵێ) وە هەندێکیان ووتیان: (الکافرون) مەبەست پێی ئەهلی ئیسلامە، (الظالمون) مەبەست پێی یەهودە، (الفاسقون) مەبەست پێی نەصارایە، (ئینجا دوای هێنانی ڕیوایەتێک لە عامر الشعبي لەسەر ئەم تەفسیرە پاشان دەڵێ) وە هەندێکیان ووتیان: مەبەست پێی کوفری بچووک و زوڵمی بچووک و فسقی بچووکە، (ئینجا دوای هێنانی کۆمەڵێک ڕیوایەت لە سەلەف کە لەسەر ئەم تەفسیرەن پاشان دەڵێ) وە هەندێکیان ووتیان: ئەم ئایەتانە دەربارەی ئەهلی کیتاب دابەزین، وە مەبەست پێی هەموو خەڵکیە بە موسڵمان و کافرەوە، (ئینجا دوای هێنانی کۆمەڵێک ڕیوایەت لە سەلەف کە لەسەر ئەم تەفسیرەن پاشان دەڵێ) وە هەندێکیان ووتیان: ئەوەی حوکم بەوە نەکات کە اللە دایبەزاندووە وەک ئینکار کردنی حوکمی اللە ئەوا کافرە، بەڵام زوڵم و فسقەکە بۆ ئەو کەسەیە کە دان دەنێت بە حوکمی اللە، (ئینجا دوای هێنانی ڕیوایەتێک لە ابن عباس لەسەر ئەم تەفسیرە پاشان دەڵێ) **وە نزیکترینی ئەم ووتانە لە**

**صەواب لەلای من ووتەی ئەوەیە کە دەڵێ: ئەم ئایەتانە دەربارەی کافرانی ئەهلی کیتاب دابەزین، چونکە ئایەتەکانی پێش ئەمانە و دوای ئەمانەش دەربارەی ئەهلی کیتاب دابەزیون، وە مەبەست پێی ئەوانە**، وە ئەم ئایەتانە لە سیاقی هەواڵ پێدانە دەربارەی ئەوان، جا حوکمەکە ببێتە هەواڵ پێدان دەربارەی ئەوان لە پێشترە، جا گەر کەسێک بڵێ: الله تعالى ذکرە هەواڵەکەی گشتاند دەربارەی هەموو کەسێک کە حوکم ناکات بەوەی الله دایبەزاندووە، چۆن تایبەتت کرد بە ئەهلی کیتاب ؟

لە وەڵامدا دەووترێ: الله تعالى هەواڵەکەی گشتاند دەربارەی کەسانێک **ئینکاری ئەو حوکمەیان دەکرد کە الله لە کتێبەکەی دایبەزاندبوو، جا هەواڵیدا دەربارەیان کە ئەوان بە تەرک کردنیان بۆ حوکمی الله بەو شێوازەی کە تەرکیان کردووە کافرن، وە هەمان شێوە دەووترێ دەربارەی هەرکەسێک کە حوکم نەکات بەوەی الله دایبەزاندووە وەک ئینکاری کردن لێی ئەوا کافرە بە الله**، هەروەک ابن عباس ووتی: چونکە بەهۆی ئینکاری کردنی لە حوکمی الله دوای زانینی ئەوەی الله لە کتێبەکەی دایبەزاندووە ئەوا هاوتای ئینکاری کردنیەتی لە پێغەمبەرایەتی پێغەمبەرەکەی دوای زانینی ئەوەی کە ئەو پێغەمبەرە.

بڕوانە [تفسير الطبري : 8/456-468]

ووتم: بڕوانە ووتەکەی (بە تەرک کردنیان بۆ حوکمی الله بەو شێوازەی کە تەرکیان کردووە کافرن) واتا تەنها تەرک کردن کوفر نیە، بەڵکو لەسەر شێوازەکەی وەستاوە کە بە چ نیەتێک تەرکی کردووە، ئینجا شێوازەکەی یەهودی باسکرد کە ئینکاری کردن بوو لە حوکمی الله.

ئەم پێنج ووتەیەی کە الطبري نەقلی کرد لە سەلەف ئێمەش نەقلی دەکەین بەڵام بەبێ سەنەد لەبەر زۆری ڕیوایەتەکان تا خۆمان لە درێژ بوونەوە بپارێزین، تەنها فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ نەبێ بە سەنەدەوە دەیهێنین و قسە لەسەر سەنەدەکەی دەکەین.

ووتەی یەکەم: ئەوانەی دەڵێن: مەبەست پێی یەهودە ئەوانەی کە کتێبی الله-یان تەحریف کرد و حوکمی الله-یان گۆڕی:

**الطبري** دەڵێ:

حدثنا ابن وكيع قال حدثنا أبو معاوية عن الأعمش عن عبدالله بن مرة عن **البراء بن عازب عن النبي** ﷺ دەربارەی فەرمایشتی الله: ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَٰفِرُونَ﴾ ، ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ﴾ ، ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ﴾ **فەرموویەتی: هەمووی دەربارەی کافران دابەزیوە.**

**بڕوانە [تفسير الطبري : 457/8]**

ووتم: ڕاستە (ابن وكيع) لە فەرموودەدا زەعیفە، بەڵام لە تەفسیر جیاوازە و پشتی پێ دەبەسترێ، جگە لەمەش مسلم لە صەحیحەکەی هەمان ئەم فەرموودەیەی ڕیوایەت کردووە کە پێشتر هێنامان، ابن وكيع-ی تێدا نیە، بەمەش بیانووی تەزعیف کردن نامێنێت.

**أبو صالح باذام** دەڵێ:

سێ ئایەتەکەی سورەتی المائدة: ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَٰفِرُونَ﴾ ، ﴿فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ﴾ ، ﴿فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ﴾ **هیچی دەربارەی ئەهلی ئیسلام دانەبەزیون، دەربارەی کافران دابەزیون.**

برِوانە [تفسير الطبري : 457/8]

**الضحاك** دەڵێ:

﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾ و ﴿ٱلظَّٰلِمُونَ﴾ و ﴿ٱلۡفَٰسِقُونَ﴾ **ئەم ئایەتانە دەربارەی ئەهلی کیتاب دابەزین.**

برِوانە [تفسير الطبري : 457/8]

**أبو مجلز :**

عمران بن حدير دەڵێ: کەسانێک لە بەنی عمرو بن سدوس هاتن بۆ لای أبو مجلز، ووتیان: ئەی أبو مجلز فەرمایشتی الله: ﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾ حەقە ؟ ووتی: بەڵێ، ووتیان: ﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ﴾ حەقە ؟ ووتی: بەڵێ، ووتیان: ﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ﴾ حەقە ؟ ووتی: بەڵێ، ووتیان: **ئەی أبو مجلز ئایا ئەمانە حوکم بە قورِئان دەکەن ؟ ووتی: قورِئان دینی ئەوانە و دینداری پێ دەکەن و دانی پێدەنێن و بانگەوازی بۆ دەکەن، جا ئەگەر ئەوان شتێکیان واز لێهێنا لە قورِئان ئەوان دەزانن کە توشی تاوان بوونە،** ووتیان: نەخێر واللە، بەڵام تۆ دەترسی، ووتی: ئێوە لە پێشترن لە من کە بترسن، من رِەئی ئێوەم نیە، وە ئێوە ئەم رِەئیەتان هەیە و ئیحراجیش نابن ! **بەڵام ئەم ئایەتانە دەربارەی یەهود و نەصارا و ئەهلی شیرک دابەزین، یان نزیک لەوە.**

برِوانە [تفسير الطبري : 8/457-458]

ووتم: واتا من وەک ئێوە ناڵێم ئەمانە کافرن، بەڵام ئێوە پێتان وایە کە ئەوان کافرن کەچی دەنگیش ناکەن، کەواتە ئێوە لە پێشترن پێتان بووترێ دەترسن نەک من، ئێوە شایستەن ئیحراج بن نەک من.

## أبو مجلز:

عمران بن حدير دەڵێ: هەندێک لە ئیباضیەکان لەلای أبو مجلز دانیشتن، پێیان ووت: الله دەفەرمووێ: ﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾ ، ﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ﴾ ، ﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ﴾ **أبو مجلز ووتی: ئەوان کار بەوە دەکەن کە کاری پێدەکەن -واتا دەسەڵاتدارەکان- وە دەزانن کە تاوانە، ئەم ئایەتانە دەربارەی یەهود و نەصارا دابەزین**، ئیباضیەکان ووتیان: والله تۆ دەزانی هەروەک ئێمە دەیزانین بەڵام تۆ لێیان دەترسیت، أبو مجلز ووتی: ئێوە لە ئێمە لە پێشترن کە بترسن، ئێمە ئەو شتانە نازانین کە ئێوە دەیزانن، بەڵام ئێوە دەیزانن، بەڵام ترسی ئەوان ڕێگریتان لێدەکات کارەکەتان بەڕێوە ببەن.

**بڕوانە [تفسير الطبري : 458/8]**

ووتم: ئێوە پێتان وایە ئەوان کافرن من پێم وانیە، بەڵام ئێوە لە ترسی ئەوان ناتوانن خروج بکەن و ئەوەی دەتانەوێ ئەنجامی بدەن.

## حذیفة رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ دەڵێ:

باشترین برا بۆتان بەنی ئیسرائیلە، گەر هەرچی تاڵی هەیە بۆ ئەوان بێت و هەرچی شیرینی هەیە بۆ ئێوە بێت، ئێوەش ڕێبازی ئەوان دەگرنە بەر بە قەدەر قەیتانی نەعل.

بڕوانە [تفسير الطبري : 8/458-459]

**عكرمة** دەڵێ:

**ئەم ئایەتانە دەربارەی ئەهلی کیتاب دابەزین.**

بڕوانە [تفسير الطبري : 8/459]

**قتادة** دەڵێ:

**دەربارەی کوژراوێکی یەهود دابەزی.**

بڕوانە [تفسير الطبري : 8/460]

**البراء بن عازب** رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ دەڵێ:

﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾ **واتا یەهود**

﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ﴾ **واتا یەهود**

﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ﴾ **هەموو کافران دەگرێتەوە.**

بڕوانە [تفسير الطبري : 8/460]

**عبدالرحمن بن زيد بن أسلم:**

هەر کەسێک حوکم بەو کتێبە بکات کە بە دەستی خۆی نوسیویەتی، وە واز بهێنێت لە کتێبی الله، **وە پێی وابێت کتێبەکەی خۆی لەلایەن الله-وە نێردراوە، ئەوا کافر بووە.**

بڕوانە [تفسير الطبري : 8/461]

## عبيدالله بن عبدالله بن عتبة بن مسعود:

پیاوێک لەلای ئەم ئایەتانەی باسکرد: ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَٰفِرُونَ﴾ ، ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ﴾ ، ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ﴾ **عبیداللە ووتی: واللە زۆربەی خەڵکی ئەم ئایەتانە تەفسیر دەکەن لەسەر شتانێک کە ئایەتەکان لەسەر ئەم شتانە دانەبەزیون، ئەم ئایەتانە دانەبەزیون تەنها لەسەر دوو هۆزی یەهود نەبێ**، پاشان ووتی: ئەم دوو هۆزە قریظة و النضیر بوون، یەکێک لەم دوو کۆمەڵەیە هێرشی کردە سەر کۆمەڵەکەی تر و زاڵ بوو بەسەریدا پێش هاتنی پێغەمبەرﷺ بۆ مەدینە، تاکو ڕازی بوون و ڕێککەوتن لەسەر ئەوەی کە هەر کوژراوێک کۆمەڵە بەهێزەکە بیکوژێ لە کۆمەڵە لاوازەکە ئەوا حەقی خوێنەکەی پەنجا وەسقە، وە هەر کوژراوێک کۆمەڵە لاوازەکە بیکوژێ لە کۆمەڵە لە بەهێزەکە ئەوا حەقی خوێنەکەی سەد وەسقە، جا ئەم جیاوازییەیان پێدان بەهۆی ترس و لاوازییەوە، پێغەمبەرﷺ هاتە مەدینە ئەوان هەر لەسەر ئەم ڕێککەوتنە بوون، جا هەردوو کۆمەڵەکە لاواز بوون بەهاتنی پێغەمبەر ﷺ، وە پێغەمبەرﷺ ئەم حاڵەی ئەوانی بۆ دەرنەکەوتبوو، جا کاتێک ئەوان لەسەر ئەم حاڵە بوون کۆمەڵە لاوازەکە کەسێکی کوشت لە کۆمەڵە بەهێزەکە، کۆمەڵە بەهێزەکە ووتیان: سەد وەسقمان پێ بدەن، کۆمەڵە لاوازەکە ووتیان: هەرگیز شتی ئاوا بووە دوو هۆز یەک دینیان هەبێت و یەک شاریان هەبێت، حەقی خوێنی هەندێکیان دوو ئەوەندەی حەقی خوێنی هەندێکی تر بێت ؟! ئێمە کە ئەو جیاوازییەمان پێ دەدان بەهۆی ترس و لاوازیمان بوو بەرامبەرتان، لەنێوان خۆمان و خۆتان محمد بکەن بە حاکم، جا ڕازی بوون کە پێغەمبەر ﷺ لەنێوان خۆیاندا

بکەن بە حاکم، پاشان کۆمەڵە بەهێزەکە لەناو خۆیاندا ڕاوێژیان کرد ترسان لەوەی پێغەمبەر ﷺ دوو ئەوەندەی حەقی خوێنەکەیان پێ نەدات، جا برایانیان لە مونافیقەکان نارد بۆ لای پێغەمبەر ﷺ، پێیان ووتن: ڕەئی محمد-مان پێ بڵێن، گەر ئەوەی پێ داین کە دەمانەوێ ئەوا دەیکەین بە حاکم، وە ئەگەر پێی نەداین خۆمانی لێ دەپارێزین و نایکەین بە حاکم، جا مونافیقەکە چوو بۆ لای پێغەمبەر ﷺ، الله تعالی ذکرە هەمووی بە پێغەمبەر ﷺ ڕاگەیاند کە مەبەستیان چیە لەم کارەدا.

**عبیدالله ووتی: جا الله تعالی ذکرە ئەم ئایەتانەی دەربارەیان دابەزاند:** ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلرَّسُولُ لَا يَحۡزُنكَ ٱلَّذِينَ يُسَٰرِعُونَ فِي ٱلۡكُفۡرِ﴾ **هەموو ئەم ئایەتانە تا گەیشت بە ئایەتی:** ﴿وَلۡيَحۡكُمۡ أَهۡلُ ٱلۡإِنجِيلِ بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فِيهِۚ وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ﴾ **عبیدالله ئایەت بە ئایەت خوێندییەوە و تەفسیری کرد کە دەربارەی چی دابەزیوە، تاکو تەواو بوو لە تەفسیر کردنی ئەم ئایەتانە، پاشان ووتی: ئەم ئایەتانە مەبەست پێی یەهودە، وە دەربارەی ئەوان ئەم صیفەتە دابەزی.**

**بڕوانە [تفسير الطبري : 8/461-462]**

ووتم: ئیمام أحمد لە مسند ڕیوایەتی کردووە لە عبیدالله عن ابن عباس.

**بڕوانە [مسند أحمد : ژمارە 2212]**

ووتەی دووەم: ئەوانەی دەڵێن: الکافرون مەبەست پێی ئەهلی ئیسلامە، الظالمون مەبەست پێی یەهودە، الفاسقون مەبەست پێی نەصارایە:

**الشعبي** دەڵێ:

(الكافرون) دەربارەی موسڵمانان دابەزیوە، (الظالمون) دەربارەی یەهود دابەزیوە، (الفاسقون) دەربارەی نەصارا دابەزیوە.

بڕوانە [تفسير الطبري : 8/462-463]

ووتەی سێیەم: ئەوانەی دەڵێن: مەبەست پێی کوفری بچووک و زوڵمی بچووک و فسقی بچووکە:

## عطاء بن أبي رباح:

دەربارەی فەرمایشتی الله: ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَٰفِرُونَ﴾ ، ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ﴾ ، ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ﴾ **دەڵێ: كفر دون كفر، وفسق دون فسق، وظلم دون ظلم.**

بڕوانە [تفسير الطبري : 8/464]

## طاوس دەڵێ:

﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَٰفِرُونَ﴾ **کوفرێک نیە لە دین دەرخەر بێت.**

بڕوانە [تفسير الطبري : 8/465]

## ابن عباس دەڵێ:

﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَٰفِرُونَ﴾ **ئەمە کوفرە، بەڵام کافر بوون نیە بە الله و فریشتەکانی وکتێبەکانی و پێغەمبەرەکانی.**

بڕوانە [تفسير الطبري : 8/465]

## ابن عباس:

پیاوێک پرسیاری لێکرد دەربارەی ئەم ئایەتانە: ﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ﴾ ووتی: ئەوەی وابکات ئەوا کافر بووە ؟ **ابن عباس ووتی: گەر وابکات ئەوا کوفری کردووە، بەڵام وەک ئەو کوفرە نیە کە کافر بێت بە الله و بە ڕۆژی دوایی و بە ئەمە و بە ئەوە.**

**بڕوانە [تفسير الطبري : 465/8]**

## ابن طاوس:

پرسیار لە ابن عباس کرا دەربارەی فەرمایشتی الله: ﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾ **ابن عباس ووتی: ئەمە کوفرە.**

**ابن طاوس دەڵێ: وەک ئەو کوفرە نیە کە کافر بێت بە الله و فریشتەکانی و کتێبەکانی و پێغەمبەرانی.**

**بڕوانە [تفسير الطبري : 466/8]**

## طاوس دەڵێ:

﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾ **کوفرێک نیە لە دین دەرخەر بێت.**

**بڕوانە [تفسير الطبري : 466/8]**

ووتەی چوارەم: ئەوانەی دەڵێن: ئەم ئایەتانە دەربارەی ئەهلی کیتاب دابەزین، وە مەبەست پێی هەموو خەڵکیە بە موسڵمان و کافرەوە:

**إبراهيم النخعي** دەڵێ:

ئەم ئایەتانە دەربارەی بەنی ئیسرائیل دابەزین، وە بۆ ئەم ئوممەتەش پێی ڕازی بووە.

**بڕوانە [تفسير الطبري : 466/8]**

**الحسن البصري** دەڵێ:

﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَٰفِرُونَ﴾ دەربارەی یەهود دابەزی، وە لەسەر ئێمەش واجبە.

**بڕوانە [تفسير الطبري : 467/8]**

**السدي** دەڵێ:

﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ﴾ الله دەفەرمووێ: ئەوەی حوکم نەکات بەوەی کە دامبەزاندووە، بە ئەنقەست تەرکی بکات و بە زوڵم لێی لا بدات و بشزانێ حوکمی الله کامەیە، ئەوا ئەم کەسە لە کافرانە.

**بڕوانە [تفسير الطبري : 467/8]**

ووتم: هێنانی ووتەکەی السدي لەلایەن الطبري لە چوار چێوەی ووتەی ئەوانەی کە دەڵێن: (ئایەتەکە دەربارەی ئەهلی کیتاب دابەزیوە، بەڵام هەموو خەڵکیش دەگرێتەوە بە موسڵمان و کافرەوە)، مانای ئەوە دەدات کە الطبري بەم جۆرە لە ووتەکەی السدي تێگەیشتووە گەر موسڵمانانیش هەمان کاری ئەهلی کیتاب بکەن لە گۆڕینی حوکمی الله و ئینکار کردنی ئەوا هەمان حوکم دەیانگرێتەوە، نەک بە ڕووکەش ووتەکەی وەرگرتبێ ئەوەی حوکم نەکات بە قورئان کافرە.

ووتەی پێنجەم: ئەوانەی دەڵێن: ئەوەی حوکم بەوە نەکات کە الله دایبەزاندووە وەک ئینکار کردن لێی ئەوا کافرە، زوڵم و فسقەکەش بۆ ئەو کەسەیە کە دان دەنێت بە حوکمی الله:

**ابن عباس** دەڵێ:

﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَٰفِرُونَ﴾ هەر کەسێک ئینکاری ئەوە بکات کە الله دایبەزاندووە ئەوا کافر بووە، وە ئەوەی دانی پێ بنێت بەڵام حوکمی پێ نەکات ئەوا زاڵم و فاسقە.

**بڕوانە [تفسير الطبري : 8/467-468]**

الطبري پێنج ووتەی لە سەلەف نەقل کرد دەربارەی ئەم سێ ئایەتە، بەڵام دوای تێڕامان و وورد بوونەوە دەردەکەوێ ئەم پێنج ووتەیە دژی یەکتر نین و یەک دەگرنەوە، لە جۆری خیلافی تنوع-ە نەک خیلافی تضاد، کە ئەم جۆرە خیلافەش زۆرە لەنێوان سەلەفدا لە تەفسیر، ڕوونکردنەوەی ئەمەش بەم جۆرەیە:

یەکەم/ ئەوانەی ووتیان: کوفرەکە دەربارەی یەهود دابەزی کە حوکمی الله-یان گۆڕی.
دووەم/ ئەوانەی ووتیان: کوفرەکە بۆ موسڵمانانە و زوڵمەکە بۆ یەهودە و فسقەکە بۆ نەصارایە، کە ئەمەش ووتەی الشعبي بوو بە تەنها.
سێیەم/ ئەوانەی ووتیان: کوفری بچووک و زوڵمی بچووک و فسقی بچووکە.
چوارەم/ ئەوانەی ووتیان: ئایەتەکان دەربارەی ئەهلی کیتاب دابەزیون، بەڵام ئەوەی هەمان کاری ئەوان بکات هەمان حوکم دەیگرێتەوە جا موسڵمان بێت یان کافر.
پێنجەم/ ئەوانەی ووتیان: کوفرەکە بۆ ئەو کەسەیە کە ئینکاری حوکمی الله دەکات، زوڵم و فسقەکەش بۆ ئەو کەسەیە کە دان دەنێت بە حوکمی الله بەڵام کاری پێ ناکات.

خاوەنانی ئەم پێنج ووتەیە بە قەدەر تاڵە مووێکیش لە دابەزاندنی حوکم بەسەر کەسەکان خیلافیان نیە، تەنها خیلافەکەیان ئەوەیە دەربارەی کێ ئایەتەکان دابەزیون، ئەگینا لە دابەزاندنی حوکم بەسەر کەسەکان خیلافەکەیان لە جۆری تنوع-ە.

ووتەی یەکەمیان کە دەڵێ: کوفرەکە بۆ یەهودە کە حوکمی اللە-یان گۆڕی.
هیچ کام لە خاوەنانی ووتەکانی تر دژی ئەم حوکمە نین، ئەگەرچی لە سەبەب نزولەکە خیلافیشیان هەبێت بەڵام کۆکن لەسەر ئەوەی هەر کەسێک حوکمی الله بگۆڕێت کافرە.

ووتەی دووەمیان کە دەڵێ: کوفرەکە بۆ موسڵمانانە و زوڵمەکە بۆ یەهودە و فسقەکە بۆ نەصارایە، کە الشعبي خاوەنی ئەم ووتەیە جگە لەو هیچ یەکێکی تر لە سەلەف بەم جۆرە باسی هۆکاری دابەزینەکەی نەکردووە، وە فەرموودەش هەیە کە هۆکاری دابەزینی هەر سێ ئایەتەکە کافرانن واتا ئەهلی کیتاب، بەڵام سەرەڕای ئەمەش الشعبي خیلافی لەوە نیە کە موسڵمان کاتێک کافر دەبێت کە حوکمی الله بگۆڕێت یان ئینکاری بکات کە ئەمەش ئیجماعی سەلەفە.

ووتەی سێیەمیان کە دەڵێ: کوفری بچووک و زوڵمی بچووک و فسقی بچووکە، ڕوونیان کردۆتەوە کە تەنها بە حوکم نەکردن دەبێتە کوفر و زوڵم و فسقی بچووک بەو مەرجەی سوکایەتی کردن و گاڵتە کردن و ئینکاری کردن و گۆڕینی حوکمی اللە-ی تێدا نەبێت، هەموو خاوەنی ووتەکانی تریش هاوڕای ئەم ووتەیەن.

ووتەی چوارەمیان کە دەڵێ: دەربارەی ئەهلی کیتاب دابەزیوە، بەڵام هەر کەسێک هەمان کاری ئەوان بکات هەمان حوکم دەیگرێتەوە جا موسڵمان بێت یان کافر.
ئەمەش هەمووان هاوڕان کە ئەگەر گۆڕینی حوکمی الله لەلایەن یەهودەوە کوفر بێت، ئەوا گۆڕینی حوکمی الله لەلایەن موسڵمانان یان ئەهلی هەر دینێکی تر بێت ئەوا هەر کوفرە.

ووتەی پێنجەمیان کە دەڵێ: کوفرەکە بۆ ئەو کەسەیە کە ئینکاری حوکمی الله دەکات، زوڵم و فسقەکەش بۆ ئەو کەسەیە کە دان دەنێت بە حوکمی الله بەڵام کاری پێ ناکات.
هەموو سەلەفیش لەسەر ئەم حوکمە کۆکن کە بە مەرجی ئینکاری کردن دەبێتە کوفر نەک تەنها بە حوکم نەکردن.

جا دەرکەوت خیلافەکە خیلافێکی تنوع-ە لە حوکمدا، حوکمەکانیان لە بنەڕەتدا وەک یەکە و هیچ دژیەک بوونێکی تێدا نیە کە نەتوانرێ جەمع بکرێت، کە الطبري-ش لە کۆتاییدا دەڵێ: ووتەی یەکەم بە صەواب دەزانم کە وتوویانە: دەربارەی یەهود دابەزی کە حوکمی الله-یان گۆڕی بوو، ئەمە تەرجیح کردنی هۆکاری دابەزینەکەیە نەک حوکمەکە، چونکە هیچ کام لەم حوکمانە دژی ئەوی تر نیە تا دانەیەکیان تەرجیح بکات بەسەر ئەوانی تر، وە تەرجیحەکەشی بۆ ووتەی یەکەم لە ڕووی سەبەب نزولەوە کارێکی دروستە، چونکە هەم فەرموودەی صەحیحی لەسەر هاتووە، هەم زۆرینەی زانایان لەسەر ئەمەن کە دەربارەی یەهود دابەزیوە، وە هەم سیاقی ئایەتەکەش دەربارەی یەهود و حوکمی تەوراتە، هەروەها ئایەتەکانی پێشتر و دواتری هەر دەربارەی یەهودە، کە الطبري بەم هۆیەوە ووتەی یەکەمی بە صەواب زانیوە دەربارەی سەبەب نزولەکە.

**الطبري** لە تەفسیری ئایەتی: ﴿وَكَتَبۡنَا عَلَيۡهِمۡ فِيهَآ أَنَّ ٱلنَّفۡسَ بِٱلنَّفۡسِ وَٱلۡعَيۡنَ بِٱلۡعَيۡنِ وَٱلۡأَنفَ بِٱلۡأَنفِ وَٱلۡأُذُنَ بِٱلۡأُذُنِ وَٱلسِّنَّ بِٱلسِّنِّ وَٱلۡجُرُوحَ قِصَاصٞۚ﴾ دەڵێ:
ئەمە هەواڵ پێدانی الله تعالى ذکره بۆ پێغەمبەرەکەیەتی محمد ﷺ دەربارەی یەهود، وە دڵدانەوەیەتی بۆ پێغەمبەرەکەی لە کافر بوونی ئەو کەسانەی دوای دان پێدانان بە پێغەمبەرایەتی ئەو کافر بوون، وە پشتیان لێی کرد دوای ڕوو تێکردنی، وە ناساندنی

جورئەتی ئەوان بوو بەرامبەر بە پەروەردگاریان و پێغەمبەرانی لە کۆن و ئێستادا، **وە دەست درێژ کردنیان بۆ کتێبی الله بە تەحریف کردنی و گۆڕینی.**

**[تفسير الطبري : 469/8]**

**الطبري** دەڵێ:

حدثنا القاسم قال حدثنا الحسين قال حدثني حجاج عن **ابن جريج ووتی:**

کاتێک بەنی قریظة بینیان پێغەمبەر ﷺ حوکمی کرد بە ڕەجم لە کاتێکدا ئەوان **دەیانشاردەوە لە کتێبەکانیان**، هەڵسانەوە ووتیان: ئەی محمد حوکم بکە لەنێوان ئێمە و براکانمان لە بەنی النضیر، لەنێوانیان کێشەی خوێن هەبوو پێش هاتنی پێغەمبەر ﷺ بۆ مەدینە، بەنی النضیر زاڵ بوون بەسەر بەنی قریظة، حەقی خوێنیان بە قەدەر نیوەی حەقی خوێنی بەنی النضیر بوو، حەقی خوێنی بەنی النضیر 140 وەسق خورما بوو، وە حەقی خوێنی بەنی قریظة 70 وەسق خورما بوو، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: خوێنی بەنی قریظة یەکسانە بە خوێنی بەنی النضیر ، جا بەنی النضیر توڕە بوون، ووتیان: گوێڕایەڵیت ناکەین لە ڕەجم، بەڵکو لەسەر ئەو حەددانە دەڕۆین کە پێشتر لەسەری بووین، جا ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿أَفَحُكۡمَ ٱلۡجَٰهِلِيَّةِ يَبۡغُونَۚ﴾ **[المائدة: ٥٠]**، وە ئەم ئایەتەش دابەزی: ﴿وَكَتَبۡنَا عَلَيۡهِمۡ فِيهَآ أَنَّ ٱلنَّفۡسَ بِٱلنَّفۡسِ﴾ **[المائدة: ٤٥]**، تا کۆتایی ئایەتەکە.

**[تفسير الطبري : 8/469-470]**

**آدم بن أبي إياس** دەڵێ:

﴿أَفَحُكۡمَ ٱلۡجَٰهِلِيَّةِ يَبۡغُونَۚ﴾ [المائدة: ٥٠]

حدثنا ورقاء عن ابن أبي نجيح عن **مجاهد ووتی:**

**واتا یەهود.**

**[تفسير مجاهد : لاپەرە 310]**

ووتم: مەبەستی ئەوەیە ئایەتەکە دەربارەی یەهود دابەزیوە، واتا ئەی یەهود حوکمی جاهیلیتان دەوێ ؟ تۆڵە لە هەندێک بکوژ بکەنەوە، وە هەندێکی نەکوژنەوە حەقی خوێنەکەی لێوەربگرن، لە کاتێکدا الله خوێنی هەموو کوژراوەکانی یەکسان کردووە.

**ابن أبي حاتم** دەڵێ:

أخبرنا يونس بن عبدالأعلى -قراءة- حدثنا سفيان بن عيينة عن ابن أبي نجيح ووتی:

گەر کەسێک پرسیاری لە طاوس کردبوایە، بی ووتایە: هەندێک دار خورما تایبەت دەبەخشم بە یەکێک لە منداڵەکانم، طاوس ئەم ئایەتەی دەخوێند: ﴿أَفَحُكۡمَ ٱلۡجَٰهِلِيَّةِ يَبۡغُونَۚ وَمَنۡ أَحۡسَنُ مِنَ ٱللَّهِ حُكۡمٗا لِّقَوۡمٖ يُوقِنُونَ﴾ **[المائدة: ٥٠].**

**[تفسير ابن أبي حاتم : 135/5]**

ووتم: بڕوانە دەربارەی کردەوەی کەسێکی ئاسایی ئەم ئایەتە دەهێنێتەوە، واتا ئایەتەکانی حوکم بۆ هەموو خەڵکیە، نەک وەک هەندێک کەس وادەزانن ئەم ئایەتانە تایبەتە بە حاکمەکان خەڵکی ئاسایی ناگرێتەوە، تۆش کە حوکمێکی ئەم قورئانە جێبەجێ ناکەیت ئەوا حوکمت نەکردووە بە قورئان، کە زوڵم و خیانەت و دزی و فێڵ و هەر تاوانێکی تر ئەنجام دەدەیت ئەوا حوکمت نەکردووە بە قورئان.

**ابن أبي حاتم** دەڵێ:

﴿أَفَحُكۡمَ ٱلۡجَٰهِلِيَّةِ يَبۡغُونَۚ﴾ [المائدة: ٥٠]

حدثني أبي حدثنا هلال بن الفياض حدثنا أبو عبيدة الناجي ووتی:

بیستم الحسن دەیووت: هەر کەسێک حوکم بکات بە غەیری حوکمی الله، ئەوا حوکمی جاهیلیە.

[تفسير ابن أبي حاتم : 135/5]

**الطبري** لە تەفسیری ئایەتی: ﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ﴾ دەڵێ:

الله تعالى ذكره دەفەرمووێ: هەر کەسێک حوکم بەوە نەکات کە الله دایبەزاندووە لە تەورات لە تۆڵە کردنەوە لە کەسی بکوژ بەرامبەر کەسی کوژراو بە زوڵم، وە چاوی ئەو کەسە دەرنەهێنرێ کە چاوی کەسێکی بە زوڵم دەرهێناوە، وەک تۆڵە کردنەوە کە الله فرمانی پێکردووە لە کتێبەکەی، بەڵام تۆڵە لە هەندێک بکاتەوە و تۆڵە لە هەندێکی نەکاتەوە، یان بەرامبەر کوژرانی کەسێک دوو کەس بکوژێ، **هەر کەسێک ئەم کارانە بکات ئەوا لە زاڵمانە. واتا: لەو کەسانەیە کە لایداوە لە حوکمی الله، وە کارەکەی خۆی لە شوێنێک داناوە ئەو شوێنە نیە کە الله بۆی داناوە.**

[تفسير الطبري : 482/8]

ووتم: واتا حوکم کردن بە غەیری شەرعی الله تاوان و زوڵمە لە ئەصلدا، گەر الطبري (الظالمون) لێرەدا بە کوفر بزانێت ئەوا بە کوفر تەفسیری دەکرد وەک هەر موفەسیرێکی تر کاتێک (الظالمون) و (الفاسقون) بە کوفری گەورە دەزانن ئەوا ئاماژەی پێدەدەن کە لەم دوو ئایەتەدا (الظالمون) و (الفاسقون) واتا الكافرون، بەڵام الطبري هەر بە زوڵم تەفسیری کرد

واتا تاوانە، بەڵام کاتێک (الكافرون)ی بە کوفری گەورە تەفسیر کرد بەندی کرد بە ئینکاری کردنی حوکمی الله، هەروەک چۆن ئەوانەی (الظالمون) و (الفاسقون) بە الكافرون تەفسیر دەکەن بەندی دەکەنەوە بە ئینکاری کردنی حوکمی الله.

**الطبري** لە تەفسیری ئایەتی: ﴿وَلۡيَحۡكُمۡ أَهۡلُ ٱلۡإِنجِيلِ بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فِيهِۚ وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ﴾ گەر بە (وَلِيَحۡكُمۡ) بخوێندرێتەوە دەڵێ:

ئینجیلمان دا بە عیسی ابن مریم کە هیدایەت و نوری تێدایە، وە پشت ڕاستکەرەوەی کتێبی پێش خۆیەتی کە تەوراتە، وە هیدایەت و ئامۆژگارییە بۆ تەقواداران، بۆ ئەوەی ئەهلی ئینجیل حوکم بکەن بەوەی کە الله دایبەزاندووە لە ئینجیل، **جا حوکمی الله-یان گۆڕی و موخالەفەیان کرد**، جا گومڕا بوون بەم موخالەفە کردنەیان کە حوکمیان نەکرد بەوەی الله دایبەزاندووە لە ئینجیل و موخالەفەیان کرد، ﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ﴾ واتا: دەرچوون لە فرمانی الله لە ئینجیلدا، موخالەفەی الله-یان کرد لەو شتانەی فرمانی پێکردن و نەهی لێکردن لە کتێبەکەی.

[تفسير الطبري : 484/8]

**یحیى بن سلام** دەڵێ:

﴿وَلَا تَشۡتَرُواْ بِـَٔايَٰتِي ثَمَنٗا قَلِيلٗاۚ وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾

**الحسن دەڵێ: هەرکەسێک ئەوەی الله دایبەزاندووە بە دینی دانەنێت و دانی پێ نەنێت، ئەوا ئەمانە کافرن** ﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾.

[مختصر تفسير يحيى بن سلام لابن أبي زمنين : 30/2]

ووتم: لە مختصرى هود بن محكم الهواري بەم جۆرە هاتووە: (ئەوا كافر و زاڵم و فاسقە).

**يحيى بن سلام** دەڵێ:

﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ﴾ فسق لێرەدا: شیركە.

[مختصر تفسير يحيى بن سلام لابن أبي زمنين : 31/2]

**مقاتل بن سليمان** دەڵێ:

﴿فَلَا تَخْشَوُاْ ٱلنَّاسَ وَٱخْشَوْنِ وَلَا تَشْتَرُواْ بِـَٔايَٰتِي ثَمَنًا قَلِيلًاۚ وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَٰفِرُونَ﴾ دەڵێ:

﴿فَلَا تَخْشَوُاْ ٱلنَّاسَ﴾ الله بە يەهودی مەدینە دەفەرمووێ: لە يەهودی خەیبەر مەترسن لەوەی کە هەواڵیان پێ بدەن دەربارەی **حوكمی ڕەجم و وەصفی محمد** ﷺ، ﴿وَٱخْشَوْنِ﴾لە من بترسن **گەر شاردتانەوە**، ﴿وَلَا تَشْتَرُواْ بِـَٔايَٰتِي ثَمَنًا قَلِيلًاۚ﴾ ئایەتەکانم مەگۆڕنەوە بە سامانێکی کەم کە لە هیچ و پوچەکانی یەهود دەستان دەکەوێ لە خواردن و بەروبوومی کشتوکاڵی، ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ﴾ **هەر کەسێک حوکم بەوە نەکات کە الله دایبەزاندووە لە تەوراتدا لە ڕەجم کردن و وەصفی محمد** ﷺ **و شایەتی دان پێی، ئا ئەوانە کافرن** ﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَٰفِرُونَ﴾.

[تفسير مقاتل بن سليمان : 479/1]

**سعيد بن منصور** دەڵێ:

حدثنا عبدالرحمن بن أبي الزناد عن أبيه عن عبيدالله بن عبدالله عن **ابن عباس ووتی:**

الله عزوجل ئایەتەكانی:﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾ و ﴿ٱلظَّٰلِمُونَ﴾ و ﴿ٱلۡفَٰسِقُونَ﴾ **تایبەت دەربارەی یەهود دایبەزاند.**

**[سنن سعيد بن منصور : ژمارە 750]**

**حكيم بن جبير** دەڵێ:

پرسیارم لە سعيد بن جبير كرد دەربارەی ئەم ئایەتانەی سورەتی المائدة: ﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾ ، ﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ﴾ ، ﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ﴾ ووتم: كەسانێک پێیان وایە ئەم ئایەتانە لەسەر بەنی ئیسرائیل دابەزیون لەسەر ئێمە دانەبەزیون، ووتی: ئایەتی پێشی و ئایەتی دواتری بخوێنەوە، منیش خوێندمەوە، ووتی: نەخێر، بەڵكو لەسەر ئێمە دابەزیوە، پاشان گەیشتم بە مقسم مولى ابن عباس، پرسیارم لێی كرد دەربارەی ئەم ئایەتانەی سورەتی المائدة، ووتم: كەسانێک پێیان وایە ئەم ئایەتانە لەسەر بەنی ئیسرائیل دابەزیون لەسەر ئێمە دانەبەزیون، ووتی: لەسەر بەنی ئیسرائیل و لەسەر ئێمەش دابەزیون، هەر ئایەتێكیش لەسەر ئێمە و ئەوان دابەزی بێت ئەوا بۆ ئێمە و بۆ ئەوانە، پاشان چوومە لای علي بن الحسين، پرسیارم لێی كرد دەربارەی ئەم ئایەتانەی سورەتی المائدة، وە پێم ووت پرسیارم لە سعيد بن جبير و مقسم كردووە دەربارەی ئەم ئایەتانە، ووتی: مقسم چی پێ ووتی ؟ منیش ئەوەم پێ ڕاگەیاند كە ووتی، **علي ووتی: ڕاستی كرد، بەڵام كوفرە نەک وەک كوفری شیرک، فسقە نەک وەک فسقی شیرک، زوڵمە نەک وەک زوڵمی شیرک.** گەیشتم بە سعيد بن جبير ئەوەم پێ ڕاگەیاند كە علي ووتی، سعيد بن جبير بە

کوڕەکەی ووت: چۆن دەیبینی ؟ من بینیم فەزلی هەیە بەسەر تۆ و من و مقسم.

**[السيوطي لە الدر المنثور داویەتیە پاڵ تەفسیری عبد بن حمید : 5/327-328]**

**أبو عبيد القاسم بن سلام** دەڵێ:

سەبارەت بەو ئەثەرانەی کە ڕیوایەت کراون بە باسکردنی کوفر و شیرک، وە هاتنەدی بە ئەنجامدانی تاوان، **مانەکەی لەلای ئێمە ئەوە نیە کە ئەهلەکەی کافر بن و موشریک بن و ئیمانی خاوەنەکەی نەهێڵن، بەڵکو مانای ئەوەیە کە ئەم شتانە لەو ئەخلاق و عادەتانەن کە کافران و موشریکان لەسەرینە،** ... (دوای هێنانی چەند نموونەیەک لەسەر کوفری بچووک و شیرکی بچووک لە قورئان و فەرموودە و ئاثاری هاوەڵان، پاشان دەڵێ) پێی ڕاگەیاندی کە لە تاوانەکان جۆری زۆر هەیە بەم ناوە ناونراوە (واتا: ناوی کوفر و شیرک) بەڵام ئەو شیرکە نیە کە لەگەڵ الله خوایەکی تر بپەرستێ، الله زۆر بەرز و پاکە لەوەی کە شەریکی هەبێت، **جا ئەم دەقانەی کە لەفزی کوفر و شیرکیان تێدایە هیچ مانەیەک لەخۆ ناگرێت لەلای ئێمە جگە لەوەی کە ئەمانە ئەخلاق و ناو لێنان و عادەت و لەفز و ئەحکامی موشریکەکانن، وە هاوشێوەی ئەم شتانە لە کاروباریان، وە بەڵگەش بۆ ئەمە لە قورئاندا فەرمایشتی الله جل وعز-ە:** ﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾ **ابن عباس** رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا **دەڵێ: کوفرێک نیە لە دین دەرخەر بێت، وە عطاء بن أبي رباح دەڵێ: كفر دون كفر، جا بۆمان ڕوون بوویەوە ئەم کوفرە لە دینی ئیسلام دەری ناکات، دینەکە لەسەر حاڵی خۆی دەمێنێتەوە ئەگەرچی تاوانیش تێکەڵی بێت، ئەم کوفرە هیچ مانەیەکی نیە جگە لەوەی کە ئەخلاق و عادەتی کافران وەک**

**ئەو شیرکە بچووکانەن کە بۆتم باس کرد، چونکە لە عادەتی کافرانە کە حوکم بکەن بە غەیری ئەوەی الله دایبەزاندووە، ئایا نەت بیستووە فەرمایشتی الله: ﴿أَفَحُكْمَ ٱلْجَٰهِلِيَّةِ يَبْغُونَ﴾ تەفسیرەکەی لەلای ئەهلی تەفسیر ئەوەیە: هەرکەسێک حوکم بکات بە غەیری ئەوەی کە الله دایبەزاندووە لە کاتێکدا ئەو کەسە لەسەر دینی ئیسلام بێت، ئەوا بەم حوکم نەکردنەی بە قورئان وەک ئەهلی جاهیلی وایە، چونکە ئەهلی جاهیلی بەم شێوەیە حوکم دەکەن، بەهەمان شێوە فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺ: (ثلاث من أمر الجاهلية: الطعن في الأنساب، والنياحة، والأنواء) واتا: سێ شت هەن لە کردەوەی جاهیلین: تانە دان لە ڕەچەڵەک، قیژاندن و هاوار کردن لەکاتی گریان بۆ مردوو، ئەوەی بڵێ باران بەهۆی دەرکەوتن و ئاوا بوونی ئەستێرەکان دەبارێت.**

**بڕوانە [الجامع في كتب الإيمان والرد على المرجئة لعادل / كتاب الإيمان لأبي عبيد : ژمارە 119-127]**

ووتم: ووتەکانی هێندە ڕوونن کە هیچ ڕوونکردنەوەیەکی ناوێت، تەنها لەسەر تۆیە کە بە هێمنی و ئاگاییەوە بیخوێنیتەوە بزانی باسی چی دەکات.

## أحمد بن حنبل دەڵێ:

حدثنا وكيع عن سفيان عن معمر عن ابن طاوس عن أبيه عن **ابن عباس** رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا :

﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَٰفِرُونَ﴾ **ووتی: ئەمە کوفرە، بەڵام وەک ئەوکەسە نیە کە کافرە بە الله و فریشتەکانی و کتێبەکانی و پێغەمبەرانی.**

**[الجامع في كتب الإيمان والرد على المرجئة لعادل / كتاب الإيمان لأحمد بن حنبل : ژمارە 252]**

**أحمد بن حنبل** دەڵێ:

حدثنا وكيع قال حدثنا سفيان عن ابن جريج عن **عطاء ووتی:**

**كفر دون كفر، وظلم دون ظلم، وفسق دون فسق.**

**[الجامع في كتب الإيمان والرد على المرجئة لعادل / كتاب الإيمان لأحمد بن حنبل : ژمارە 255]**

**أحمد بن حنبل** دەڵێ:

حدثنا سفيان بن عيينة عن هشام بن حجير عن طاوس ووتی: **ابن عباس ووتی:**

**ئەو كوفرە نیە كە ئێوە بۆی دەچن.**

**ئیمام أحمد دەڵێ: سفیان ووتی: واتا: كوفرێک نیە لە دین دەرخەر بێت.** ﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾.

**[الجامع في كتب الإيمان والرد على المرجئة لعادل / كتاب الإيمان لأحمد بن حنبل : ژمارە 257]**

ووتم: بڕوانە سەنەدەكە هشام بن حجير-ی تێدایە، كەچی سفیان خۆی لێی ڕیوایەت دەكات و شەرحیشی دەكات كە كوفری بچووكە، ئیمام أحمد-یش ئەم شەرحەی سفیان نەقل دەكات، كەسیشیان باسی زەعیفی هشام و مونكەری ئەم ئەثەرە ناكەن و ڕەتی ناكەنەوە، ئەمە لە كاتێكدا سەنەدی تری صەحیحمان هێناوە كە هشام بن حجير-ی تێدا نیە بیانوومان بڕیون، ئەم ووتانە وەک لێدانی فیشەكی زیادە وایە دوای كوشتنی كەسەكە.

**أحمد بن حنبل** دەڵێ:

حدثنا عبدالرزاق قال حدثنا معمر عن ابن طاوس عن أبيه ووتی:

پرسیار لە ابن عباس كرا رَضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُمَا دەربارەی فەرمایشتی الله: ﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ

﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَٰفِرُونَ﴾ **ووتی: ئەمە کوفرە.**

**ابن طاوس دەڵێ: وەک ئەو کەسە نیە کە کافر بێت بە الله و فریشتەکانی و کتێبەکانی پێغەمبەرانی.**

**[الجامع في كتب الإيمان والرد على المرجئة لعادل / كتاب الإيمان لأحمد بن حنبل : ژمارە 258]**

**ابن بطة** دەڵێ:

باب: (ذكر الذنوب التي تصير بصاحبها إلى كفر غير خارج به عن الملة)

واتا: باسکردنی ئەو تاوانانەی کە خاوەنەکەی توشی کوفرێک دەکات لە دین نایباتە دەرەوە.

**[الإبانة الكبرى : 430/1]**

ووتم: کەواتە مەبەستی کوفری بچووکە، با بزانین ئەم تاوانانە چین کە لەم بابەدا هێناویەتی.

**ابن بطة** دەڵێ:

حدثنا أبو شيبة قال حدثنا محمد بن إسماعيل قال حدثنا وكيع عن سفيان عن معمر عن ابن طاوس عن أبيه عن **ابن عباس:** ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَٰفِرُونَ﴾ **ووتی: ئەمە کوفرە، بەڵام وەک ئەو کەسە نیە کە کافرە بە الله و فریشتەکانی و کتێبەکانی و پێغەمبەرانی.**

**[الإبانة الكبرى : ژمارە 1072]**

**ابن بطة** دەڵێ:

حدثنا أبو شيبة قال حدثنا محمد بن إسماعيل قال حدثنا وكيع قال حدثنا سفيان عن سعيد المكي عن **طاوس:** ﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾ **ووتی: کوفرێک نیە لە دین دەرخەر بێت.**

**[الإبانة الكبرى : ژمارە 1073]**

**ابن بطة** دەڵێ:

حدثنا أبو شيبة قال حدثنا محمد بن إسماعيل قال حدثنا وكيع قال حدثنا سفيان عن ابن جريج عن **عطاء ووتی: كفر دون كفر، وظلم دون ظلم، وفسوق دون فسوق.**

**[الإبانة الكبرى : ژمارە 1074]**

**ابن بطة** دەڵێ:

حدثنا إسماعيل بن محمد الصفار قال حدثنا أحمد بن منصور الرمادي قال حدثنا عبدالرزاق قال حدثنا معمر عن ابن طاوس عن أبيه ووتی:

پرسیار لە ابن عباس کرا دەربارەی فەرمایشتی الله تعالى: ﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾ **ووتی: ئەمە کوفرە.**

**ابن طاوس ووتی: وەک ئەو کەسە نیە کە کافرە بە الله و فریشتەکانی و کتێبەکانی و پێغەمبەرانی.**

**[الإبانة الكبرى : ژمارە 1076]**

**ابن بطة** دەڵێ:

حدثنا أبو الحسين إسحاق بن أحمد الكاذي قال حدثنا عبدالله بن أحمد قال حدثني أبي قال حدثنا

سفيان بن عيينة عن هشام بن حجير عن طاوس ووتی: **ابن عباس ووتی:**

**ئەو کوفرە نیە کە ئێوە بۆی دەچن.**

**ئیمام أحمد دەڵێ: سفیان ووتی: واتا: کوفرێک نیە لە دین دەرخەر بێت.** ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَٰفِرُونَ﴾.

**[الإبانة الكبرى : ژمارە 1077]**

**ابن بطة** دەڵێ:

حدثنا إسحاق الكاذي قال حدثنا عبدالله بن أحمد قال حدثني أبي قال حدثنا عبدالرحمن قال حدثنا سفيان عن ابن جريج عن **عطاء ووتی:**

**كفر دون كفر، و ظلم دون ظلم، و فسوق دون فسوق.**

**[الإبانة الكبرى : ژمارە 1078]**

ووتم: هێنانی ئایەتی: ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَٰفِرُونَ﴾ لەلایەن ابن بطة لە ژێر بابی ئەو تاوانانەی کە لە دین دەرخەر نین، وە نەقل کردنی کۆمەڵێک ئاثاری سەلەف کە ووتیان کوفرەکە کوفری بچووکە، بەبێ ئەوەی هیچ ڕەخنەی لێ بگرێت و تەئویلی بکات و ڕەتی بکاتەوە، وە لە کتێبێکی ئاوا گەورە بیهێنێت کە عەقیدەی ئەهلی سوننەی تێدا هێناوە، وە هیچ کام لە زانایان بە درێژایی زیاتر لە هەزار ساڵ ڕەخنەیان لەم کارەی ابن بطة نەگرتووە، ئیتر شەرم لە خۆت ناکەیت کە دەڵێی: ئەوەی بڵێ کوفری بچووکە مورجیئەیە ؟ یان دەڵێی: زەعیفە بە صەحیحی نەهاتووە و ڕەتی دەکەمەوە ؟!

**إسماعيل بن سعيد الشالنجي** دەڵێ:

پرسیارم لە أحمد بن حنبل کرد دەربارەی کەسێک سوورە لەسەر تاوانە گەورەکان و بەو پەڕی کۆششەوە ئەنجامی دەدات، بەڵام نوێژ و زەکات و ڕۆژووی تەرک نەکردووە، ئایا ئەم کەسە (مُصِرَّ) کە ئەمە حاڵیەتی ؟
ووتی: ئەمە (مُصِرَّ) وەک فەرموودەی: (لا یزنی حین یزنی وهو مؤمن)، لە ئیمان دەردەچێت و دەچێتە ناو ئیسلام، وە هاوشێوەی فەرموودەی: (لا یشرب الخمر حین یشربها وهو مؤمن، ولا یسرق حین یسرق وهو مؤمن)، **وە هاوشێوەی ووتەی ابن عباس دەربارەی فەرمایشتی الله:** ﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾.
**الشالنجي دەڵێ: پێم ووت: ئەمە چ کوفرێکە ؟**
**ووتی: کوفرێکە لە دین دەرخەر نیە، هەروەک ئیمان هەندێکی پلەی نزمترە لە هەندێکی، کوفریش بە هەمان شێوە، تاکو کوفرێکی ڕوون دێت هیچ خیلافی تێدا نیە.**

**بڕوانە [مسائل الإمام أحمد روایة الشالنجي : لاپەرە 78-79]**

ووتم: (مُصِر) ئەو کەسەیە کە سوورە لەسەر تاوان و بەردەوام ئەنجامی دەدات بەبێ تەوبە کردن لێی، کە ئیمام أحمد شوبهاندوویەتی بە حاڵی ئەو کەسەی کە لە فەرموودەکان هاتووە، ئەوەی زینا دەکات لە کاتی زینادا ئیمانی نیە، ئەوەی عەرەق دەخواتەوە لە کاتی خواردنەوەی ئیمانی نیە، ئەوەی دزی دەکات لە کاتی دزی کردنی ئیمانی نیە، ئەوەی حوکم بە قورئان نەکات کافرە، هەموو ئەمانە لەلای ئەهلی سوننە بەو مانایە دێت کە لە پلەی ئیمان دێتە دەرەوە بۆ پلەی ئیسلام، نەک بەو مانایەی کە لە دین دەربچێت، تەنانەت کاتێک الشالنجي لێی دەپرسێ ئەو کوفرەی لە ئایەتەکە هاتووە چ کوفرێکە ؟ ئیمام أحمد دووپاتی دەکاتەوە کە کوفری بچووکە، وە بەڵگە بە ئەثەرەکەی ابن عباس دەهێنێتەوە کفر دون کفر.

وە هەر یەک لە محمد بن نصر المروزي ابن تيمية و ابن القيم و ابن رجب و محمد بن عبدالوهاب ئەم پرسیار و وەڵامەی الشالنجي و ئیمام أحمد-یان نەقل کردووە کەسیشیان ڕەتی نەکردۆتەوە بەڵکو وەک بەڵگە پێ هێنانەوە نەقلیان کردووە.

**ابن هانئ** دەڵێ:

پرسیارم لە أحمد کرد دەربارەی ووتەکەی طاوس کە دەڵێ: **کوفرێکی لە دین دەرخەر نیە ؟ أبو عبدالله ووتی: ئەم ووتەیە دەربارەی ئەم ئایەتەیە:** ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَٰفِرُونَ﴾ **[المائدة: ٤٤].**

**[مسائل الإمام أحمد رواية ابن هانئ : 192/2]**

ووتم: (أبو عبدالله) واتا: ئیمام أحمد.

**أبو داود** دەڵێ:

بیستم أحمد باسی فەرمایشتی الله: ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَٰفِرُونَ﴾ کرد.

**[مسائل الإمام أحمد رواية أبي داود : ژمارە 1355]**

ووتم: ئەم ووتەیە کردنەوەی بابەتەکەیە، ئینجا دواتر ئیمام أحمد ئەثەرەکان ڕیوایەت دەکات دەربارەی ئەم ئایەتە، کە أبو داود-یش لە ئیمام أحمد-ەوە ڕیوایەتی دەکات هەروەک ئێستا دەیهێنین.

**أبو داود** دەڵێ:

حدثنا أحمد قال حدثنا وكيع قال حدثنا سفيان عن سعيد المكي عن **طاوس ووتی:**

**کوفرێک نیە لە دین دەرخەر بێت.**

**[مسائل الإمام أحمد رواية أبي داود : ژمارە 1356]**

**أبو داود** دەڵێ:

حدثنا أحمد قال حدثنا وكيع عن سفيان عن ابن جريج عن **عطاء ووتی:**

**كفر دون كفر، ظلم دون ظلم، فسق دون فسق.**

**[مسائل الإمام أحمد رواية أبي داود : ژمارە 1357]**

ووتم: بڕوانە ئیمام أحمد لە مەجلیس دانیشتووە باسی ئایەتەکە دەکات و ئەو ئەثەرانەی سەلەف نەقل دەکات کە وتوویانە کوفری بچووکە، نە خۆی ڕەخنە لە سەنەدەکانی دەگرێت، نە دەڵێ ئەمە مدرج-ە ووتەی ابن طاوس تێکەڵ کراوە بە ووتەی ابن عباس، نە دەڵێ ئەمە بۆ جارێک و دووانە، نە یەک قوتابی ئیمام أحمد-یش ئەم ئەثەرانەیان بەلاوە قورس دەبێت وەک ئێوە، بڵێن چۆن وادەڵێ ئەمە ووتەی مورجیئەیە، ئەمە زەعیفە، ئەمە ئاوایە و... هتد، لەلای سەلەف ووتەی باو و ناسراو ئەمە بووە کە حوکم نەکردن بە قورئان کفر دون کفر-ە، بەڵام ئەمڕۆ لەلای ئێوە کە دوورن لە مەنهەجی سەلەف ووتەی باو و ناسراو ئەوەیە کە حوکم نەکردن بە قورئان کوفری گەورەیە، ئەوەی بڵێ کفر دون کفر مورجیئەیە !!!

**محمد بن نصر المروزي** (ووتەی هەندێک لە ئەهلی سوننە نەقل دەکات) دەڵێ:

ووتیان: ئێمە ووتمان: نەبوونی بڕوا بە الله کوفرە بە الله، وە واز هێنان لە فەرزەکان لەگەڵ هەبوونی بڕوا بە الله کە فەرزەکانی واجب کردووە، ئەمەش کوفرە بەڵام کوفر نیە بە الله، بەڵکو کوفرە لەو لایەنەوە کە تەرکی حەقی کردووە هەروەک چۆن کەسێک

دەڵێ: کافر بووی بە حەق و بە نیعمەتم، مەبەستی ئەوەیە: حەقت بە فیرۆ دام و سوپاس کردنی نیعمەتی منت فەرامۆش کرد.

**وە ووتیان: لەم ووتەیەشدا پێشەنگمان ئەو هاوەڵانەی پێغەمبەری الله ﷺ و تابعینە کە ڕیوایەت کراوە لێیانەوە فەرعیان بۆ کوفر داناوە جگە لە ئەصلەکەی، کە فەرعەکەی خاوەنەکەی لە دینی ئیسلام ناخاتە دەرەوە، هەروەک چۆن بۆ ئیمان لەلایەنی عەمەلەوە فەرعیان بۆی جێگیر کردووە جگە لە ئەصلەکەی، کە واز هێنان لەم فەرعە لە دینی ئیسلام نایخاتە دەرەوە، نموونەش لەمە: ووتەکەی ابن عباس-ە دەربارەی فەرمایشتی الله:**

﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾.

**[تعظيم قدر الصلاة : 520/2]**

**محمد بن نصر المروزي** دەڵێ:

حدثنا يحيى بن يحيى حدثنا سفيان بن عيينة عن هشام بن حجير عن طاوس عن **ابن عباس:**

﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾ **ووتی: ئەو کوفرە نیە کە ئەوان بۆی دەچن.**

**[تعظيم قدر الصلاة : ژمارە 569]**

**محمد بن نصر المروزي** دەڵێ:

حدثنا محمد بن رافع و محمد بن يحيى قالا حدثنا عبدالرزاق أخبرنا معمر عن ابن طاوس عن أبيه ووتی: پرسیار لە ابن عباس کرا دەربارەی فەرمایشتی الله: ﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ

فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾ [المائدة: ٤٤]، **ووتی: ئەمە کوفرە.**

**ابن طاوس ووتی: وەک ئەو کەسە نیە کە کافرە بە الله و فریشتەکانی و کتێبەکانی و پێغەمبەرانی.**

[تعظيم قدر الصلاة : ژمارە 570]

**محمد بن نصر المروزي** دەڵێ:

حدثنا إسحاق أخبرنا وكيع عن سفيان عن معمر عن ابن طاوس عن أبيه عن **ابن عباس ووتی:**

**ئەمە کوفرە، بەڵام وەک ئەو کەسە نیە کە کافرە بە الله و فریشتەکانی و کتێبەکانی و پێغەمبەرانی.**

[تعظيم قدر الصلاة : ژمارە 571]

**محمد بن نصر المروزي** دەڵێ:

حدثنا إسحاق أخبرنا وكيع عن سفيان عن معمر عن ابن طاوس عن أبيه ووتی:

**بە ابن عباس-م ووت: ئەوەی حوکم بە قورئان نەکات کافرە ؟ ووتی: ئەمە کوفرە، بەڵام وەک ئەو کەسە نیە کە کافرە بە الله و فریشتەکانی و کتێبەکانی و پێغەمبەرانی و ڕۆژی دوایی.**

[تعظيم قدر الصلاة : ژمارە 572]

**محمد بن نصر المروزي** دەڵێ:

حدثنا محمد بن يحيى حدثنا عبدالرزاق عن سفيان عن رجل عن طاوس عن **ابن عباس ووتی:**

**کوفرێک نیە لە دین دەرخەر بێت.**

[تعظيم قدر الصلاة : ژمارە 573]

**محمد بن نصر المروزي** دەڵێ:

حدثنا إسحاق أخبرنا وكيع عن سفيان عن سعيد المكي عن **طاوس ووتی:**

**کوفرێک نیە لە دین دەرخەر بێت.**

[تعظيم قدر الصلاة : ژمارە 574]

**محمد بن نصر المروزي** دەڵێ:

حدثنا إسحاق أخبرنا وكيع عن سفيان عن ابن جريج عن **عطاء ووتی:**

**كفر دون كفر، وظلم دون ظلم، وفسق دون فسق.**

محمد بن نصر المروزي دەڵێ: **ووتیان: عطاء ڕاستی کرد**، کافر پێی دەووترێ: زاڵم، وە کەسی تاوانبار لە موسڵمانان پێی دەووترێ: زاڵم، جا زوڵمێک لە دینی ئیسلام دەیخاتە دەرەوە، وە زوڵمێک نایخاتە دەرەوە.

[تعظيم قدر الصلاة : ژمارە 575]

ووتم: ئەهلی سوننە نەیان ووت ئەمە ووتەی مورجیئەیە، بەڵکو ووتیان: عطاء ڕاستی کرد.

**وكيع القاضي** دەڵێ:

أخبرنا محمد بن عبدالملك بن زنجويه قال حدثنا محمد بن يوسف الفريابي عن سفيان عن ابن جريج عن **عطاء ووتی: كفر دون كفر، وفسق دون فسق، وظلم دون ظلم.**

[أخبار القضاة : 43/1]

**القاضي إسماعيل بن إسحاق** (دەربارەی سێ ئایەتەکەی سورەتی المائدة) دەڵێ:

ڕووکەشی ئایەتەکان بەڵگەیە لەسەر ئەوەی هەرکەسێک هەمان کاری ئەهلی کیتاب ئەنجام بدات و حوکمێکی نوێ دابنێ پێچەوانەی حوکمی الله بێت، **وە بیکات بە دین و کاری پێ بکات، ئەوا هەمان هەڕەشەی باسکراو بۆ ئەهلی کیتاب ئەویش دەگرێتەوە، جا حاکم بێت یان غەیری حاکم بێت.**

[أحكام القرآن للقاضي بكر بن العلاء القشيري: 486/1]

ووتم: ئەم کتێبەی القاضي القشيري کورتکراوەی کتێبی (أحكام القرآن)ی القاضي إسماعيل بن إسحاق المالكي-ە، لە ئێستادا کتێبی (أحكام القرآن) القاضي إسماعيل چاپ کراوە بەڵام بەشێکی کەم لە دەستنوسی کتێبەکە بەردەست بووە بۆیە کتێبەکە هەمووی چاپ نەکراوە، لەو بەشە کەمەش کە چاپ کراوە ئەم ووتەیەی تێدا نیە بۆیە لە کتێبی (أحكام القرآن)ی القاضي القشيري نەقلی بکەم.

القاضي إسماعيل بن إسحاق کە ناسراوە بە (الجهضمي) ساڵی 282 هـ مردووە، واتا لە سەردەمی کۆمەڵێک لە کەڵە پیاوانی سەلەف ژیاوە، جا بزانە خاوەنی ووتەکە کێیە.

**ابن المنذر** دەڵێ:

حدثنا زكريا قال حدثنا الحسين بن عيسى البسطامي قال حدثنا محمد بن حرب قال حدثنا ابن لهيعة قال حدثني عطاء بن دينار الهذلي عن **سعيد بن جبير ووتی:**

﴿وَأُخَرُ مُتَشَٰبِهَٰتٌۖ﴾ [آل عمران: ٧] ووتی: موتەشابیهەکان ئایەتن لە قورئان، خەڵکی کاتێک دەیانخوێنن لە تێگەیشتنیدا توشی ناڕوونی دەبن، وە بەهۆی ئەمەوە کەسانێک

گومڕا دەبن کە بانگەشە بۆ ئایەتە موتەشابیهەکان دەکەن، هەموو گروپێک ئایەتێکی قورئان دەخوێننەوە و پێیان وایە ئەم ئایەتە بەڵگەیە بۆیان و هیدایەتیان پێی دۆزیوەتەوە، **وە یەکێک لەو ئایەتە موتەشابیهانەی کە حەروریەکان شوێنی دەکەون فەرمایشتی الله تعالى:** ﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾ **وە لەگەڵیدا ئەم ئایەتە دەخوێننەوە:** ﴿ثُمَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِرَبِّهِمۡ يَعۡدِلُونَ﴾ **[الأنعام: ١]**، **جا کاتێک بینیان پێشەوا حوکم بە غەیری حەق دەکات، دەڵێن: کافر بوو، هەر کەسێکیش کافر بێ ئەوا هاوتای بۆ پەروەردگاری داناوە و موشریک بووە، جا ئەمانە پێشەوایانی موشریکن ئەوەی گوێڕایەڵیشیان بکات موشریکە، جا خروج دەکەن و ئەوکارە دەکەن کە بینیت، چونکە ئەوان تەئویلی ئەم ئایەتە دەکەن، وە ئەم ئایەتە دەرگایەکی گەورەی بۆ کردنەوە، وە ووتەکەیان دەربارەی ئەم ئایەتە حەق نیە.**

**[تفسير ابن المنذر : ژمارە 228]**

ووتم: حەروریەکان فرقەیەکی خەواریج بوون، لە ناوچەی حروراء نیشتەجێ بوون کە شوێنێکە لە نزیک شاری کوفە، بۆیە بەم ناوە ناسران، خروجیان کرد لە ئیمام علي رَضِيَ اللهُ عَنْهُ .

سەیرکە سعید بن جبیر دەڵێ: خەواریجەکان دەست بەم ئایەتەوە دەگرن کە ئایەتێکی موتەشابیهە ! کەچی تۆش بەبێ گەڕانەوە بۆ ووتەی سەلەف لەسەر ڕووکەش ئایەتەکە وەردەگریت، دەڵێی ئەوەی پێی وابێت کوفری بچووکە ئەوا مورجیئەیە !

دەستنوسی تەفسیری ابن المنذر بەشێکی زۆر کەمی لێ دۆزراوەتەوە و چاپکراوە، ئەویش تەنها بریتیە لە (١٥) ئایەتی کۆتایی سورەتی البقرة و سورەتی آل عمران بە تەواوی و (٩٢) ئایەتی سەرەتای سورەتی النساء، باقیەکەی تری تاکو ئێستا نەدۆزراوەتەوە.

**ابن أبي زمنين** دەڵێ:

باب: (في الأحاديث التي فيها ذكر الشرك و الكفر).

واتا: ئەو فەرموودانەی کە باسی شیرک و کوفری تێدا هاتووە.

[أصول السنة : لاپەرە 169]

ابن أبي زمنين لە ژێر ئەم بابەدا ئەم فەرموودانە دەهێنێت کە لەلای ئەهلی سوننە بە شیرکی بچووک و کوفری بچووک دادەنرێن، وەک فەرموودەی: (لا ترجعوا بعدي كفارا يضرب بعضكم رقاب بعض)، وە فەرموودەی: (سباب المسلم فسوق، وقتاله كفر)، وە فەرموودەی: (من حلف بغير الله فقد أشرك أو كفر)، وە فەرموودەی: (من أتى حائضا أو امرأة في دبرها أو كاهنا وصدقه بما يقول، فقد كفر بما أنزل على محمد)، ... (پاشان دەڵێ) **ئەم فەرموودانە و هاوشێوەکانی ماناکەی ئەوەیە: ئەم کارانەی کە باسکران لەم فەرموودانە لە ئەخلاق و عادەتی کافران و موشریکانن کە نەهیان لێکراوە بۆ ئەوەی موسڵمانان خۆیان لێ بپارێزن، بەڵام ئەوەی کە هەر کەسێک یەکێک لەم کارانە ئەنجام بدات ببێتە موشریک یان کافر، ئەمە وانیە، بەڵگەش بۆ ئەمە:** (لێرەدا ابن أبي زمنين بەڵگە بە فەرموودەی "الشرك أخفى من دبيب النمل على الحجر" دەهێنێتەوە، پاشان بەڵگە بە ئایەتی: ﴿فَلَمَّآ ءَاتَىٰهُمَا صَٰلِحٗا جَعَلَا لَهُۥ شُرَكَآءَ فِيمَآ ءَاتَىٰهُمَاۚ﴾ دەهێنێتەوە، دواتر دەڵێ) **جا فێری کردین کە شیرکێک هەیە جیا لەو شیرکەی کە هاوبەش بۆ الله دابنێیت، لەوانە فەرمایشتی الله عز وجل:** ﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾ **ابن عباس بە پرسیار کەرێکی ووت کە پرسیاری لێکرد دەربارەی ئەم ئایەتە: ئەمە کوفرێک نیە لە دین دەرخەر بێت.**

بڕوانە [أصول السنة : لاپەرە 169-174]

**الحاكم** دەڵێ:

أخبرنا أحمد بن سليمان الموصلي حدثنا علي بن حرب حدثنا سفيان بن عيينة عن هشام بن حجير عن طاوس ووتی: **ابن عباس** رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا **ووتی:**

**ئەو کوفرە نیە کە ئەوان بۆی دەچن، کوفرێک نیە لە دین دەرخەر بێت.** ﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾ **کفر دون کفر.**

**[المستدرك على الصحيحين : 161/4]**

**الكرجي القصاب** (دەربارەی یەهود) دەڵێ:

**گۆڕینی حوکمی ڕەجم بۆ ڕەش کردنی ڕوخسار و لێدان و گەڕاندن بەناو خەڵکیدا و بانگەشە کردنی ئەوەی کە ئەم حوکمانە هی الله-ن کوفرە، حوکمێکی الله-یان هەڵوەشاندەوە کە الله نەسخی نەکردووە، وە بانگەشەی حوکمێکی گۆڕاویان کرد کە الله داینەبەزاندووە،** پاشان الله جل جلاله تەواوی چیرۆکەکەی باسکرد، وە فەرمووی: ﴿وَكَتَبۡنَا عَلَيۡهِمۡ فِيهَآ أَنَّ ٱلنَّفۡسَ بِٱلنَّفۡسِ وَٱلۡعَيۡنَ بِٱلۡعَيۡنِ وَٱلۡأَنفَ بِٱلۡأَنفِ﴾ تا دەگاتە ﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ﴾ **الكافرون والظالمون والفاسقون دەگەڕێتەوە بۆ ئەهلی تەورات لە یەهود و ئەهلی ئینجیل لە نەصارا، وە ئەهلی فورقان بە نیعمەتی الله لە هەر سێ وەصفەکە سەلامەتن.**

**[نكت القرآن : 306/1]**

ووتم: ئەهلی فورقان واتا ئەهلی قورئان، مەبەستی موسڵمانانە.

**الكرجي القصاب** (دەربارەی سێ ئایەتەکەی سورەتی المائدة) دەڵێ:

**جا خەواریجەکان و جگە لەوانیش کە ئەم ئایەتانە دەکەن بە بەڵگە بۆ تەکفیر کردنی ئەهلی قیبلە بە تاوانەکان،** پێیان دەووترێ: بەڵگەتان چیە لە یەکسان کردنی موسڵمانان و یەهود و نەصارا لەم ئایەتانەدا ؟ **ئەهلی فورقان دەزانن حوکمەکانی الله کە دابەزیون لە کتێبەکەی حەقن و حوکم پێکردنی لەسەریان فەرزە، وە ئەوان بە واز هێنانیان لە حوکمی الله تاوانبارن، وە لەسەر ئەنجام نەدانی سزا دەدرێن، وە ئەوان لەگەڵ ئەوەشدا موسڵمانن، وە ئەوانەی کە ئەم ئایەتانە دەربارەیان دابەزیوە یەهود و نەصاران کە هەموو ئەهلی مەزهەبەکان هیچ گومانیان لە کافرێتی ئەوان نیە،** ئایا دروستە کەسێک وا خەیاڵ بکات کە یەهود پێش حوکم بردنەوەیان بۆ لای پێغەمبەرﷺ، وە پێش واز هێنانیان لە حوکمی تەورات کافر نەبووبن ؟! ڕەت کردنەوەی پێغەمبەرایەتی محمد ﷺ و ئینکاری کردن لە پەیامەکەی هیچ زیانی پێ نەگەیاندبن ؟! کافر بوون بەهۆی واز هێنانیان لە حوکمی تەورات دەربارەی دوو زیناکەرەکە ! **هەروەک پێتان وایە کە کەسێکی موەحید لە موسڵمانان کافر دەبێت بە واز هێنانی لە حوکمی الله و حوکم کردنی بە پێچەوانەی حوکمی الله !**

گەر ووتیان: ئەمە دەکرێ وادابنرێ و بێتە دی، ئەوکات کوفریان دەردەکەوێ و حیسابیان تەواو دەبێ.

وە ئەگەر ووتیان: بەڵکو پێش حوکم کردنیان بەهۆی ڕەت کردنەوەی پێغەمبەرایەتی محمد ﷺ کافر بوون، وە گۆڕینیان بۆ حوکمی الله کوفرەکەی زیاتر کردن.

پێیان دەووترێ: ئەی هۆکاری تەکفیرکردنتان چیە بۆ ئەو کەسەی کە پێغەمبەرایەتی محمد ﷺ قبوڵ کردووە و بەهۆیەوە موسڵمان بووە، وازی هێناوە لە کارکردن بە حوکمی الله ؟ ئایا زیاد بوونی کوفرێکە کە کوفرەکە لە موسڵمانەکەدا نیە ؟ ... (پاشان دەڵێ) گەر خەواریجەکان ووتیان: ئینصاف نیە بیکەیتە بەڵگە بەسەرمان کە ئایەتەکە دەربارەی ڕەجم دابەزیوە کە ڕیوایەتەکان باسی دەکەن، ئێمە باوەڕی پێ ناکەین.

پێیان دەووترێ: دابەزینی ئایەتەکە دەکەنە دەربارەی هەر حوکمێک بیکەن، **بەڵام ئایا دانەبەزیوە دەربارەی غەیری ئەهلی فورقان ؟**

**گەر ووتیان: ئایا ناکرێ دەربارەی ئەهلی کیتاب دابەزی بێت جا هەر کەسێک هەمان کردەوەی ئەوان ئەنجام بدات ئایەتەکە ئەویش بگرێتەوە ؟**

**دەووترێ: بەڵێ، گەر بە تەواوی یەکسانی ئەوان بن و لە کردەوەدا وەک یەک بن پێیان دەووترێ کافر، بەڵام گەر هەندێک کردەوەی ئەوان ئەنجام بدەن، وە یەکسانیان نەبن لە هەموو صیفەتەکانیاندا، ئەوا تاوانبارن بەم کارە.**

**جا دەڵێین: هەرکەسێک حوکم بکات بە پێچەوانەی حوکمی الله، بانگەشەی ئەوە بکات کە ئەمە حوکمی الله-یە، یان ئینکاری ئەو حوکمانە بکات کە الله دایبەزاندووە، ئەوا کافرە، چونکە هەر کەسێک ئینکاری قورئان بکات لە کاتێکدا الله شایەتی داوە بە دابەزاندنی قورئان، یان شتێک بداتە پاڵ الله کە داینەبەزاندێ، ئەوا درۆی کردووە بەناوی الله-وە، وە هەرکەسێک درۆ بکات بەناوی الله گومان نیە لە کافر بوونی،** چونکە الله تبارك وتعالى فەرموویەتی: ﴿فَمَنۡ أَظۡلَمُ مِمَّن كَذَبَ عَلَى ٱللَّهِ وَكَذَّبَ بِٱلصِّدۡقِ إِذۡ جَآءَهُۥٓۚ أَلَيۡسَ فِي جَهَنَّمَ مَثۡوٗى لِّلۡكَٰفِرِينَ﴾ **[الزمر:**

٣٢]، الله ناوی بردن بە کافر، جا هەر کەسێک واز لەو حوکمانە بهێنی کە الله دایبەزاندووە **بەم صیفەتەوە**، ئەوا یەکسان بووە بەوانەی کە ئایەتەکان دەربارەیان دابەزین لە یەهود و نەصارا، وە شایەنی ناوی کوفر و زوڵم و فسقە، **وە هەر کەسێک تامەزرۆیی درهەم و دینار یان تۆڵە کردنەوە یان شەهوەتی نەفس پاڵی پێوە بنێت بۆ واز هێنان لە حوکمی الله، وە ئەو کەسە بزانێ سنووری بەزاندووە و خراپەکاری کردووە، وە بترسێ لەو کارە خراپەی کە ئەنجامی داوە، بڕوای بەو حوکمانە هەبێ کە پەروەردگاری دایبەزاندووە، شایەتی بدات کە حوکمەکانی حەقن و فەرزە لەسەری کاری پێ بکات، یەکسان نەبێت بە ئەهلی کیتاب لە واز هێنانی لە حوکمەکانی الله، ئەوا لەسەر ئیسلامەتیەکەی دەمێنێتەوە و سەرپێچی پەروەردگاری کردووە، جا کردەوەکانی شایستەی ئەوەن کە سزا بدرێت لەسەری گەر الله لێی خۆش نەبێت.**

بڕوانە [نکت القرآن: 1/308-311]

**السمعاني** دەڵێ:

﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾

ابن عباس دەڵێ: ئەم ئایەتە دەربارەی موسڵمانان دابەزیوە.

**وە مەبەستی ابن عباس کوفری بچووکە، وە بزانە خەواریجەکان بەڵگە بەم ئایەتە دەهێننەوە، دەڵێن: ئەوەی حوکم بەوە نەکات کە الله دایبەزاندووە ئەوا کافرە، وە ئەهلی سوننە دەڵێن: کافر نابێت بە واز هێنان لە حوکم**، وە ئایەتەکە دوو تەفسیری هەیە: یەکێکیان: مانای ئەوەیە ئەوەی حوکم بەوە نەکات کە الله

دایبەزاندووە وەک ڕەت کردنەوە و ئینکاری کردن لێی ئەوا ئەمانە کافرن، دووەمیان: مانای ئەوەیە ئەوەی حوکم نەکات بە هەموو ئەو شتانەی کە الله دایبەزاندووە ئەوا ئەمانە کافرن، کافر ئەوەیە کە واز دەهێنێت لە حوکم کردن بە هەموو ئەو شتانەی کە الله دایبەزاندووە، نەک موسڵمان.

[تفسير السمعاني : 42/2]

ووتم: ووتەی دووەم کە السمعاني باسی کرد ووتەی عبدالعزیز الکناني-ە کە دواتر دەیهێنین، واز هێنان لە هەموو ئەو شتانەی کە الله دایبەزاندووە تەوحیدیش دەگرێتەوە بۆیە کافرە، ئەگینا مەبەستی ئەوە نیە گەر لە هەموو بابەتێک حوکمی نەکرد بە قورئان تەنها لە یەک بابەت حوکمی پێ بکات ئەوا تەکفیر ناکرێ چاوەڕێ دەکرێ تا لەم بابەتەش حوکم ناکات بە قورئان ئەوکات دەڵێین بەیەکجاری وازی هێنا لە حوکم کردن بە قورئان کەواتە کافرە، ئەمە شتێکی پوچ و بەتاڵە، کەسێکی دەوێت خەریکی ژماردن و چاودێری کردن بێت بەسەر حاکمەوە ئایا وازی لە هەموو حوکمەکان هێناوە یان حوکمێکی هێشتۆتەوە تا خۆی بپارێزێ لە تەکفیر! ئەهلی سوننە بەرییە لەم تەئصیلە گاڵتەجاڕیە کە هەندێک کەس لەسەری دەڕۆن و ناویشیان لەخۆیان ناوە ئەهلی سوننە.

**البغوي** دەڵێ:

﴿فَلَا تَخْشَوُا۟ ٱلنَّاسَ وَٱخْشَوْنِ وَلَا تَشْتَرُوا۟ بِـَٔايَـٰتِى ثَمَنًا قَلِيلًا ۚ وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَـٰفِرُونَ﴾ **ابن عباس و طاوس وتوویانە: کوفرێک نیە لە دین دەرخەر بێت، بەڵکو گەر ئەنجامی بدات ئەوا کوفرە، بەڵام وەک ئەو کەسە نیە کە کافرە بە الله و ڕۆژی دوایی.**

**عطاء دەڵێ: كفر دون كفر، و ظلم دون ظلم، و فسق دون فسق-ە.**

**عكرمة دەڵێ: ماناکەی ئەوەیە: هەر کەسێک حوکم بەوە نەکات کە اللە دایبەزاندووە ئینکاری لێ بکات ئەوا کافر بووە، وە هەر کەسێک دانی پێ بنێت و حوکمی پێ نەکات ئەوا زاڵمێکی فاسقە.**

وە پرسیار کرا لە عبدالعزیز بن یحیی الکناني دەربارەی ئەم ئایەتانە، **ووتی: ئەم ئایەتە هەموو ئەو شتانە دەگرێتەوە کە اللە دایبەزاندووە نەک هەندێکی، جا هەر کەسێک حوکم نەکات بە هەموو ئەو شتانەی کە اللە دایبەزاندووە، ئەوا کافرو زاڵم و فاسقە، بەڵام ئەوکەسەی حوکم بەوە بکات کە اللە دایبەزاندووە لە تەوحید، وە واز بهێنێت لە شیرک، پاشان حوکم بە هەموو ئەو شتانە نەکات کە اللە دایبەزاندووە لە شەرائیع، ئەوا حوکمی ئەم ئایەتانە نایگرێتەوە.**

وە زانایان وتوویانە: حوکمی ئەم ئایەتەکە کەسێک دەگرێتەوە کە حوکمی اللە بە ئاشکرا **ڕەت بکاتەوە بە ئەنقەست**، بەڵام ئەو کەسەی حوکمی اللە-ی لێ شاراوەیە یان هەڵە دەکات لە تەئویل ئەوا حوکمی ئایەتەکە نایگرێتەوە.

[تفسير البغوي : 61/3]

**الزجاج** دەڵێ:

فەرمایشتی اللە: ﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾ واتا: هەر کەسێک پێی وابێت حوکمێک لە حوکمەکانی اللە کە پێغەمبەران عَلَيْهِمُ السَّلَامُ پێی هاتوون **باطلە، ئەوا کافرە.**

[معاني القرآن وإعرابه : 178/2]

**ابن تيمية** دەڵێ:

**ابن عباس و هاوەڵەكانی دەربارەی فەرمایشتی الله تعالى:** ﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾ **وتوویانە: كوفریان كردووە، كوفرێک كە لە دین دەرخەر نیە، وە أحمد بن حنبل و جگە لەویش لە پێشەوایانی ئەهلی سوننە شوێنیان كەوتوون لەم تەفسیرەدا.**

[مجموع الفتاوى : 312/7]

ووتم: بڕوانە ئەم ووتەیە (ابن عباس و قوتابیەكانی وتوویانە: كوفرێكی لە دین دەرخەر نیە، وە أحمد بن حنبل و پێشەوایانی ئەهلی سوننەش شوێنیان كەوتوون لەم تەفسیرەدا) !!!
تۆزێک بوەستە لەسەر ئەم ووتەیە و بیری لێ بكەرەوە، بزانە عەقیدەی تۆ چۆنە و عەقیدەی پێشەوایانی سەلەف چۆن بووە لەم بابەتەدا !
وە ابن تيمية لە [مجموع الفتاوى : 7/326-327] هەمان ئەو تەفسیرانەی سەلەف نەقل دەكات كە دەربارەی ئەم ئایەتە وتوویانە كوفری بچووكە، لەبەر ئەوەی ڕیوایەتەكان دووبارە و چەند بارەن نەقلم نەكرد.

ڕەنگە كەسانێک بڵێن: تۆ ووتەی ابن تيمية قبوڵ ناكەیت كاتێک كە دەڵێ: سەلەف جەهمیەكانیان تەكفیر نەكردووە بە معین ئیللا دوای ئیقامە كردنی حوجحە تەكفیریان كردوون، وە چەندەها ووتەی تری ابن تيمية ڕەت دەكەیتەوە دەربارەی گروپەكان كە ووتەكەی داوەتە پاڵ سەلەف، بەڵام لێرەدا چونكە ووتەكەی ابن تيمية هاوڕای بیروباوڕتە قبوڵی دەكەیت كاتێک دەیداتە پاڵ سەلەف، ئەمەش شوێنكەوتنی ئارەزووە ووتەكەت بە دڵ بوو قبوڵتە، بە دڵت نەبوو ڕەتی دەكەیتەوە.

لە وەڵامدا دەڵێم: ئێمە ووتەی ابن عباس و قوتابیەکانیمان نەقل کرد دەربارەی ئەم ئایەتە، وە ووتەی أحمد و پێشەوایانی سەلەفیشمان نەقل کرد کە هەمان ووتەی ابن عباس و قوتابیانی دووبارە دەکەنەوە و قبوڵیان کردووە، ئیدی بۆ ئەگەر ئەم ووتەیەی ابن تیمیة قبوڵ بکەین ئەوا شوێنی ئارەزوومان کەوتووین ؟ لە کاتێکدا دڵنیاین ئەوەی ابن تیمیة باسی دەکات ڕاستە، وە بە دەستی خۆمان ووتەکانی ابن عباس و قوتابیەکانی و پێشەوایانی سەلەفمان لە کتێبەکان دەرهێناوە و نیشانمان داون، سەبارەت بەوەش بۆچی ووتەی ابن تیمیة دەربارەی تەکفیری گروپەکان قبوڵ ناکەین کە بە هەمان شێوە ئەم ووتانە دەداتە پاڵ سەلەف ؟ چونکە ابن تیمیة شتانێک دەداتە پاڵ سەلەف لە تەکفیردا نەک ئەم شتانە لە کتێبەکانی سەلەف نین بەڵکو پێچەوانەی ئەم شتانە هەیە لە کتێبەکانی سەلەف، مەبەستم ئەوە نیە بڵێم ابن تیمیة شتانێک بە درۆ دەداتە پاڵ سەلەف بەڵام بە هەڵە لە ووتەکانیان حاڵی بووە لە بابەتی تەکفیر، تەئصیلی بابەتی تەکفیر کردنی جەهمیەکانی لەسەر لێخۆشبوونی ئیمام أحمد لە المعتصم-ی خەلیفەی عەباسی بنیات ناوە، کە المعتصم دواتر تەوبەی کرد و ئیمام أحمد لێی خۆشبوو، وە هەر کەسێکیش ئاگاداری ووتەکانی ابن تیمیة بێت ئەوا ئەم قسانەی منی هیچ بەلاوە سەیر نیە چونکە دەزانێ ابن تیمیة لە بابەتی تەکفیر چەندە شلە و لە بابەتی عوزر پێدان مەزهەبەکەی چەندە فراوانە بۆیە هەرچی مەدخەلی هەیە لە بابەتی تەکفیردا کە مشتومڕ دەکات ڕێک ڕادەکات بۆ ووتەکانی ابن تیمیة، تەنانەت ابن تیمیة نەجدیەکانیشی زۆر ماندوو کردووە بەوەی کە تەئویل بهێننەوە بۆ ووتەکانی، چونکە لە سەردەمی نەجدیەکان زۆرێک لەو موشریکانەی کە دژی دەعوەی پێشەوایانی نەجد بوون لە نامە و کتێبەکانیان بە ووتەکانی ابن تیمیة ڕەددی نەجدیەکانیان دەدایەوە، تەنانەت نوسەرێکی شیعە کە نوسراوێکی بڵاو کردبوویەوە لەسەر مەرج و ڕێگریەکانی تەکفیر، تەواوی ووتەکانی لەم بابەتەدا لە ابن تیمیة نەقل کردبوو !!!

کەواتە بابەتەکە ئارەزوو نیە ئەو ووتەیەی بە دڵمان بوو وەری بگرین و ئەو ووتەیەی بە دڵمان نەبوو ڕەتی بکەینەوە، ئایا دەکرێ بڵێین: گەر ووتەی زانایەکت لە بابەتێک ڕەت کردەوە ئەوا

دەبێت لە هەموو بابەتێکی تر ووتەکانی ڕەتی بکەیتەوە، وە گەر ووتەی زانایەکت قبوڵ کرد لە بابەتێک ئەوا دەبێت لە هەموو بابەتێکی تر ووتەکانی قبوڵ بکەیت، کە ئەمە لازمی ووتەی ئەو کەسانەیە کە ئەم ڕەخنەیە دەگرن.

وە ئەم کتێبە لەسەر ووتەکانی سەلەف بنیات نراوە، ووتەی ئەوان ئەصلەکەیە، ئەوەی لەسەر ووتەی ئەوان ڕۆیشتبێ قبوڵمان کردووە ئەوەی لێی لادا بێت ڕەتمان داوەتەوە، وە هێنانی ووتەی خەلەف و متأخرین یان هێنانی ووتەی ئەشعەری و هەندێک لە موعتەزیلی و ئیبازی لەبەر خودی ووتەکانی خۆیان نیە بەڵکو لەبەر ئەوەیە کە هەمان ووتەی سەلەفیان نەقل کردووە، واتا تێبگە ڕەت کردنەوەی ئەثەری کفر دون کفر لە هیچ سەردەمێک و لە هیچ مەزهەبێک بوونی نەبووە تەنها لای خەواریجەکان بوونی هەبووە، ئەم هەموو خاوەن مەزهەبە جیاوازە کە لە سەردەمانی جیاواز ژیاون هەموویان ئەثەرەکە قبوڵ دەکەن و لێی لانادەن، دە تۆش تێبگە کە ڕەت کردنەوەی ئەم ئەثەرە دوای کۆبوونەوەی هەموو فرقەکان لەسەر قبوڵ کردنی جگە لە گومڕایی و شوێنکەوتنی خەواریج هیچی تر نیە، وە هێنانی ووتەی ابن تیمیة لەم کتێبە دیارییەکە بۆ ئەوانەی وادەزانن هیچ کەسێک وەک ابن تیمیة شارەزاتر و تێگەیشتووتر نیە بە مەنهەجی سەلەف، دە فەرموون ببینن ابن تیمیة چۆن باسی بابەتی حوکم نەکردن بە قورئان و حوکم بردنەوە بۆ غەیری شەرعی الله دەکات، ببینن ابن تیمیة چۆن لە مەنهەجی سەلەف تێگەیشتووە لەم بابەتانەدا، جا دەزانن ابن تیمیة هاوڕای ئێوەیە یان دژی ئێوەیە.

**ابن تیمیة** دەڵێ:

**ابن عباس و جگە لەویش لە سەلەف دەربارەی فەرمایشتی الله:** ﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾ ، ﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ﴾ و ﴿ٱلظَّٰلِمُونَ﴾ **وتوویانە: كفر دون كفر، وفسق دون فسق، وظلم دون ظلم، وە أحمد و البخاري جگە**

**لەوانیش باسی ئەمەیان کردووە.**

**[مجموع الفتاوى : 522/7]**

**ابن رجب** دەڵێ:

ووشەی (کوفر) جاری وا هەیە بە ڕەهایی دێت، وە مەبەست پێی کوفری لە دین دەرخەر نیە، وەک کوفر کردنی ئافرەت بەرامبەر چاکەکانی مێردەکەی و هاوشێوەی ئەمە، ئەمە لە کاتی هاتنی ووشەی (کوفر) بە ڕەهایی، بەڵام گەر ووشەی (کوفر) بەند بوو بە شتێکەوە ئەوا هیچ کێشە و ناڕوونی تێدا نیە کە کوفری گەورە نیە، وەک فەرمایشتی الله تعالى: ﴿فَكَفَرَتۡ بِأَنۡعُمِ ٱللَّهِ﴾ [النحل:١١٢].

**مەبەست لێرەدا ئەوەیە کە ووشەی (کوفر) بە ڕەهایی دێت، پاشان تەفسیر دەکرێت بە کوفرێک کە لە دین دەرخەر نیە، ئەمەش وەک ابن عباس کە دەربارەی فەرمایشتی الله تعالى:** ﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾ **ووتی: ئەم کوفرە نیە کە ئەوان بۆی دەڕۆن، کوفرێک نیە لە دین دەرخەر بێت،** ﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾ **کفر دون کفر، الحاكم ڕیوایەتی کردووە، وە دەڵێ: سەنەدەکەی صەحیحە.**

**وە هەر لە ابن عباس ڕیوایەت کراوە دەربارەی ئەم ئایەتە دەڵێ: ئەمە کوفرە، بەڵام وەک ئەو کەسە نیە کە کافر بێت بە الله و فریشتەکانی و کتێبەکانی و پێغەمبەرانی و ڕۆژی دوایی.**

**وە بە هەمان شێوە عطاء و جگە لەویش وتوویانە: کفر دون کفر.**

**[فتح الباري : 126/1-127]**

**إلكيا الهراسي** دەڵێ:

بەرتیل بوو وای لە یەهود کرد ئەو ئایەتانە **بشارنەوە** کە الله دایبەزاند بوو بەسەر پێغەمبەراندا لە وەصف کردنی پێغەمبەرەکەمان، دونیایان پێش خست بەسەر شوێنکەوتنی پێغەمبەر، جا ئەوەی الله دایبەزاندووە لە وەصف کردنی پێغەمبەر **شاردیانەوە.**

**[أحكام القرآن : 75/3]**

**ابن عبدالبر** دەڵێ:

**زانایان یەکدەنگن لەسەر ئەوەی کە زوڵم کردن لە حوکمدا لە تاوانە گەورەکانە** بۆ کەسێک کە بە ئەنقەست وابکات و زانستی پێی هەبێ، لەم بابەتە ئەثەری زۆر توند ڕیوایەت کراوە لە سەلەفەوە، وە الله عز وجل فەرموویەتی: ﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾ و ﴿ٱلظَّٰلِمُونَ﴾ و ﴿ٱلۡفَٰسِقُونَ﴾ دەربارەی ئەهلی کیتاب دابەزین، حذیفة و ابن عباس وتوویانە: ئایەتەکان گشتین ئێمەش دەگرێتەوە، **وتوویانە: کوفرێک نیە لە دین دەرخەر بێت گەر کەسێک لە ئوممەتی ئیسلام ئەنجامی بدات، تا کافر دەبێت بە الله و فریشتەکانی و کتێبەکانی و پێغەمبەرانی و ڕۆژی دوایی، ئەم مانایە لە ژمارەیەک زانای تەفسیری قورئان ڕیوایەت کراوە، لەوانە: ابن عباس و طاوس و عطاء.**

**[التمهيد : 3/495-496]**

**ابن عبدالبر** (دوای هێنانی چەند فەرموودەیەک کە ووشەی کوفر تێیدا هاتووە و مەبەست پێی کوفری بچووکە) پاشان دەڵێ:

کۆمەڵێک لە ئەهلی بیدعە لە خەواریجەکان و موعتەزیلەکان گومڕا بوون لەم بابەتەدا، بەڵگەیان هێنایەوە بەم ڕیوایەتانە و هاوشێوەکانی بۆ تەکفیر کردنی تاوانباران، **وە بەڵگەیان هێناوە لە قورئاندا بە ئایەتانێک کە لەسەر ڕووکەش ماناکانیان وەرناگیرێن، وەک فەرمایشتی الله عز وجل:** ﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾ وە فەرمایشتی: ﴿أَن تَحۡبَطَ أَعۡمَٰلُكُمۡ وَأَنتُمۡ لَا تَشۡعُرُونَ﴾ **[الحجرات:٢]**، وە فەرمایشتی: ﴿إِن نَّظُنُّ إِلَّا ظَنًّا وَمَا نَحۡنُ بِمُسۡتَيۡقِنِينَ﴾ **[الجاثية:٣٢]**، ﴿إِنۡ هُمۡ إِلَّا يَخۡرُصُونَ﴾ **[الزخرف: ٢٠]**، ﴿وَهُمۡ يَحۡسَبُونَ أَنَّهُمۡ يُحۡسِنُونَ صُنۡعًا﴾ **[الكهف: ١٠٤]**، وە هاوشێوەی ئەمانە، **وە ڕیوایەت کراوە لە ابن عباس دەربارەی فەرمایشتی الله عزوجل:** ﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾ **وتوویەتی: کوفرێک نیە لە دین دەرخەر بێت، بەڵکو کفر دون کفر-ە.**

**[التمهيد : 390/10]**

**الجصاص** دەڵێ:

﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾ **لەوە دەرناچێت کە مەبەستی کوفری** شیرک و ئینکاری کردن بێت، یان مەبەستی کوفری نیعمەت بێت بەبێ ئینکاری کردن، جا گەر مەبەست ئینکاری کردنی حوکمی الله بێت یان حوکم کردن بە غەیری حوکمی الله و **بڵێ ئەمە حوکمی الله-یە**، ئەمە کوفرە و لە دین دەردەچێت و بکەرەکەی مورتەددە گەرپێش ئەمە موسڵمان بوو بێت، **جا لەسەر ئەمە تەفسیریان کردووە**

**ئەوانەی وتوویانە دەربارەی بەنی ئیسرائیل دابەزیوە و ئێمەش دەگرێتەوە، مەبەستیان ئەوەیە هەر کەسێک لە ئێمە ئینکاری حوکمێکی الله بکات یان حوکم بکات بە غەیری حوکمی الله پاشان بڵێ ئەمە حوکمی الله-یە، ئەوا کافرە هەروەک چۆن بەنی ئیسرائیل کافر بوون کاتێک ئاوایان کرد، وە ئەگەر مەبەست پێی کوفری نیعمەت بێت ئەوا کوفری نیعمەت بە واز هێنان لە شوکر کردن دەبێت لەسەر نیعمەتەکە بەبێ ئینکاری کردنی، جا بکەرەکەی لە دین دەرناچێت**، بەڵام ئەوەی دیارترە و بەهێزترە مانای یەکەمە، چونکە ووشەی (کوفر)ی دەربڕیوە لەسەر ئەو کەسەی کە حوکم ناکات بەوەی الله دایبەزاندووە، **وە خەواریجەکان ئەم ئایەتەیان تەئویل کرد بەسەر تەکفیر کردنی ئەو کەسەی واز بهێنێت لە حوکم کردن بەوەی الله دایبەزاندووە بەبێ ئەوەی ئینکاری حوکمەکە بکات.**

**[أحكام القرآن : 4/93-94]**

**أبو العباس القرطبي** دەڵێ:

**فەرمایشتی الله تعالى:** ﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾ **بەڵگە بە ڕووکەشی ئایەتەکە دەهێننەوە ئەوانەی کە بە تاوان خەڵکی تەکفیر دەکەن، کە ئەوانیش بریتین لە خەواریج، وە هیچ بەڵگەیەکیان نیە لەم ئایەتەدا چونکە ئەم ئایەتانە دەربارەی یەهود دابەزین کە کەلامی الله-یان گۆڕی بوو، هەروەک لە فەرموودەدا هاتووە، جا ئەوان کافرن، وە ئەوەی بەشدار بێت لە**

**سەبەب نزولەکەیان ئەوا بەشدار دەبێت لە حوکمەکەیان، ڕوونکردنەوەی ئەم بابەتە بەم جۆرەیە: موسڵمان گەر حوکمی الله تعالی بزانێ لە بابەتێکداو بڕا بێتەوە، پاشان حوکمی پێ نەکات، گەر بەهۆی ئینکاری کردنی حوکمەکە کاری پێ نەکات ئەوا کافرە خیلاف لەمەدا نیە، وە ئەگەر ئینکاری حوکمەکە نەکات ئەوا تاوانبارە و تاوانێکی گەورەی ئەنجام داوە، چونکە بڕوای بە ئەصلی حوکمەکە هەیە و دەزانێ واجبە لەسەری جێبەجێی بکات، بەڵام سەرپێچی کرد بە واز هێنان لە کار پێکردنی حوکمەکە،** ... (پاشان دەڵێ) **مەبەست لەم بەحثە ئەوەیە کە ئەم ئایەتانە مەبەست پێی ئەهلی کوفر و عینادە، ئەگەرچی لەفزەکەشیان گشتیە بەڵام موسڵمانان لێی چوونەتە دەر، چونکە وازهێنان لە کارکردن بە حوکم لەگەڵ هەبوونی ئیمان بە ئەصلەکەی ئەمە شیرک نیە، الله تعالی فەرموویەتی:** ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِۦ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُ﴾ [النساء: ٤٨ و ١١٦]، **وە واز هێنان لە حوکم کردن بە قورئان شیرک نیە بە یەکدەنگی زانایان، دەکرێ الله لە کەسەکە خۆشبێ، وە کوفر لێخۆشبوونی نیە، جا واز هێنان لە کار کردن بە حوکم نابێتە کوفر.**

**[المفهم لما أشكل من تلخيص كتاب مسلم : 5/117-118]**

**أبو حيان الأندلسي** دەڵێ:

﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَٰفِرُونَ﴾ ابن مسعود و إبراهيم و عطاء و کۆمەڵێک بۆ ئەوە چوونە کە ئەم ئایەتە گشتیە دەربارەی یەهود و غەیری یەهودیشە،

**بەڵام کفر دون کفر-ە، و ظلم دون ظلم-ە، و فسق دون فسق-ە**، واتا: کوفری موسڵمان وەکو کوفری کافر نیە، بە هەمان شێوە زوڵمەکەشی و فسقەکەشی نایخاتە دەرەوە لە دین، **ابن عباس و طاوس وایان ووتوە.**

**[البحر المحيط : 504/3]**

**أبو حيان الأندلسي** دەڵێ:

السدي دەڵێ: هەر کەسێک موخالەفەی حوکمی الله بکات و بە ئەنقەست تەرکی بکات و لێی لا بدات و بشزانێ، ئەوا لە کافرانە بەڕاستی.

**أبو حيان دەڵێ: ئەم ووتەیە بەوە لێکدەدرێتەوە کە ئینکاری حوکمەکە بکات، ئەمەیان کوفرە و دژی ئیمانە هەروەک ابن عباس ووتی.**

**[البحر المحيط : 505/3]**

**القشيري** دەڵێ:

مەزهەبی خەواریج بریتیە لەوەی هەر کەسێک بەرتیل وەربگرێ و حوکم بکات بە غەیری حوکمی الله ئەوا کافرە، **ئەم ووتەیەش دراوەتە پاڵ الحسن و السدي.**

**[القرطبي نەقلی کردووە لە تەفسیرەکەی : 499/7]**

ووتم: نەمبینی کەس ئەم ووتەیە بداتە پاڵ الحسن البصري ! تەنها ئەوە نەبێت کە الحسن وتوویەتی ئەم ئایەتانە دەربارەی بەنی ئیسرائیل دابەزیون و لەسەر ئێمەش واجبە، ئەمەش تەنها ووتەی الحسن نیە بگرە دوای لێکۆڵینەوە دەردەکەوێ هەموو ئەهلی سوننە هاوڕان لەسەر ئەمە وەک پێشتر باسمان کرد، گەر موسڵمانان بە هەمان شێوەی ئەهلی کیتاب

حوکمی اللە بشارنەوە و بیگۆڕن ئەوا کوفر ئەوانیش دەگرێتەوە، سەبارەت بە ووتەکەی السدي ئەمەیان ڕوونە بە سەنەدەوە لە السدي ڕیوایەت کراوە، هێنانی ووتەکەی السدي لەگەڵ ووتەی خەواریجەکان و یەکسان کردنی بەیەکتر، خۆی نیشانەی ئەمەیە کە ووتەکەی السدي لە ڕووکەشدا موافقی ئەهلی سوننە نیە بەڵکو موافقی خەواریجە، بۆیە یان دەبێت تەئویل بکرێ یان ئەوەتا وەک القشیري بیخەینە پاڵ ووتەی خەواریجەکان، هەر لەبەر ئەمەش أبو حیان لە تەعلیق دانی لەسەر ووتەکەی السدي ووتی: ئەم ووتەیە بەوە لێکدەدرێتەوە کە ئینکاری حوکمی اللە بکات، واتا ووتەکەی السدي تەئویل کرد لەسەر ڕووکەش وەری نەگرت، چونکە ڕووکەشی ووتەکەی ووتەی خەواریجە، وە الطبري ئەم ووتەیەی السدي لەگەڵ ووتەی ئەو کەسانە هێنا کە وتوویانە: ئایەتەکە دەربارەی بەنی ئیسرائیل دابەزیوە بەڵام هەموو کەسێک دەگرێتەوە کە هەمان کاری ئەوان ئەنجام بدات جا موسڵمان بێت یان کافر، بۆیە هیچ کامیان بە ڕووکەش ووتەکەیان وەرنەگرتووە، ئەوەشی بە ڕووکەشی وەری گرتبێ دانی پێناوە کە ئەمە ووتەی خەواریجە.

**أبو عبدالله القرطبي** دەڵێ:

فەرمایشتی اللە تعالی: ﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾ و ﴿ٱلظَّٰلِمُونَ﴾ و ﴿ٱلۡفَٰسِقُونَ﴾ **هەمووی دەربارەی کافران دابەزین،** هەروەک لە صەحیحی مسلم هاتووە لە فەرموودەی البراء کە پێشتر هێنامان، **وە زۆرینەی زانایان لەسەر ئەمەن، بەڵام موسڵمان کافر نابێت ئەگەرچی تاوانی گەورەش ئەنجام بدات.** وە ووتراوە: ئایەتەکان شتی شاراوەی تێدایە، **ماناکەی بەم جۆرەیە: ئەوەی حوکم بەوە نەکات کە اللە دایبەزاندووە وەک ڕەتکردنەوەی قورئان و ئینکار کردنی ووتەی پێغەمبەر ﷺ ئەوا کافرە، ابن عباس و مجاهد ئەمەیان ووتوە، جا**

**ئایەتەکە گشتیە لەسەر ئەم مانایە.**

ابن مسعود و الحسن وتوویانە: گشتیە دەربارەی هەرکەسێک کە حوکم بەوە نەکات کە الله دایبەزاندووە لە موسڵمانان و یەهود و کافران، **واتا: بڕوای وابێت و بە حەلالی بزانێت، بەڵام ئەو کەسەی وابکات و پێی وابێت کارێکی حەڕامی ئەنجام داوە ئەوا لە موسڵمانە فاسقەکانە**، کاروباریشی بۆ الله دەگەڕێتەوە گەر بیەوێ سزای دەدات، وە ئەگەر بیەوێ لێی خۆش دەبێت.

وە ابن عباس لە ڕیوایەتێک دەڵێ: ئەوەی حوکم نەکات بەوەی کە الله دایبەزاندووە ئەوا کارێکی کردووە هاوشێوەی کاری کافرانە.

وە ووتراوە: واتا ئەوەی حوکم نەکات بە هەموو ئەو شتانەی کە الله دایبەزاندووە ئەوا کافرە، **بەڵام ئەوەی حوکم بکات بە تەوحید و حوکم نەکات بە هەندێک شەرائیع ئەوا ناچێتە ناو ئەم ئایەتەوە.**

**وە ئەوەی دروستە ووتەی یەکەمە.**

**[تفسير القرطبي : 7/497-498]**

ووتم: کە دەڵێ ووتەی یەکەم دروستە، مەبەستی ئەم ووتەیە: (هەر سێ ئایەتەکە دەربارەی کافران دابەزین، بەڵام موسڵمان گەر تاوانی گەورەش ئەنجام بدات کافر نابێت).

مەبەست لە تاوانی گەورەش حوکم نەکردنە بە قورئان.

زانایان کە دەڵێن: ئەم ئایەتانە دەربارەی ئەهلی کیتاب دابەزین، مەبەستیان ئەوەیە ئەوان کارێکیان ئەنجامدا ئەم کارە بووە هۆی ئەوەی کە ئەم ئایەتانە دابەزن، جا هەرکەسێک هەمان کاری ئەوان ئەنجام بدات ئەوا حوکمی ئایەتەکە ئەویش دەگرێتەوە.

جا هەر زانایەک لەم سێ ئایەتەی سورەتی المائدة باسی ئەوە بکات دەربارەی ئەهلی کیتاب دابەزیون، ئەوا مەبەستی ئەوەیە موسڵمان بە حوکم نەکردن بە قورئان کافر نابێت ئیللا گەر هەمان کاری ئەهلی کیتاب ئەنجام بدات کە گۆڕینی حوکمی الله بوو، کەواتە هەر زانایەک باسی سەبەب نزول بکات لەم ئایەتانەدا ئەوا مەنهەجی زاناکە بریتیە لە تەکفیر کردن بە مەرج، نەک بە ڕەهایی بڵێ ئەوەی حوکم نەکات بە قورئان کافرە بێ هیچ مەرجێک لەو مەرجانەی کە باسکراون.

**محمد رشيد رضا** (دەربارەی سێ ئایەتەکەی سورەتی المائدة) دەڵێ:

**حوکم نەکردن بەوەی کە الله دایبەزاندووە یان وازهێنان لێی و حوکم کردن بە غەیری ئەو -کە ئەمە مەبەستە- بە کوفر دانانرێت بە مانای لە دین دەرچوون، بەڵکو بە مانای گەورەترین تاوان دێت،** ... (پاشان دەڵێ) وە هیچ ڕێگریەک نیە مەبەست کوفری گەورە بێت لە ئایەتی یەکەم و دوو ئایەتەکەی دواتریش **گەر پشت کردن لە حوکم کردن بەوەی کە الله دایبەزاندووە بەهۆی بە ناشرین دانانی حوکمی الله و ملکەچ نەبوون بۆی و بە باشتر دانانی غەیری حوکمی الله بێت لە حوکمی الله.**

**[تفسير المنار: 404/6]**

ووتم: محمد رشيد رضا لە سەردەمێک ژیاوە یاسا دانراوەکان هەبوون لە وڵاتاندا، ئەوەتا دەڵێ: گەر حوکم نەکات بە قورئان و حوکم بە شتێکی تر بکات، واتا هەردوو بیانووەکە دەبڕێت، چونکە هەندێک کەس دەڵێن: گەر حوکم نەکات بە قورئان کافرە، وە هەندێکی تر کە دەبینن ئەثەری کفر دون کفر زۆر بڵاوە و بواری ئینکاری کردنی نیە، دەیانەوێ ڕێگایەکی تر بگرنە بەر، بۆیە دەڵێن: گەر حوکم نەکات بە قورئان کافر نابێت تەنها حوکمەکەی

پەکخستووە، بەڵام گەر حوکمی کرد بە شتێکی تر جگە لە قورئان ئەوا کافر دەبێت تەشریعی داناوە و حوکمی الله-ی گۆڕیوە، کەچی محمد رشید رضا دەڵێ: حوکم نەکردن بە قورئان و حوکم کردن بە غەیری قورئان کە ئەمە مەبەستە لێرەدا ئەویش بە کوفر دانانرێت، ئینجا دواتر بە مەرج دەیکات بە کوفر، وەک بە ناشرین دانانی حوکمی الله و ملکەچ نەبوون بۆی و بە باشتر دانانی حوکمی تر لە حوکمی الله.

**محمد رشید رضا** دەڵێ:

زۆرێک لە موسڵمانان شەرائیع و حوکمیان داهێناوە هاوشێوەی قەومانی پێشوو کە دایانهێنا، وە بەهۆی حوکم کردن بەم حوکمە داهێنراوانە وازیان هێنا لە حوکم کردن بە هەندێک لەو حوکمانەی کە الله دایبەزاندووە بەسەریان، جا ئەوانەی کە واز دەهێنن لە حوکم کردن بەو حوکمانەی کە الله دایبەزاندووە لە کتێبەکەی بەبێ ئەوەی هیچ تەئویلێکیان هەبێت و بەڕاستی بزانن، ئەوا فەرمایشتی الله تعالى لەم سێ ئایەتەدا یان لە هەندێکی لەسەریان دێتە دی **هەر کەسەو بەپێی حاڵی خۆی، جا هەر کەسێک پشت بکات لە حوکم کردن بە حەددی دزی کردن و بوهتان هەڵبەستن بە زینا و زینا کردن، ملکەچی نەبێت بەهۆی بە ناشرین دانانی ئەم حەددانە و بە باشتر دانانی سزای تر لەم حەددانە، لەو حوکمانەی کە مرۆڤەکان دایانهێناوە، ئەوا ئەم کەسە کافرە و بڕاوەتەوە، وە ئەوەی حوکمی پێ نەکات لەبەر هۆکارێکی تر ئەوا زاڵمە گەر ئەم حوکم نەکردنە بەفیڕۆدانی حەق یان واز هێنان لە عەدالەت و یەکسانی تێدا بێت، ئەگینا جگە لەمانە کەسەکە تەنها فاسقە**، لەفزی فسق گشتگیرترینی ئەم لەفزانەیە، هەموو کافر و

زاڵمێک فاسقە بەڵام پێچەوانەکەی وانیە.

**[تفسير المنار : 405/6]**

**محمد رشيد رضا** دەڵێ:

﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَٰفِرُونَ﴾ **ڕووکەشی ئایەتەکە هیچ یەکێک لە پێشەوا ناودارەکانی فقە نەیووتوە، بەڵکو هیچ کەسێک نەیووتوە هەرگیز،** چونکە ڕووکەشی ئایەتەکە هەموو کەسێک دەگرێتەوە کە حوکم نەکات بەوەی الله دایبەزاندووە بە ڕەهایی، جا حوکم بە غەیری ئەوە بکات کە الله تعالی دایبەزاندووە یان نا، ئەمەش هیچ کەسێک لە موسڵمانان تەکفیری ناکەن، تەنانەت خەواریجەکانیش تەکفیری ناکەن کە فاسقەکان بە تاوان تەکفیر دەکەن، **وە یەکێک لەو تاوانانەی کە خەڵکی پێ تەکفیر دەکەن حوکم کردنە بە غەیری ئەوەی الله دایبەزاندووە.**

**[تفسير المنار : 406/6]**

ووتم: لێرەدا مەبەستی موخالەفە کردنی حوکمی الله-یە بە ڕەهایی، بۆیە دەڵێ کەس ئەمەی تەکفیر نەکردووە تەنانەت خەواریجیش، واتا موسڵمان کە نەزەرێک دەکات ئەوا حوکمی بەوە نەکردووە کە الله دایبەزاندووە لە چاو داخستن بەرامبەر کەسانی نامەحرەم، بەڵام هیچ کەسێک بەمە تەکفیری ناکات.

بەڵام لە کۆتاییدا باسی ئەوە دەکات کە خەواریج موسڵمانان تەکفیر دەکەن بە تاوانی حوکم کردن بە غەیری ئەوەی الله دایبەزاندووە.

حوکم کردن بە غەیری ئەوەی الله دایبەزاندووە بە تاوانی ناوبرد، وە تەکفیر کەرانی خاوەنی ئەم تاوانەشی بە خەواریج ناوبرد.

**ابن القيم** دەڵێ:

حوکم کردن بەوەی الله دایبەزاندووە لە لقەکانی ئیمانە، **وە حوکم کردن بەغەیری ئەوەی الله دایبەزاندووە لە لقەکانی کوفرە، وە تاوانەکان هەمووی لە لقی کوفرن**، هەروەک چۆن طاعەتەکان هەمووی لە لقی ئیمانن.

**[الصلاة : لاپەرە 86]**

ووتم: بڕوانە ووتی: حوکم کردن بە غەیری قورئان لە لقەکانی کوفرە، هەروەک چۆن هەموو تاوانێک لە لقی کوفرە، نەک ڕاستەوخۆ کوفر بێت، واتا کوشتن و دزی و زینا و هەموو تاوانێکی تر لە لقەکانی کوفرن.

**ابن القيم** دەڵێ:

حوکم کردن بە غەیری ئەوەی کە الله دایبەزاندووە و تەرک کردنی نوێژ کوفری عەمەلیە و بڕاوەتەوە، وە ناکرێ ناوی کوفر نەفی بکرێ لێی دوای ئەوەی الله و پێغەمبەرەکەی دەریان بڕیوە دەربارەی، جا ئەو حاکمەی کە حوکم بە غەیری قورئان دەکات کافرە، وە نوێژ نەکەر کافرە بە دەقی ووتەی پێغەمبەری الله ﷺ بەڵام کوفری عەمەلە نەک کوفری اعتقاد، وە مەحاڵە الله سبحانە ناو لەو حاکمە بنێت کافر کە حوکم بە غەیری قورئان دەکات، وە پێغەمبەری الله ﷺ ناو لە نوێژ نەکەر بنێت کافر، کەچی ناوی کوفر دەربارەیان دەرنەبڕدرێ، وە پێغەمەری الله ﷺ نەفی ناوی ئیمانی کردووە دەربارەی زیناکەر و دز و عەرەق خۆر و ئەو کەسەی کە دراوسێکەی لە خراپەی ئەمین نیە، جا کاتێک ناوی ئیمانی لێ نەفی کرا ئەوا کافرە لەلایەنی عەمەلەوە، ئەگەرچی کوفری ئینکاری و اعتقادی لەو کەسەدا نەبێت، بە هەمان شێوە

فەرموودەی: (لا ترجعوا بعدي كفارا يضرب بعضكم رقاب بعض)، ئەمە كوفری عەمەلە، بە هەمان شێوە فەرموودەی: (من أتى كاهنا فصدقه، أو امرأة في دبرها فقد كفر بما أنزل على محمد)، وە فەرموودەی: (إذا قال الرجل لأخيه: يا كافر، فقد باء بها أحدهما)، ... (پاشان دەڵێ) پێغەمبەر ﷺ لە فەرموودەی صەحیح ڕایگەیاندووە: (سباب المسلم فسوق، وقتاله كفر)، جیاوازی کرد لەنێوان جنێو دان بە موسڵمان و شەڕکردن لەگەڵی، یەکێکیانی کرد بە فسق کە پێی کافر نابێت، وە ئەوەی تریانی کرد بە کوفر، وە مەعلومە پێغەمبەر ﷺ مەبەستی کوفری عەمەلیە نەک کوفری اعتقادی، وە ئەم کوفرەش دەری ناخاتە دەرەوە لە بازنەی ئیسلامەتی و دین بەیەکجاری، هەروەک چۆن زیناکەر و دز و عەرەق خۆری لە دین نەخستە دەرەوە، ئەگەرچی ناوی ئیمانیشی پێیەوە نەمێنێت، **وە ئەم تەفصیلە ووتەی هاوەڵانە کە ئەوان زاناترینی ئوممەتن بە کتێبی الله و ئیسلام و کوفر و لەوازمەکانیان، جا ئەم بابەتانە وەرناگیرێت تەنها لەوانەوە نەبێت، موتەئەخیرین لە مەبەستی هاوەڵان تێنەگەیشتوون** جا بوون بە دوو کۆمەڵ، کۆمەڵێکیان خەڵکیان لە دین کردە دەرەوە بە تاوانی گەورە، وە حوکمیاندا بەسەر خاوەنەکانیان کە تاهەتایە لە دۆزەخ دەمێننەوە، وە کۆمەڵێک کردنیان بە ئیمانداری ئیمان کامل، جا ئەوان زیادەڕەوییان کرد، وە ئەوانەش شلڕەوییان کرد. **الله هیدایەتی ئەهلی سوننەی دا بۆ باشترین ڕێگا و ووتەی مامنەوەند، کە لەناو مەزهەبەکاندا وەک ئیسلام وایە لەناو دینەکانی تردا، جا لێرەدا کفر دون کفر، ونفاق دون نفاق، وشرك دون شرك، فسوق دون فسوق، وظلم دون ظلم-ە.**

سفیان بن عیینة دەڵێ: عن هشام بن حجير عن طاوس عن **ابن عباس: دەربارەی**

**فەرمایشتی الله تعالی:** ﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾ **ووتی: ئەو کوفرە نیە کە ئەوان بۆی دەچن.**

وە عبدالرزاق دەڵێ: أخبرنا معمر عن ابن طاوس عن أبيه ووتی: پرسیار کرا لە ابن عباس دەربارەی فەرمایشتی الله: ﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾ **ووتی: ئەمە کوفریانە، بەڵام وەک ئەو کەسە نیە کە کافر بێت بە الله و فریشتەکانی و کتێبەکانی و پێغەمبەرانی، وە لە ڕیوایەتێکی تردا دەڵێ: کوفرێک نیە لە دین دەرخەر بێت.**

**وە طاوس دەڵێ: کوفرێک نیە لە دین دەرخەر بێت.**

وە وکیع دەڵێ: عن سفیان عن ابن جریج عن عطاء ووتی: **کفر دون کفر، و ظلم دون ظلم، و فسق دون فسق.**

**وە ئەمەی عطاء ووتی لە قورئاندا ڕوونە بۆ کەسێک کە تێی بگات، الله سبحانە ئەو کەسەی حوکم دەکات بە غەیری قورئان ناوی لێناوە کافر، وە ئەو کەسەی ئینکاری قورئان دەکات ناوی لێناوە کافر، وە ئەم دوو کافرە یەکسان نین.**

بڕوانە [الصلاة : لاپەڕە 89-93]

ووتم: هەر چەندە باسەکەمان حوکمی نوێژ نەکەر نیە، بەڵام لەبەر ئەوەی ابن القيم حوکم نەکردن بە قورئان و تەرک کردنی نوێژی لەپاڵ یەکتر باسکرد و هەردووکیانی بە کوفری عەمەلی ناوبرد نەک کوفری اعتقادی، وە تەئکیدی لەوە کردەوە کە حوکم کردن بە غەیری قورئان کوفری بچووکە، جا لەبەر ئەمە تاکو موسڵمانان توشی گومان نەبن و کەسانی دڵ

نەخۆش دەست بەم ووتەیە نەگرن وابزانن ابن القیم نوێژ نەکەر تەکفیر ناکات، تەواوی ووتەکەی ابن القیم دەهێنین کە لە لاپەرەکانی دواتر باسی دەکات دەربارەی نوێژ نەکەر، تاکو ڕوون ببێتەوە کە تەکفیری نوێژ نەکەر دەکات.

**ابن القیم** دەڵێ:

سەیرە گومان دروست بێ دەربارەی کوفری ئەو کەسەی کە سوورە لەسەر تەرک کردنی نوێژ، وە بانگ بکرێ بۆ ئەنجام دانی نوێژ لەبەر چاوی خەڵکی، درەوشانەی شمشێر لەسەر سەری دەبینێت و دەستی بەستراوەتەوە بۆ کوشتن و چاوەکانی بەستراون، وە پێی ووتراوە: نوێژ دەکەی یان دەتکوژین، ئەویش دەڵێ: بمکوژن هەرگیز نوێژ ناکەم !

وە ئەوەی نوێژ نەکەر تەکفیر ناکات دەڵێ: ئەمە ئیمانداره، موسڵمانە، دەشۆردرێت و نوێژی لەسەر دەکرێت و لە گۆڕستانی موسڵمانان دەنێژرێت، وە هەندێکیان دەڵێن: ئیماندارە ئیمانی کاملە، ئیمانی وەک ئیمانی جبریل و میکائیل-ە !

**ئایا ئەم کەسە شەرم ناکات کە ئەمە ووتەکەیەتی لە ئینکاری کردنی لە تەکفیری کەسێک کە قورئان و سوننەت و ئیجماعی هاوەڵان شایەتیان داوە بە کافر بوونی !.**

[الصلاة : لاپەرە 104-105]

## سلیمان بن سحمان:

پرسیارکەر دەڵێ: پرسیاری یەکەم: ئەو کوفرە چیە کە لە دین دەرخەرە، وە ئەو کوفرە چیە کە لە دین دەرخەر نیە لە ووتەی زانایاندا کە دەڵێن: کوفر دوو کوفرە و فسقیش

دوو فسقه ؟

لە وەڵامدا دەڵێ: ئەم بابەتە شێخ عبداللطیف بن عبدالرحمن بن حسن وەڵامی داوەتەوە لە نامەکەی بۆ الخطیب، وە ئەوەی باسکردووە کە شمس الدین ابن القیم رحمە اللە تعالی باسیکردووە لە کتێبی (الصلاة)، ... (لێرەدا سلیمان بن سحمان هەمان ووتەی ابن القیم نەقل دەکات کە پێش ئێستا هێنامان لە کتێبی الصلاة بەڵام ئەو بە زیادەوە نەقلی دەکات، ئێمە لە لاپەرە 89 تا 93 نەقلمان کرد، ئەو لە لاپەرە 88 تا 98 نەقل دەکات، شێخ عبداللطیف-یش کاتێک پرسیاری ئەمەیان لێکردووە هەر بە هەمان ووتەی ابن القیم وەڵامی داوەتەوە، ئینجا دوای نەقل کردنی تەواوی ووتەکەی ابن القیم و وەڵامەکەی شێخ عبداللطیف، پاشان سلیمان بن سحمان دەڵێ) سەیری ئەوە بکە اللە ڕەحمت پێ بکات کە زانایان باسیان کرد لەوەی کە کوفر دوو جۆرە، کوفری اعتقاد و ئینکاری و عینادی، کوفری ئینکاری و عینادی ئەوەیە کە کافر بێت بە ئینکاری و عینادیەوە بەو شتەی کە دەزانێت پێغەمبەر هێناویەتی لەلایەن اللە-وە، لە ناوەکانی پەروەردگار و صیفات و کردەوە و حوکمەکانی کە ئەصلەکەی تەوحیدی اللە و پەرستنیەتی بەبێ شەریک دانان بۆی، ئەم کوفرە دژی ئیمانە لە هەموو ڕوویەکەوە، جا ئەم کوفرەیە کە لە دینی ئیسلام دەیخاتە دەرەوە، چونکە دژی ئیمانە لە هەموو ڕوویەکەوە، وە جۆری دووەم بریتیە لە کوفری عەمەل، ئەمیش دوو جۆرە هەر کامیان بێت: کوفری لە دین دەرخەر و کوفری لە دین دەرنەخەر، جۆری یەکەم دژی ئیمانە وەک سوجدە بردن بۆ بت و سوکایەتی کردن بە قورئان و کوشتنی پێغەمبەر و جنێو دان پێی، **وە جۆری دووەمی کوفری عەمەلی لە دین دەرخەر نیە، وەک حوکم کردن بە غەیری ئەوەی اللە دایبەزاندووە و تەرک کردنی نوێژ، ئەمە کوفری عەمەلە لە کوفری اعتقاد نیە**، بە هەمان شێوە فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ (لا ترجعوا بعدي كفارا يضرب بعضكم رقاب بعض)، وە فەرموودەی: (من أتى

كاهنا فصدقه، وأتى امرأة في دبرها فقد كفر بما أنزل على محمد ﷺ) ئەمە لە کوفری عەمەلیە، وەک سوجدە بردن بۆ بت و سوکایەتی کردن بە قورئان و کوشتنی پێغەمبەر و جنێو دان پێی نیە، **ئەگەرچی هەمووی ووشەی کوفری بۆ بەکاردێت**، تا کۆتایی ئەوەی باسیکرد رحمه الله.

**بەڵام پێویستە بزانرێ ئەوەی حوکم بەرێتەوە بۆ لای طاغوت یان حوکم بکات بە غەیری ئەوەی الله دایبەزاندووە، وە بڕوای وابێت حوکمی ئەوان تەواوتر و باشترە لە حوکمی الله و پێغەمبەرەکەی، ئەمەیان دەبێتە کوفری اعتقادی کە لە دین دەرخەرە، هەروەک باسکراوە لە 10 هەڵوەشێنەرەوەکەی ئیسلام، بەڵام ئەوەی بڕوای وانەبێت بەڵام حوکم بەرێتەوە بۆ لای طاغوت، وە بڕوای وایە حوکمی طاغوت باطلە، ئەمەیان کوفری عەمەلیە،** ... (پاشان دەڵێ) وە پرسیاری دووەم بریتیە لە ووتەی پرسیارکەر کە دەڵێ: ئەو حوکم بردنەوە بۆ لای طاغوت کە ئەوەی ئەنجامی بدات پێی کافر دەبێت کامەیە، وە ئەوەی کە پێی کافر نابێت کامەیە ؟

**لە وەڵامدا دەڵێ: پێشتر وەڵامی ئەم پرسیارە درایەوە بە تەفصیلی لە ووتەی شمس الدين ابن القيم و ووتەی شێخەکەمان، جا بگەڕێوە سەری، وە بزانە ئەم بابەتانە شوێنی پێهەڵخلیسکان و تێکەڵ بوونی تێگەیشتنە، دەست بەوە بگرە کە سەلەفی صالح و سەدەی یەکەمی ئیسلام لەسەری بوون.**

**بڕوانە [كشف غياهب الظلام عن أوهام جلاء الأوهام : لاپەرە 310-316]**

ووتم: سلیمان بن سحمان ووتی: (بەڵام پێویستە بزانرێ ئەوەی حوکم بەرێتەوە بۆ لای طاغوت

یان حوکم بکات بە غەیری ئەوەی الله دایبەزاندووە، وە بڕوای وابێت حوکمی ئەوان تەواوترو باشترە لە حوکمی الله و پێغەمبەرەکەی، ئەمەیان دەبێتە کوفری اعتقادی کە لە دین دەرخەرە، هەروەک باسکراوە لە 10 هەڵوەشێنەرەوەکەی ئیسلام، بەڵام ئەوەی بڕوای وانەبێت بەڵام حوکم بەرێتەوە بۆ لای طاغوت، وە بڕوای وایە حوکمی طاغوت باطلە، ئەمەیان کوفری عەمەلیە).

ئەم ووتەیە ڕوونکردنەوەی مەزهەبی شێخ محمد بن عبدالوهاب-ە لەم بابەتەدا، کە حوکم کردن بە غەیری قورئان و حوکم بردنەوە بۆ لای طاغوتی کرد بە دوو جۆر، جۆری یەکەم کە کوفرێکی لە دین دەرخەرە گەر بڕوای وابێت حوکمی طاغوت لە حوکمی الله باشترە هەروەک لە 10 هەڵوەشێنەرەوەکە باسکراوە، واتا شێخ محمد بەم مەرجە حوکم نەکردن بە قورئان و حوکم بردنەوە بۆ لای طاغوت بە کوفری گەورە دەزانێت کە حوکمی طاغوت بە باشتر بزانێت لە حوکمی الله، وە جۆری دووەم کە حوکم دەباتەوە بۆ لای طاغوت بەڵام بەرییە لە حوکمی طاغوت و بە باطلی دەزانێت ئەوکات دەبێتە کوفری عەمەلی کە لە دین دەرخەر نیە، ڕاستە لەلای ئەهلی سوننە کوفری عەمەلی کوفری گەورە و بچووک لەخۆ دەگرێت بە خیلافی جەهمیەکان کە هەموو کوفرێکی عەمەلی بە کوفری بچووک دەزانن، بەڵام ووتەکەی ابن القیم و سلیمان بن سحمان زۆر ڕوونە کە لێرەدا مەبەست لە کوفری عەمەلی کوفری بچووکە، چونکە لە بەرامبەر کوفری عەمەلی لە دین دەرخەر هێناویەتی کە کوفری گەورەیە، هیچ مانایەکیش نادات بڵێ کوفری عەمەلی دوو جۆرە و هەردووکیشیان لە دین دەرخەرن ! کەواتە لەسەر چ بنەمایەک کران بە دوو جۆر گەر هەردووکیان هەمان شت بن ؟!

با بگەڕێینەوە سەر ووتەکەی سلیمان بن سحمان کە ووتی: ئەو کوفرەیان لە دین دەرخەرە کە حوکمی طاغوت لە حوکمی الله بە باشتر بزانێ هەروەک لە 10 هەڵوەشێنەرەوەکە هاتووە، مەبەستی هەڵوەشێنەرەوەی چوارەمە کە شێخ محمد بن عبدالوهاب دەڵێ: (من اعتقد أن هدي غير النبي ﷺ أكمل من هديه، أو أن حكم غيره أحسن من حكمه، كالذين

یفضلون حكم الطواغیت علی حكمە، فهو كافر).

واتا: هەركەسێک بڕوای وابێت ڕێبازی غەیری پێغەمبەرﷺ كاملترە لە ڕێبازی پێغەمبەر، یان حوكمی غەیری پێغەمبەر باشترە لە حوكمی پێغەمبەر، وەک ئەوانەی كە حوكمی طاغوتەكان تەفزیل دەكەن بەسەر حوكمی پێغەمبەر، جا ئەو كەسە كافرە.

سلیمان بن سحمان لەوە تێگەیشتووە كە شێخ محمد بەم مەرجە حاكم و كەسی حوكم بەرەوە بۆ لای حاكم تەكفیر دەكات گەر ئەمە حاڵیان بێت وەک باسكرا، ئەگینا كوفرەكەیان كوفری بچووكە و پێی لە دین دەرناچن.

زیادەڕەوەكان دەڵێن: شێخ محمد بن عبدالوهاب ئەو كەسەی بە طاغوت ناو بردووە كە حوكم بە غەیری قورئان دەكات، كەواتە بە ڕەهایی بە كافری دەزانێت بەبێ تەفصیل، بۆیە ئەم ووتەیەی سلیمان بن سحمان موتەشابیهە وەری ناگرین !

ئێستا ڕوونی دەكەینەوە كە ووتەكەی سلیمان بن سحمان ووتەی موحكەمی شێخ محمد-ە، بەڵكو ئەو ووتەیەی كە ئێوە دەستان پێیەوە گرتووە ووتەیەكی موتەشابیهە.

**محمد بن عبدالوهاب** دەڵێ:

طاغوتەكان زۆرن، سەرەكیەكانی پێنج دانەیە:

ئیبلیس لەعنەتی الله-ی لێبێ، وە كەسێک بپەرسترێ ئەویش پێی ڕازی بیت، وە كەسێک بانگەشەی زانینی شتێک لە غەیب بكات، وە كەسێک خەڵكی بانگ بكات بۆ پەرستنی خۆی، وە كەسێک حوكم بە غەیری ئەوە بكات كە الله دایبەزاندووە.

**[الدرر السنیة : 136/1]**

**محمد بن عبدالوهاب** دەڵێ:

طاغوتەکان زۆرن، ئەوەی بۆ ئێمە ڕوونە لە طاغوتەکان پێنج دانەن:

یەکەمیان شەیتانە، وە حاکمێک کە زوڵم دەکات، وە ئەو کەسەی بەرتیل دەخوات، وە ئەو کەسەی دەپەرسترێ و پێی ڕازیە، وە ئەو کەسەی کار دەکات بەبێ عیلم.

**[الدرر السنية : 137/1]**

**محمد بن عبدالوهاب** دەڵێ:

طاغوتەکان زۆرن، سەرەکیەکانی پێنج دانەیە:

یەکەم: شەیتان، کە بانگەواز دەکات بۆ پەرستنی غەیری الله، بەڵگەش فەرمایشتی الله تعالی-یە: ﴿أَلَمۡ أَعۡهَدۡ إِلَيۡكُمۡ يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ أَن لَّا تَعۡبُدُواْ ٱلشَّيۡطَٰنَۖ إِنَّهُۥ لَكُمۡ عَدُوّٞ مُّبِينٞ﴾ **[يس: ٦٠]**.

دووەم: حاکمی زاڵم، کە حوکمی الله تعالی دەگۆڕێت، بەڵگەش فەرمایشتی الله تعالی-یە: ﴿أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ يَزۡعُمُونَ أَنَّهُمۡ ءَامَنُواْ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبۡلِكَ يُرِيدُونَ أَن يَتَحَاكَمُوٓاْ إِلَى ٱلطَّٰغُوتِ وَقَدۡ أُمِرُوٓاْ أَن يَكۡفُرُواْ بِهِۦۖ وَيُرِيدُ ٱلشَّيۡطَٰنُ أَن يُضِلَّهُمۡ ضَلَٰلَۢا بَعِيدٗا﴾ **[النساء: ٦٠]**.

سێیەم: ئەو کەسەی حوکم دەکات بە غەیری ئەوەی الله دایبەزاندووە، بەڵگەش فەرمایشتی الله تعالی-یە: ﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾ **[المائدة: ٤٤]**.

چوارەم: ئەو کەسەی بانگەشەی زانینی غەیب دەکات لەبڕی الله، بەڵگەش فەرمایشتی الله تعالی-یە: ﴿عَٰلِمُ ٱلۡغَيۡبِ فَلَا يُظۡهِرُ عَلَىٰ غَيۡبِهِۦٓ أَحَدًا﴾ ، ﴿إِلَّا مَنِ ٱرۡتَضَىٰ مِن رَّسُولٖ فَإِنَّهُۥ يَسۡلُكُ مِنۢ بَيۡنِ يَدَيۡهِ وَمِنۡ خَلۡفِهِۦ رَصَدٗا﴾ **[الجن: ٢٦-٢٧]**، وە الله تعالی

فەرموویەتی: ﴿وَعِندَهُۥ مَفَاتِحُ ٱلۡغَيۡبِ لَا يَعۡلَمُهَآ إِلَّا هُوَۚ وَيَعۡلَمُ مَا فِي ٱلۡبَرِّ وَٱلۡبَحۡرِۚ وَمَا تَسۡقُطُ مِن وَرَقَةٍ إِلَّا يَعۡلَمُهَا وَلَا حَبَّةٖ فِي ظُلُمَٰتِ ٱلۡأَرۡضِ وَلَا رَطۡبٖ وَلَا يَابِسٍ إِلَّا فِي كِتَٰبٖ مُّبِينٖ﴾ **[الأنعام: ٥٩]**.

پێنجەم: ئەو کەسەی لەبڕی الله دەپەرسترێ و ڕازیە بە عیبادەت بۆ کردنی، بەڵگەش فەرمایشتی الله تعالی-یە: ﴿وَمَن يَقُلۡ مِنۡهُمۡ إِنِّيٓ إِلَٰهٞ مِّن دُونِهِۦ فَذَٰلِكَ نَجۡزِيهِ جَهَنَّمَۚ كَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ **[الأنبياء: ٢٩]**.

**[الدرر السنية : 1/161-163]**

ووتم: شێخ محمد بن عبدالوهاب لەم سێ ووتەیەدا کە باسی هەندێک جۆری سەرەکی طاغوتەکان دەکات ئەگەرچی لەهەر سێ ووتەکەدا دەڵێ: پێنج دانەیان سەرەکین، بەڵام لەهەر ووتەیەکدا چەند دانەیەکی جیاواز دەژمێرێت، کە کۆکراوەکەی ئەمانەن:

١/ شەیتان

٢/ ئەوەی بانگەوازی خەڵکی دەکات بۆ پەرستنی خۆی

٣/ ئەوەی دەپەرسترێ و پێی ڕازیە

٤/ ئەوەی بانگەشەی زانینی غەیب دەکات

٥/ ئەو حاکمە زاڵمەی حوکمی الله دەگۆڕێت

٦/ ئەو حاکمەی حوکم بە زوڵم دەکات

٧/ ئەو حاکمەی حوکم بەوە ناکات کە الله دایبەزاندووە

٨/ ئەوەی بەرتیل دەخوات

٩/ ئەوەی کار دەکات بەبێ عیلم

کەواتە لێرەدا بۆمان دەردەکەوێ لە مەنهەجی شێخ محمد بن عبدالوهاب هەموو طاغوتێک کافر نیە، بەڵکو هەندێک لە تاوانبارانی گەورەش بە طاغوت ناو دەبات وەک لە

ووتەکانیدا دیارە، وە ئەگەر کەسێک بڵێ: نەخێر شێخ محمد هەموو ئەوانەی بە طاغوتی ناوبردوون بە کافری زانیون، ئەوا شێخی داوەتە پاڵ خەواریج، چونکە ناکرێ زانایەکی وەک شێخ محمد بڵێ: بەرتیل خۆر کافرە و لە سەرانی طاغوتە، ئەوەی خۆی لێ بەری نەکات و بە کافری نەزانێت کافر دەبێت، یان بڵێ ئەو حاکمەی زوڵم دەکات کافرە و لە سەرانی طاغوتە، یان بڵێ: ئەوەی کار بکات بەبێ عیلم ئەوا کافرە و لە سەرانی طاغوتە، بەپێی ئەم قسەیە بێت هەموو بیدعەچیەک کافرە و لە سەرانی طاغوتە چونکە بیدعەچی بەبێ عیلم کار دەکات، وە ناکرێ شێخ محمد بڵێ: ئەوەی حوکم نەکات بە قورئان بەبێ هیچ مەرجێک کافرە و لە سەرانی طاغوتە، چونکە ئەمە پێچەوانەی مەنهەجی سەلەف و پێچەوانەی ووتەکانی خۆیەتی، هەروەک لە ووتەکانی دواتری زیاتر ڕوونی دەکەینەوە.

جا ئەمە بڕاوەتەوە و بواری مشتومڕی تێدا نەماوە کە شێخ محمد بەرتیل خۆر و حاکمی زاڵم و ئەوەی کار دەکات بەبێ عیلم تەکفیر ناکات ئەگەرچی بە سەرانی طاغوتیش ناویان ببات، کەواتە زانیمان لە مەنهەجی شێخ هەموو طاغوتێک کافر نیە دەکرێ موسڵمانی تاوانباریش بە طاغوت ناوببرێت، هەر کەسێکیش بەم ووتەیە ڕازی نەبێت ئەوا هیچ چاری نیە تەنها ئەوە نەبێت کە شێخ بداتە پاڵ خەواریج، تەنانەت خەواریجیش هێندە توند نین خاوەنی ئەم تاوانانە بە سەرانی طاغوت ناو ببەن، کەواتە دەکرێ شێخ محمد کەسانی تریش بە طاغوت ناو ببات و بە کافریان نەزانێت، جا لەم سێ ووتەیەی شێخدا ئەوەی پەیوەستە بە بابەتی ئێمەوە ئەو حاکمەیە کە حوکم ناکات بە قورئان، کە شێخ ناوی بردووە بە طاغوت، ئایا ئەویش لەم جۆرانەیە کە بە تاوانبار هەژمارە لای شێخ یان مەبەستی پێی ئەو طاغوتەیە کە بەبێ کوفر پێکردنی کەس موسڵمان نابێت ؟

شێخ محمد لە ووتەی سێیەمی دا کە باسی پێنج دانە سەرەکیەکەی طاغوت دەکات، دووەم دانە باسی ئەو حاکمە دەکات کە حوکمی الله دەگۆڕێت، کە ئەمە گومان نیە لە کافر

بوونی، وە مەبەست لە گۆڕینی حوکمی الله-ش ئەوەیە بڵێ: دز سزاکەی دەست بڕین نیە لە قورئاندا بەڵکو سزاکەی بەند کردنە، نەک دان بەوە بنێت سزای دز دەست بڕینە لە قورئاندا بەڵام بڵێ لەبڕی دەست بڕین من بەندی دەکەم، ئەمەیان حوکم نەکردنە بە قورئان نەک گۆڕینی حوکمی الله، وە بۆ ئەمەش شێخ بەڵگە بە ئایەتی (٦٠)ی سورتی النساء دەهێنێتەوە کە دەربارەی أبو بردة الأسلمي کاهین یان کعب بن الأشرف-ی طاغوت یان هەردووکیان دابەزی، کە ئەم دووانە حوکمیان لەنێوان خەڵکی دەکرد بەو جۆرەی کە حوکمی ئەوان حوکمی الله-یە، نەک وەک دوو کەسی ئاسایی لێیان بڕوانن کە بە ئارەزووی خۆیان حوکم دەکەن، چونکە گەر وابوایە ئەوا خەڵکی ناچار نەبوون حوکم بەرنەوە بۆ لای دوو کەس کە وەک خۆیانن و هیچ تایبەتمەندییەکیان نیە، وە ناچار نەبوون بە حوکمی ئەم دووانە پابەند بن و بەرتیلیان پێ بدەن لە پێناوی حوکمدان لە بەرژەوەندی خۆیان، بەڵکو خەڵکی بەو نیەتە حوکمیان دەبردەوە بۆ لای ئەم دووانە کە ئەمانە وەحیان بۆ دێت و بە ناوی الله-وە حوکم دەکەن و حوکمەکانیان دەبێ قبوڵ بکرێت، جا ئەم جۆرەی کە شێخ باسی کرد طاغوتە و کافرە خیلافی تێدا نیە، پاشان شێخ محمد هەر لە هەمان ووتەیدا لە دانەی سێیەم باسی ئەو حاکمە دەکات کە حوکم بە غەیری قورئان دەکات، وە بەڵگە دەهێنێتەوە بە ئایەتی (٤٤)ی سورەتی المائدة، جا گەر شێخ مەبەستی لەمەش هەر ئەو طاغوتە بێت کە کوفر پێکردنی یەکێکە لە دوو ڕوکنەکەی (لا إله إلا الله) ئەوا پێویست بە دووبارە کردنەوەی ناکات چونکە لە دانەی دووەم باسی کرد، جا بەپێی ووتەکانی تری شێخ دەربارەی ئایەتەکەی المائدة کە ئێستا دەیهێنین، وە بە پێی ووتەکەی سلیمان بن سحمان دەربارەی هەڵوەشێنەرەوەی چوارەم، وە هێنانی ئەم جۆرە طاغوتە لەم سیاقەدا لەپاڵ طاغوتێکی تر لەگەڵ بەڵگە هێنانەوە بە ئایەتی (٤٤)ی المائدة، هەموو ئەمانە ئاماژەن بۆ ئەوەی کە شێخ محمد دانەی سێیەم کە ئەو حاکمەی حوکم ناکات بە قورئان بە کافری نازانێت ئەگەرچی بە سەرانی طاغوتیش ناوی ببات، هەروەک چۆن بەرتیل خۆر و حاکمی زاڵم و ئەو کەسەی کار دەکات بەبێ عیلم ناوی بردوون بە سەرانی طاغوت کەچی تەکفیریشیان ناکات، ئەمەش بەڵگەکان:

**محمد بن عبدالوهاب** دەڵێ:

الشالنجي دەڵێ: پرسیارم لە أحمد کرد دەربارەی ئەو کەسەی سورە لەسەر ئەنجامدانی تاوانە گەورەکان، ئایا لە ئیمان دەردەچێت و دەچێتە ناو ئیسلام ؟

ووتی: ئەم کەسە سورە لەسەر تاوان، وەک فەرموودەی پێغەمبەرﷺ وایە: (لا يزني الزاني حين يزني وهو مؤمن)، **وە وەک ووتەی ابن عباس** رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا **وایە:** ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَٰفِرُونَ﴾ **[المائدة: ٤٤].**

**الشالنجي دەڵێ: پێم ووت: ئەم کوفرە چیە ؟**

**ووتی: کوفرێکە لە دین دەرخەر نیە، وەک ئیمان هەندێک پلەی لە هەندێکی نزمترە.**

**[مختصر الإيمان الكبير : لاپەرە 137]**

ووتم: پێشتر ئەم ووتەیەمان نەقل کرد لە کتێبی (مسائل الإمام أحمد رواية الشالنجي) کە هەر یەکە لە محمد بن نصر المروزي و ابن القيم و ابن رجب نەقلیان کردووە و بەڵگەیان پێ هێناوەتەوە، هەروەها ابن تيمية-ش وەک دەبینن لە کتێبی (الإيمان) نەقلی کردووە و بەڵگەی پێ هێناوەتەوە، لەم کتێبەشدا کە شێخ محمد کتێبی (الإيمان)ی ابن تيمية-ی کورت کردۆتەوە بە هەمان شێوە ئەم ووتەیەی نەقل کردووە، هیچیشی لەسەر نەووتوە، مەحاڵیشە کەسێک ئەم خەڵکە بە کافر و سەرانی طاغوت بزانێت، وە کەسێکی تر ئەم خەڵکە بە موسڵمان بزانێت بڵێ کوفرەکەیان کوفری بچووکە، کەچی کەسی یەکەم ووتەی کەسی دووەم نەقل بکات و لە کتێبەکەی بهێنێت و لێی بێدەنگ بێت، هەر هیچ نەبوایە شێخ محمد لەکاتی کورتکردنەوەی کتێبەی ابن تيمية ئەم ووتەیەی نەدەهێنا چونکە پێچەوانەی عەقیدەکەیەتی، یان دەیهێنا و ڕەخنەی لێ دەگرت و ڕەددی دەدایەوە.

**محمد بن عبدالوهاب** دەڵێ:

الله فەرموویەتی: ﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾ وە گومان لەوە دانیە هەرکەسێک بڕوای وانەبێت کە حوکم کردن بەوەی الله دایبەزاندووە بەسەر پێغەمبەرەکەی واجبە ئەوا ئەم کەسە کافرە، **جا هەر کەسێک بە حەلالی بزانێت حوکم بکات لەنێوان خەڵکی بەوەی کە خۆی بە عەدلی دەزانێت بەبێ شوێنکەوتنی ئەوەی الله دایبەزاندووە، ئەوا ئەم کەسە کافرە**، هیچ ئوممەتێک نیە ئیللا فرمان دەکات بەوەی کە حوکم بە عەدل بکرێ، جا لەوانەیە عەدل لە دینی ئوممەتەکە ئەوە بێت کە گەورەکانیان بە عەدلی دەزانن، بەڵکو زۆرینەی ئەوانەی خۆیان داوەتە پاڵ ئیسلام حوکم بە عادەتەکانیان دەکەن کە الله سبحانە وتعالی داینەبەزاندووە، وەک عادەتی پێشینی دەشتەکیەکان، وەک فرمانی ئەوانەی کە گوێڕایەڵی دەکرێن لەناویاندا، **وە پێیان وایە ئەمە دەبێت حوکمی پێ بکرێ نەک قورئان و سوننەت، ئەمەش کوفرە**، زۆرێک لە خەڵکی موسڵمان بوونە بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا حوکم ناکەن تەنها بە عادەتە باوەکانی خۆیان نەبێ، ئەو عادەتانەی کە گوێڕایەڵی کراوەکان فرمانی پێ دەکەن، جا ئەمانە گەر زانیان دروست نیە حوکم بکرێ تەنها بەوەی الله دایبەزاندووە، وە پابەند نەبوون پێیەوە، **بەڵکو بە حەلالیان زانی حوکم بکەن بە پێچەوانەی ئەوەی الله دایبەزاندووە، ئەوا ئەمانە کافرن، وە ئەگەر نا جاهیلن هەروەک پێشتر باسکرا، بەڵام ئەو کەسەی کە پابەندە بە حوکمی الله و پێغەمبەرەکەی لە ناخ و ڕووکەشدا، بەڵام سەرپێچی دەکات و شوێنی ئارەزووی دەکەوێ، ئەوا ئەم کەسە لە پلەی تاوانبارەکانی**

**هاوشێوەیەتی، وە ئەم ئایەتە لەوانەیە کە خەواریجەکان بەڵگەی پێ دەهێننەوە بۆ تەکفیر کردنی ئەو کاربەدەستانەی کە حوکم ناکەن بەوەی الله دایبەزاندووە**، پاشان پێیان وایە بیروباوەڕی خۆیان حوکمی الله-یە.

[مؤلفات الشيخ الإمام محمد بن عبدالوهاب / ملحق المصنفات - مسائل التي لخصها الإمام الشيخ محمد بن عبدالوهاب من كلام شيخ الإسلام ابن تيمية : 147/13]

ووتم: لەم کتێبەدا شێخ محمد بن عبدالوهاب ووتەکانی ابن تيمية-ی پوخت کردۆتەوە لە چەند بابەتێکی جیاوازدا، ئەم ووتەیەش هەر ووتەی ابن تيمية-یە کە لە کتێبی (منهاج السنة النبوية)دا هەیە کە لە بەشی دووەمی ئەم کتێبەدا نەقلی دەکەین، جا ناکرێ ووتەکانی ابن تيمية کۆ بکاتەوە و پوختی بکاتەوە و بڵاوی بکاتەوە هیچ ڕەخنەیەکیشی لێ نەگرێت و لێی بێدەنگ بێت گەر عەقیدەکەی پێچەوانەی ئەم عەقیدەیە بێت، ئایا دەکرێ بووترێ شێخ محمد لەگەڵ ئەم ووتەیەدا نیە و دژیەتی ؟! کەواتە مەنهەجی شێخ محمد-یش موافقی سەلەفە لە بابەتی حوکم نەکردن بە قورئان و حوکم بردنەوە بۆ غەیری شەرعی الله.

بەڵام بەشێکی ئەم پوخت کردنەوەیە کێشەی تێدا هەیە، جا نازانم شێخ ئاوا پوختی کردۆتەوە یان هەڵەی محققەکانە یان دەستنوسەکە ئاوا بە دەستیان گەیشتووە، ابن تيمية باسی ئایەتی (٦٠)ی سورەتی النساء دەکات ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُمْ ءَامَنُوا۟ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ يُرِيدُونَ أَن يَتَحَاكَمُوٓا۟ إِلَى ٱلطَّٰغُوتِ وَقَدْ أُمِرُوٓا۟ أَن يَكْفُرُوا۟ بِهِۦ وَيُرِيدُ ٱلشَّيْطَٰنُ أَن يُضِلَّهُمْ ضَلَٰلًۢا بَعِيدًا﴾ دەڵێ: خەواریج بەڵگە بەم ئایەتە دەهێننەوە بۆ تەکفیر کردنی ئەو کار بەدەستانەی کە حوکم ناکەن بە قورئان، بەڵام شێخ محمد لە پوخت کردنەوەکەی ئایەتەکە ناهێنێت، ڕێک دەڵێ: خەواریج بەڵگە بەم ئایەتە دەهێننەوە بۆ تەکفیر کردنی ئەو کار بەدەستانەی کە حوکم ناکەن بە قورئان، خوێنەر نازانێ کام ئایەتە گەر نەگەڕێتەوە بۆ ئەصلی ووتەکەی ابن تيمية.

یەکێک لە قوتابیەکانی شێخ **محمد بن عبدالوهاب** دەڵێ:

ئیمام عبدالعزیز بن محمد بن سعود رَحِمَهُ اللهُ پرسیاری لە شێخ محمد کرد دەربارەی ئەو ئایەتانەی کۆتایی سورەتی هود، لە فەرمایشتی الله: ﴿وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ﴾ تا کۆتایی سورەتەکە [هود: ١١٠-١٢٣]. شێخ محمد قسەی لەسەرکرد بە جوانی، حەزم کرد بۆتانی نەقل بکەم.

پوختەی ووتەکە: شێخ محمد قسەی کرد لەسەر شێوازی ئەو خیلافەی کە الله زەمی کردووە لە قورئاندا، **وەک خەواریجەکان وایە کە بەڵگە دەهێننەوە بە ئایەتێک بۆ تەکفیرکردنی کەسی تاوانبار، وەک فەرمایشتی الله:** ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَٰفِرُونَ﴾ [المائدة: ٤٤]، ﴿إِنِ ٱلْحُكْمُ إِلَّا لِلَّهِ﴾ [الأنعام: ٥٧]، ﴿وَإِنْ أَطَعْتُمُوهُمْ إِنَّكُمْ لَمُشْرِكُونَ﴾ [الأنعام: ١٢١]، **وە پشت دەکەن لە ئایەتانێک کە تەکفیر نەکردنی تاوانباری تێدایە، یان تەئویلی دەکەن.**

**بڕوانە [الدرر السنية : 13/224-225]**

ووتم: عبدالعزیز بن محمد بن سعود، ئیمامێکی موەحید و موجاهید بووە، زۆربەی ناوچەکانی نەجدی فەتح کردووە، ئەمە عبدالعزیز-ی باوکی سەلمان نیە کە ئێستا پاشای سعودیە-یە، چونکە باوکی سەلمان ناوی عبدالعزیز-ە و ئەویش سەر بە بنەماڵەی آل سعود-ە، کە بە پێنج پشت دەگاتەوە بە ئیمام محمد بن سعود.

سەیری ئەو ئایەتانە بکە کە شێخ باسی کرد، هەر سێ ئایەت لە بابەتی حوکم کردن بە غەیری قورئان بەڵگەی پێ دەهێندرێتەوە لەلایەن زیادەڕەوەکان، جا ئایا دەکرێ شێخ بە بەڵگەی ئەم ئایەتەی المائدة ئەو حاکمە بە طاغوت ناو دەبات کە حوکم بە قورئان ناکات،

پاشان هەر خۆی بڵێ: خەواریج بەڵگە بەم ئایەتە دەهێننەوە ؟!
وە هەر زانایەک کە دەڵێ خەواریج بەڵگە بەم ئایەتە دەهێننەوە بۆ تەکفیر کردنی تاوانباران، مەبەستیان لە تاوانباران ئەوانەن کە حوکم ناکەن بە قورئان، نەک وابزانی تەنها مەبەستیان زینا و دزی و کوشتنە، چونکە ئەو کەسەی حوکم ناکات بە قورئان لە ئەصلدا تاوانبارە، بڕوانە شێخ محمد ئایەتی: ﴿إِنِ ٱلۡحُكۡمُ إِلَّا لِلَّهِ﴾ وەک نموونە هێنایەوە کە خەواریج تاوانبارانی پێ تەکفیر دەکەن، تۆی زیادەڕەو لەخۆتی بپرسە بەم ئایەتە دز و عەرەق خۆر تەکفیر دەکەیت یان حاکمەکان ؟ کەواتە بزانە شێخ محمد مەبەستی لە تاوانباران ئەوانەن کە حوکم ناکەن بە قورئان، چونکە دز و عەرەق خۆر هیچ پەیوەندیان بە ئایەتی: ﴿إِنِ ٱلۡحُكۡمُ إِلَّا لِلَّهِ﴾ نیە.

**ابن الجوزي** (دەربارەی سێ ئایەتەکەی سورەتی المائدة) دەڵێ:
مەبەست لە ووشەی کوفر لە ئایەتی یەکەمدا، دوو ووتە هەیە:
یەکێکیان: کوفرە بە الله تعالى، دووەمیان: کوفرە بەم حوکمە، بەڵام کوفرێک نیە لە دین دەرخەر بێت.
**وە یەکلا کردنەوەی بابەتەکە بەم جۆرەیە:** هەر کەسێک حوکم بەوە نەکات کە الله دایبەزاندووە **وەک ئینکاری لێ کردن**، وە بشزانێ الله ئەم حوکمەی دابەزاندووە، **هەروەک یەهود ئەنجامیاندا ئەوا کافرە**، وە هەر کەسێک حوکمی پێ نەکات و **بە دوای ئارەزووی بکەوێ بەبێ ئەوەی ئینکاری لە حوکمەکە بکات ئەوا زاڵم و فاسقە**، علي بن أبي طلحة لە **ابن عباس-ەوە** ڕیوایەتی کردووە کە دەڵێ: هەر کەسێک **ئینکاری** ئەوە بکات کە الله دایبەزاندووە ئەوا **کافر بووە**، وە هەر کەسێک **دانی پێ بنێت و حوکمی پێ نەکات ئەوا فاسق و زاڵمە.**
**[زاد المسير : لاپەرە 386]**

**ابن الجوزي** دەڵێ:

﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ﴾ هەر کەسێک حوکم بەوە نەکات کە الله دایبەزاندووە **ئینکاری لێ بکات ئەوا کافرە، وە ئەگەر لایدا بۆ ئارەزووەکانی بەبێ ئینکاری کردن ئەوا زاڵم و فاسقە.**

**[تذكرة الأريب في تفسير الغريب : لاپەرە 83]**

ووتم: زیادەڕەوەکان لە تەفسیری ئایەتی (٢٦)ی سورەتی الکهف: ﴿وَلَا يُشۡرِكُ فِي حُكۡمِهِۦٓ أَحَدٗا﴾ تەفسیری ابن الجوزي دەکەن بە بەڵگە کە دەڵێ: جائیز نیە حاکم حوکم بکات بە غەیری ئەوەی الله حوکمی داوە، وە بۆ هیچ کەسێک نیە حوکم بکات لەلایەن خۆیەوە، جا دەبێتە شەریکی الله عز وجل لە حوکمیدا. **[زاد المسير : لاپەرە 848]**

دەڵێین: گەر ابن الجوزي مەبەستی ئەوە بێت ئەوەی حوکم بە غەیری قورئان بکات خۆی کردۆتە شەریکی الله، ئەوا لە تەفسیری ئایەتەکەی المائدة ئینکار کردنی حوکمی الله-ی نەدەکردە مەرجی تەکفیر، جا لێرەدا مەبەستی ئەوەیە هەر کەسێک لەلایەن خۆیەوە حوکم بکات بڵێ ئەمە حەرامە و ئەوە حەلالە ئەوا خۆی کردۆتە شەریکی الله لە حوکمیدا، نەک تەنها بە حوکم کردن بە غەیری قورئان ببێتە شەریکی الله لە کاتێکدا حوکمی خۆی نەداتە پاڵ شەرعی الله، هەروەک لە ووتەی داهاتووی شێخ محمد بن عبدالوهاب دەیهێنین.

**محمد بن عبدالوهاب** دەڵێ:

﴿وَلَا يُشۡرِكُ فِي حُكۡمِهِۦٓ أَحَدٗا﴾ **[الكهف: ٢٦]**، نەهی تێدایە لەوەی کە مەخلوق بکرێتە شەریک لە حوکمی الله، گەر بە قیرائەتی ﴿وَلَا تُشۡرِكۡ﴾ بخوێندرێتەوە.

**[مؤلفات الشيخ الإمام محمد بن عبدالوهاب / تفسير آيات من القرآن الكريم : 248/5]**

**الماوردي** (دوای نەقل کردنی سێ ووتەی سەلەف دەربارەی ئایەتەکە) پاشان دەڵێ:

ووتەی چوارەم: هەر کەسێک حوکم بەوە نەکات کە الله دایبەزاندووە ئینکاری لێ بکات ئەوا کافرە، وە هەرکەسێک دانی پێ بنێت ئەوا زاڵم و فاسقە. **ئەمەش ووتەی ابن عباس-ە.**

**[النكت والعيون : 43/2]**

**ابن القيم** دەڵێ:

کوفر دوو جۆرە: کوفری گەورە و کوفری بچووک، کوفری گەورە دەبێتە هۆی مانەوەی تاهەتایی لە دۆزەخ، وە کوفری بچووک دەبێتە هۆی شایستە بوونی هەڕەشە بەبێ مانەوەی تاهەتایی لە دۆزەخ، هەروەک لە فەرمایشتی الله تعالى هاتووە کە پێشتر ئەم ئایەتە دەخوێندرایەوە دواتر لەفزەکەی نەسخ بوویەوە (لا ترغبوا عن آبائكم فإنه كفر بكم)، وە فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ : (اثنتان في أمتي هما بهم كفر: الطعن في النسب، والنياحة)، وە فەرموودەی لە سونەندا: (من أتى امرأة في دبرها فقد كفر بما أنزل على محمد)، وە لە فەرموودەیەکی تردا: (من أتى كاهنا أو عرافا فصدقه بما يقول، فقد كفر بما أنزل الله على محمد)، وە فەرموودەی: (لا ترجعوا بعدي كفارا يضرب بعضكم رقاب بعض)، **وە ئەمە تەئویلی ابن عباس و تەواوی هاوەڵانە دەربارەی فەرمایشتی الله تعالى:** ﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾ **ابن عباس دەڵێ: کوفرێک نیە لە دین دەرخەر بێت، بەڵکو گەر ئەنجامیدا ئەوا کوفرە بەڵام وەک ئەو کەسە نیە کە کافر بێت بە الله و ڕۆژی دوایی.**

**وە طاوس-یش هەمان شتی ووتوە.**

**وە عطاء دەڵێ: كفر دون كفر، وظلم دون ظلم، وفسق دون فسق-ە.**

وە هەیانە تەئویلی كردووە لەسەر واز هێنان لە حوكم كردن بەوەی الله دایبەزاندووە وەک ئینكار كردن لێی، ئەمەش ووتەی عكرمة-یە، ئەمەش تەئویلێكی پەسەند نیە، چونكە خودی ئینكاری كردنەكە كوفرە جا حوكمی پێ بكات یان نەیكات.

وە هەیانە تەئویلی كردووە لەسەر واز هێنان لە حوكم كردن بە هەموو ئەو شتانەی كە الله دایبەزاندووە، حوكم كردن بە تەوحید و ئیسلامیش دەچێتە ناویەوە، ئەمەش تەئویلی عبدالعزیز الكناني-ە، ئەمەش تەئویلێكی دوورە، چونكە هەڕەشەكە لەسەر حوكم نەكردنە بە قورئان، ئەمەش پەكخستنی حوكم بە هەموو قورئان و بە بەشێكی قورئانیش دەگرێتەوە.

وە هەیانە تەئویلی كردووە لەسەر حوكم كردن بە پێچەوانەی دەق بە ئەنقەست بەبێ جاهیل بوون پێی و هەڵە كردن لە تەئویل، ئەمەش البغوي گێڕاویەتیەوە لە زانایان بە گشتی.

وە هەیانە تەئویلی كردووە لەسەر ئەهلی كیتاب، ئەمەش ووتەی قتادة و الضحاك و جگە لەوانیشە، ئەمەش دوورە و پێچەوانەی ڕووكەشی لەفزەكەیە بۆیە بۆی ناچێت.

وە هەیانە كردوویەتی بە كوفرێک كە لە دین دەرخەرە.

**وە ئەوەی دروستە: حوكم كردن بە غەیری ئەوەی كە الله دایبەزاندووە هەردووک كوفرەكە دەگرێتەوە بچووک و گەورە بەپێی حاڵی حاكمەكە، گەر پێی وابێت حوكم كردن بەوەی الله دایبەزاندووە لەم ڕووداوەی كە ڕوویداوە واجبە، بەڵام لێی لا بدات و سەرپێچی بكات لەگەڵ دان پێدانانی بەوەی كە شایستەی سزایە، ئەمە كوفری بچووكە، وە ئەگەر پێی وابێت واجب نیە و**

**ئەو سەر پشکە تێیدا لەگەڵ دڵنیا بوونی کە ئەمە حوکمی الله-یە، ئەمەیان کوفری گەورەیە، وە ئەگەر حوکمی الله نەزانێت و هەڵەی تێدا بکات ئەوا هەڵەکارە و حوکمی هەڵەکارانی هەیە.**

**[مدارج السالكين : 1/344-346]**

ووتم: پێم سەیرە ابن القيم هەندێک لە ووتەکانی سەلەف نەقل دەکات و بە مەرجوحی دەزانێت، وەک ئەوەی ئەم ئایەتە دەربارەی ئەهلی کیتاب دابەزیوە کە ئەمە فەرموودەیەی لەسەر هاتووە و زۆرینەی هاوەڵان و تابعین و سەلەف و خەلەف لەسەر ئەمەن، کەچی ابن القيم داویەتیە پاڵ قتادة و الضحاك و هەندێکی تر بەڵام پەسەندی نەکردووە، یان ئەو ووتەیەی کە دەڵێ گەر ئینکاری حوکمی الله بکات کافرە، کە ئەمە ووتەی ابن عباس-ە کەچی ابن القيم دەیداتە پاڵ عكرمة و بە پەسەندی نازانێت، جا لەڕووی ئاراستە کردنی ووتەکانی سەلەف دەربارەی ئەم ئایەتە ابن القيم نەیپێکاوە چونکە خەریکە ئیجماع دروست بێت کە ئەم ئایەتە دەربارەی ئەهلی کیتاب دابەزیوە کەچی ابن القيم دەڵێ ئەمە دوورە و پێچەوانەی ڕووکەشی ئایەتەکەیە !!! ئەو هاوەڵانەی لەگەڵ پێغەمبەر بوون ڕەجم کردنی دوو زیناکەرە یەهودیەکەیان بینی و ئامادەی دابەزینی ئەم ئایەتە بوون ووتەکەیان دوورە لە صەواب ؟!!!

سەرەڕای هەڵە کردنی ابن القيم لە ئاراستە کردنی ووتەکانی سەلەف دەربارەی ئایەتەکە و سەبەب نزولەکەی بەڵام ئەمە مانای ئەوە نیە کە ابن القيم لە حوکمدا خیلافی سەلەف بێت دەربارەی ئایەتەکە، هەروەک بینیتان کاتێک کوفری ناو ئایەتەکەی بە کوفری بچووک تەفسیر کرد ووتی ئەمە ووتەی ابن عباس و تەواوی هاوەڵانە، واتا ابن القيم لە ڕووی حوکمەوە دان بەوە دەنێت کە ابن عباس و تەواوی هاوەڵان کوفری ئەم ئایەتەیان بە کوفری بچووک داناوە، ئینجا دواتر کە تەفصیل دەدات بە بابەتەکە و کوفرەکە بە پێی حاڵی حاکمەکە دابەش دەکات بۆ کوفری گەورە و کوفری بچووک، حوکم نەکردن بە قورئان بە کوفری بچووک دادەنێت، بەڵام گەر پێی وابێت لەسەری واجب نیە حوکم بکات بە قورئان ئەوکات دەبێتە کوفری

گەورە، کەواتە لە حوکمدا موافقی سەلەفە ئەگەرچی لە سەبەب نزول و ئاڕاستە کردنی ووتەکانیان هاوڕایان نەبێت.

**السمرقندي** دەڵێ:

**ابن عباس دەڵێ: هەرکەسێک ئینکاری شتێک بکات لە حدودەکانی الله ئەوا کافربووە، وە ئەوەی دانی پێ بنێت و حوکمی پێ نەکات ئەوا فاسقە.**

وکیع لە سفیان ڕیوایەتی کردووە کە دەڵێ: بە حذیفة ووترا: ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَٰفِرُونَ﴾ دەربارەی بەنی ئیسرائیل دابەزیوە، حذیفة ووتی: باشترین برا بۆ ئێوە بەنی ئیسرائیلە، هەرچی شیرینی هەیە بۆ ئێوە بێت و تاڵیش بۆ ئەوان، ڕێبازی ئەوان دەگرنە بەر بە قەدەر قەیتانی نەعل.

**السمرقندي دەڵێ: واتا ئەم ئایەتە گشتیە، هەرکەسێک ئینکاری حوکمی الله بکات ئەوا لە کافرانە.**

[بحر العلوم: 439/1]

ووتم: بڕوانە السمرقندي چۆن لە ووتەکەی حذیفة تێگەیشتووە کە دەڵێ: تەنها بۆ بەنی ئیسرائیل نیە بۆ ئێوەشە، واتا گەر ئێمەش وەک ئەوان ئینکاری حوکمی الله بکەین ئەوا کافر دەبین.

**ابن کثیر** دەڵێ:

﴿وَكَتَبْنَا عَلَيْهِمْ فِيهَآ أَنَّ ٱلنَّفْسَ بِٱلنَّفْسِ وَٱلْعَيْنَ بِٱلْعَيْنِ وَٱلْأَنفَ بِٱلْأَنفِ وَٱلْأُذُنَ بِٱلْأُذُنِ وَٱلسِّنَّ بِٱلسِّنِّ وَٱلْجُرُوحَ قِصَاصٌ ۚ فَمَن تَصَدَّقَ بِهِۦ فَهُوَ كَفَّارَةٌ لَّهُۥ ۚ وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ

هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ﴾ ئەمەش هەروەها لەوانەیە کە یەهودی پێ سەرزەنشت و عەیبدار کرا، چونکە ئەوان دەقی تەوراتیان لەلا هەیە کە تێیدا هاتووە: نەفس بە نەفس دەکوژرێتەوە، ئەوانیش موخالەفەی ئەم حوکمە دەکەن بە ئەنقەست و **بە عینادی**، بەنی قریظة دەکوژنەوە گەر کەسێکی بەنی النضیر بکوژێ، بەڵام بەنی النضیر ناکوژنەوە گەر کەسێکی بەنی قریظة بکوژێ، بەڵکو حەقی خوێنەکەی لێوەر دەگرن، هەروەک چۆن موخالەفەی دەقی حوکمی تەوراتیان کرد دەربارەی ڕەجم کردنی زیناکەری خێزاندار، لایاندا لێی بۆ ئەو حوکمەی کە خۆیان لەسەری ڕێککەوتن لە قامچی لێدان و ڕوو ڕەش کردن و گەڕاندنی بەناو خەڵکدا، هەر بۆیە الله لەوێدا فەرمووی: ﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾ **چونکە ئەوان ئینکاری حوکمی الله-یان کرد بە مەبەست و عینادی و ئەنقەستەوە**، وە لێرەدا فەرمووی: ﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ﴾ چونکە حەقی مەزڵومیان لە زاڵم نەسەندەوە لەو کارەی کە الله فرمانی کردووە بە عەدل و یەکسانی لەنێوان هەمووواندا، جا موخالەفەیان کرد و زوڵمیان کرد و هەندێکیان دەست درێژیان کردە سەر هەندێکیان.

**[تفسير ابن كثير : 120/3]**

**ابن كثير** دەڵێ:

﴿أَفَحُكۡمَ ٱلۡجَٰهِلِيَّةِ يَبۡغُونَۚ وَمَنۡ أَحۡسَنُ مِنَ ٱللَّهِ حُكۡمٗا لِّقَوۡمٖ يُوقِنُونَ﴾ **[المائدة: ٥٠]**، الله تعالى سەرزەنشتی ئەو کەسە دەکات کە دەرچووە لە حوکمی پتەوی الله کە هەموو خێرێکی لەخۆگرتووە، نەهی دەکات لە هەموو خراپەیەک، چووە بەرەو شتانی تر لە ڕەئی و ئارەزوو و ڕێککەوتنەکان کە پیاوان دایانهێناوە بەبێ هیچ پاڵپشتێک لە شەریعەتی الله،

هەروەک چۆن ئەهلی جاهیلی حوکمیان پێی دەکرد لە گومڕاییەکان و جەهلەکان کە بە ڕەئی و ئارەزووی خۆیان دایان دەهێنا، وە هەروەک چۆن مەغۆل حوکمیان پێی دەکرد لە سیاسەتە پاشاییەکان کە لە پاشاکەیان جەنگیز خان وەریان گرتبوو، یاسقی بۆ دانان کە بریتیە لە کتێبێکی کۆکراوە لە ئەحکامەکان کە لە چەند شەریعەتێکی جیاواز وەری گرتووە، لە شەریعەتی یەهودی و نەصرانی و دینی ئیسلام، وە زۆر حوکمی تێدایە کە تەنها لە بیروڕا و ئارەزووی خۆی وەری گرتووە، **جا لەناو نەوەکانی بووە شەرعێک کە شوێنی دەکەوتن، پێشیان دەخست بەسەر حوکم کردن بە کتێبی الله و سوننەتی پێغەمبەرەکەی ﷺ**، جا هەر کەسێک وابکات لەوان ئەوا کافرە واجبە شەڕی لەگەڵ بکرێت تا دەگەڕێتەوە بۆ حوکمی الله و پێغەمبەرەکەی، جگە لەم دووانە حوکم بە هیچی تر ناکات نە لە کەم و نە لە زۆر.

[تفسیر ابن کثیر : 131/3]

ووتم: لە بەشی دووەم قسە لەسەر ئەم ووتەیەی ابن کثیر دەکەین کە زیادەڕەوەکان کردوویانەتە بەڵگە بۆ خۆیان، لێرەدا تەنها بە کورتی ئاماژەیەکی پێدەدەم، ابن کثیر کە دەڵێ: (پێشی دەخەن بەسەر حوکمی قورئان و سوننەت) ئەم پێش خستنە واتا فەزیل کردنی بەسەر قورئان و سوننەت، هەروەک لە ووتەی دواتریش ئاماژەی پێ دەدات.

**ابن کثیر** (دەبارەی ئایەتەکانی ٤١ تا ٤٤ لە سورەتی المائدة) دەڵێ:

ئەم ئایەتە بەڕێزانە دابەزین دەربارەی ئەوانەی کە بە خێرایی بەرەو کوفر دەڕۆن، دەرچوونە لە گوێڕایەڵی الله و پێغەمبەرەکەی، **ڕەئی و ئارەزووی خۆیان پێشخستوە بەسەر شەرائیعەکانی الله عز وجل.**

[تفسير ابن كثير : 113/3]

ووتم: ابن كثیر لە تەفسیری ئایەتی (٤٥)ی المائدة کە کەمێک پێش ئێستا هێنامان باسی ئەوەی کرد کە یەهود ئینکاری حوکمی الله-یان دەکرد بە ئەنقەست و عینادیەوە بۆیە بە الکافرون وەصف کران، کەواتە ابن كثیر دەزانێ حاڵی یەهود چۆن بووە، بۆیە ناکرێ کوفرەکەیان تەنها پەیوەست بکات بە حوکم نەکردن بە تەورات بەبێ باسکردنی هیچ مەرجێک، کەواتە بزانە (پێش خستن) لەلای ابن كثیر بە مانای بەند و مەرج دێت هەروەک لە بەشی دووەم بە درێژتر باسی دەکەین.

**حمد بن عتيق** (دوای نەقل کردنی ووتەی پێشووی ابن كثیر) پاشان دەڵێ:

منیش دەڵێم: زۆربەی خەڵکی دەشتەکی و هاوشێوەکانیان وەک مەغۆلەکان کەوتوونەتە ناو ئەم حاڵەوە لە حوکم بردنەوەیان بۆ عادەتی باب و باپیرانیان و ئەو شتانەی کەسانی پێشوویان دایانناوە کە دانراوێکی مەلعونە، **پێی دەڵێن: (شرع الرفاقة) پێشی دەخەن بەسەر کتێبی الله و سوننەتی پێغەمبەرەکەی ﷺ**، هەر کەسێک ئەم کارە بکات ئەوا کافرە، واجبە شەڕی لەگەڵ بکرێت تاکو دەگەڕێتەوە بۆ حوکمی الله و پێغەمبەرەکەی.

بڕوانە [سبيل النجاة والفكاك : لاپەرە 83-84]

**القاسمي** دوای نەقل کردنی چەند ووتەیەک دەربارەی ئایەتی: ﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾ پاشان دەڵێ:

ووتەی پێنجەم: **کوفری ئەو کەسەی کە حوکم دەکات بە غەیری ئەوەی الله دایبەزاندووە بەندە بە سوکایەتی کردن بە حوکمەکە و ئینکاری کردنی، ئەم ووتەیەش زۆرینەی زانایان بۆی چوونە، وە لە عکرمة و ابن عباس ڕیوایەتیان کردووە.**

وە الحاکم و ابن أبي حاتم و عبدالرزاق لە ابن عباس و طاوس ڕیوایەتیان کردووە: هەر کەسێک حوکم بەوە نەکات کە الله دایبەزاندووە، ئەوا کوفری کردووە **بەڵام کوفرێک نیە لە دین دەرخەر بێت، وەک ئەو کەسەی کە کافرە بە الله و فریشتەکانی و کتێبەکانی و پێغەمبەرانی و ڕۆژی دوایی**، وە نزیک لەمەوە الثوري ڕیوایەتی کردووە لە عطاء دەڵێ: **کفر دون کفر، و ظلم دون ظلم، و فسق دون فسق-ە**، ابن جریر ڕیوایەتی کردووە.

وە لە (اللباب) نەقلی کردووە لە ابن مسعود و الحسن و النخعي: ئەم سێ ئایەتە گشتین یەهود و ئەم ئوممەتەش دەگرێتەوە، **هەر کەسێک بەرتیل وەربگرێ و حوکمی الله بگۆڕێ و حوکم بە غەیری حوکمی الله بکات ئەوا کوفر و زوڵم و فسقی کردووە، السدي بۆ ئەم ووتەیە ڕۆیشتووە**، چونکە ڕووکەشی ئایەتەکە وایە، پاشان دەڵێ: (واتا خاوەنی کتێبی اللباب وادەڵێ) وە ووتراوە: ئەم ووتەیە بۆ ئەو کەسەیە کە دەقی حوکمی الله دەزانێت پاشان بە ئاشکرا **ڕەتی دەکاتەوە بە ئەنقەست**، وە حوکمی بە غەیری ئەو دەکات، بەڵام کەسێک دەقی حوکمی الله-ی لێ شاراوە بێت یان هەڵە بکات لە تەئویل، ئەوا ئەم هەڕەشەیە نایگرێتەوە.

**[محاسن التأويل : لاپەرە 1999]**

ووتم: کە دەڵێ لە (اللباب) نەقلی کردووە، مەبەستی تەفسیری الخازن-ە، کە ئەمە ناوەکەیەتی: (لباب التأويل في معاني التنزيل).
القاسمي-ش ووتەکەی السدي تەئویل کرد کە مەبەست پێی ئەوەیە حوکمی الله بگۆڕێ ئینجا کافرە، نەک بە ڕەهایی کافر بێت بەبێ هیچ مەرجێک.

**البغوي** دەڵێ:
مقاتل بن حيان دەڵێ: الله فرمانی بە عابید و زاناکانی یەهود کرد حوکم بکەن بەوەی کە لە تەوراتدا هەیە، وە فرمانی کرد بە قەشە و عابیدەکانی نەصارا حوکم بکەن بەوەی کە لە ئینجیلدا هەیە، **جا کافر بوون ووتیان: عزیر کوڕی الله-یە و مەسیح کوڕی الله-یە،** ﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ﴾ الفاسقون واتا: دەرچوون لە فرمانی الله تعالى.
[تفسير البغوي : 65/3]

ووتم: بڕوانە مقاتل بن حيان ووتنی عزیر کوڕی الله-یە لەلایەن یەهودەوە، وە ووتنی عیسی کوڕی الله-یە لەلایەن نەصاراوە بە حوکم نەکردن بە تەوروات و ئینجیل دادەنێت، کە ئەمانە دوو کوفری گەورە و ئاشکران، نەک تەنها جێبەجێ کردنی حەددەکان بە حوکمی الله دابنێت، وەک ئەوەی ئەمڕۆ باوە بەر لەوەی باسی حوکم نەکردن بە تەوحید بکەن باسی حوکم نەکردن بە دەست بڕینی دەستی دز و هاوشێوەی ئەم حەددانە دەکەن ! کەچی مقاتل بن حيان ئەم دوو کوفرە گەورەی یەهود و نەصارا وەک نموونە باس دەکات لە حوکم نەکردنیان بە تەورات و ئینجیل، وەک پێشتریش عبدالعزيز الكناني باسی کرد گەر حوکم بکات بە تەوحید و واز هێنان لە شیرک ئەوا موسڵمانە ئەگەرچی حوکم نەکات بە باقی شەرائیعەکانی تر، بەڵام گەر کار بە هەموو حوکمێکی ئیسلام بکات حوکم بە تەوحید و واز هێنان لە شیرک نەکات کافرە.

**الألوسي** دەربارەی ئایەتی: ﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾ دەڵێ:

**خەواریجەکان بەڵگەیان هێنایەوە بەم ئایەتە لەسەر ئەوەی کە کەسی فاسق کافرە ئیماندار نیە**، شێوازی بەڵگە هێنانەوەیان بەم ئایەتە بەم جۆرەیە: (مَن) عامە هەموو ئەو کەسانە دەگرێتەوە کە حوکم ناکەن بەوەی الله تعالى دایبەزاندووە، **جا فاسقێک کە بڕوای بە حوکمی الله-ش هەبێت هەر دەیگرێتەوە چونکە حوکم و کاری نەکردووە بەوەی کە الله تعالى دایبەزاندووە.**

**وە وەڵامی خەواریجەکان دراوەتەوە بەوەی کە ڕووکەشی ئایەتەکە وازی لێ دەهێنرێت**، حوکم ئەگەرچی کردەوەی دڵ و ئەندامەکان دەگرێتەوە، بەڵام لێرەدا مەبەست پێی کردەوەی دڵە، **کە ئەویش بڕوا بوونە بە حوکمەکە**، وە هیچ ناکۆکیەک نیە لە کافر بوونی ئەو کەسەی بڕوای بەوە نەبێت کە الله تعالى دایبەزاندووە.

[روح المعاني: 7/217-218]

**الألوسي** دەڵێ:

أبو حميد و جگە لەویش ڕیوایەتیان کردووە لە الشعبي کە دەڵێ: سێ ئایەتەکەی سورەتی المائدة یەکەمیان بۆ ئەم ئوممەتەیە، وە دووەمیان دەربارەی یەهود دابەزیوە، وە سێیەمیان دەربارەی نەصارا دابەزیوە.

جا بە پێی ئەم ووتەیە دەبێت ئیمانداران حاڵیان خراپتر بێ لە یەهود و نەصارا، **بەڵام ووتراوە: (کوفر) گەر درایە پاڵ ئیمانداران ئەوا بە توندی و گەورەیی تاوان**

**لێک دەدرێتەوە**، وە کافر کاتێک بە فسق و زوڵم وەصف دەکرێ هەست بە سنور بەزاندن و یاخی بوونی دەکرێ، وە ئەوەی پاڵپشتی ئەم ووتەیە دەکات ئەوەیە کە ابن المنذر والحاكم ڕیوایەتیان کردووە، وە الحاكم بە صەحیحی داناوە، وە البيهقي ڕیوایەتی کردووە لە سونەنەکەی لە ابن عباس-ەوە رضي الله عنهما دەربارەی ئەو کوفرەی کە لە ئایەتی یەکەم هاتووە وتوویەتی: **ئەو کوفرە نیە کە ئێوە بۆی دەچن، ئەمە کوفرێک نیە لە دین دەرخەر بێت، كفر دون كفر-ە.**

**[روح المعاني : 7/218-219]**

ووتم: نازانم (أبو حميد) کێیە، ڕەنگە مەبەستی (ابن حميد) بێت واتا عبد بن حميد، بەڵام لە چاپ هەڵە کرابێ یان لە دەستنوسەکە ئاوا هاتبێ، والله أعلم.

**محمد الأمين الشنقيطي** دەڵێ:

ئەوەی دیارە و دێتە پێشەوە لە سیاقی ئایەتەکان ئەوەیە کە ئایەتی: ﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَٰفِرُونَ﴾ دەربارەی موسڵمانان دابەزیوە، چونکە الله تعالى پێش ئەمە بە موسڵمانانی ئەم ئوممەتە دەفەرمووێ: ﴿فَلَا تَخْشَوُاْ ٱلنَّاسَ وَٱخْشَوْنِ وَلَا تَشْتَرُواْ بِـَٔايَٰتِي ثَمَنًا قَلِيلًاۚ﴾ پاشان فەرمووی: ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَٰفِرُونَ﴾ جا ووتەکە بۆ موسڵمانانە هەروەک دیارە و دێتە پێشەوە لە سیاقی ئایەتەکەدا، جا بە پێی ئەمە کوفرەکە یان کوفری بچووکە، وە یان حوکم ناکات بە قورئان و بە حەلالی دەزانێت، یان مەبەستی ئینکاری کردن و ڕەتکردنەوەی حوکمەکانی الله-یە، سەرەڕای زانینی حوکمی الله، **بەڵام ئەوەی حوکم بکات بە غەیری حوکمی الله، وە بشزانێ تاوانی ئەنجام داوە و کارێکی ناشرینی کردووە، بەڵکو ئارەزوو وای لێکردووە وابکات،**

**ئەوا ئەم کەسە لە باقی موسڵمانە تاوانبارەکانە.**

**[أضواء البیان : 124/2]**

**محمد الأمين الشنقيطي** دەڵێ:

بزانە کە ووتەی دروست و تەواو لەم بابەتەدا ئەوەیە کە کوفر و زوڵم و فسق هەر یەکێک لەمانە لەوانەیە بە ڕەهایی بەکار بێت لە شەرعدا، جارێک مەبەست پێی تاوان بێ، جارێکیش مەبەست پێی کوفری لە دین دەرخەر بێت، ﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ﴾ ئەوەی حوکم بەوە نەکات کە الله دایبەزاندووە **بە صیفەتی دژایەتی کردنی پێغەمبەران و بەتاڵ کردنەوەی حوکمەکانی الله، ئەوا ئەم کەسە زوڵمەکەی و فسقەکەی و کوفرەکەی هەمووی کوفری لە دین دەرخەرە، وە ئەوەی حوکم بەوە نەکات کە الله دایبەزاندووە بڕوای وابێت کە حەڕامێکی ئەنجام داوە، کارێکی ناشرینی کردووە، ئەوا کوفرەکەی و زوڵمەکەی و فسقەکەی لە دین دەرخەر نین.**

**[أضواء البیان : 125/2]**

**محمد الأمين الشنقيطي** دەڵێ:

پێشتر باسمان کرد کە عیبرەت بە گشتگیری لەفزەکانە نەک تایبەت کردنی سەبەب نزول، **جا هەر کەسێک حوکم نەکردنی بەوەی الله دایبەزاندووە بە مەبەستی دژایەتی کردن و ڕەتکردنەوەی حوکمی الله و پابەند نەبوون بێت پێیەوە، ئەوا کافر و زاڵم و فاسقە، هەمووی بە مانای دەرچوون لە دین دێت، وە هەر**

**کەسێک حوکم نەکردنی بەهۆی ئارەزوو بێت و بڕوای وابێت کە کارەکەی ناشرینە، ئەوا کوفرەکەی وزوڵمەکەی وفسقەکەی لە دین دەرخەر نین**، تەنها ئەوە نەبێت ئەو شتەی کە حوکمی پێ ناکات مەرجی دروستی ئیمانی بێت، وەک بڕوا نەبوون بەو شتەی کە دەبێت بڕوای پێی هەبێت.

[أضواء البيان : 131/2]

ووتم: کە دەڵێ: (تەنها ئەوە نەبێت ئەو شتەی کە حوکمی پێ ناکات مەرجی دروستی ئیمانی بێت، وەک بڕوا نەبوون بەو شتەی کە دەبێت بڕوای پێی هەبێت)، ئەمە هەمان مانای ووتەکەی عبدالعزيز الكناني-ە، واتا گەر خودی شتەکە پەیوەست بوو بە ئیمانەوە، نەبوونی ئەم شتە ئیمانی نەهێشت، ئەوا دەبێت حوکم بەو شتە بکرێ چونکە بێ ئەمە ئیمان دانامەزرێت وەک تەوحید، بەڵام باقی حوکمەکانی تر گەرکاری پێ نەکات ئەوا تاوانن و کوفر نین گەر هەبوونیان پەیوەست نەبوون بە هەبوونی ئیمان.

**محمد الأمين الشنقيطي** دەڵێ:

لەم ئایەتانە و فەرمایشتی: ﴿وَلَا يُشۡرِكُ فِي حُكۡمِهِۦٓ أَحَدٗا﴾ **[الكهف: ٢٦]**، تێدەگەین کە شوێنکەوتووانی حوکمی تەشریع دانەران جگە لەو تەشریعەی کە الله دایناوە هاوبەشیان بۆ الله داناوە، ئەم تێگەیشتنەش بە ڕوونی هاتووە لە ئایەتانی تردا، وەک فەرمایشتی الله دەربارەی ئەو کەسەی شوێنی تەشریعی شەیتان دەکەوێ لە حەلال کردنی گۆشتی ئاژەڵی مردارەوە بوو بە بیانووی ئەوەی ئەمە سەربڕاوی الله-یە، ﴿وَلَا تَأۡكُلُواْ مِمَّا لَمۡ يُذۡكَرِ ٱسۡمُ ٱللَّهِ عَلَيۡهِ وَإِنَّهُۥ لَفِسۡقٞۗ وَإِنَّ ٱلشَّيَٰطِينَ لَيُوحُونَ إِلَىٰٓ أَوۡلِيَآئِهِمۡ لِيُجَٰدِلُوكُمۡۖ وَإِنۡ أَطَعۡتُمُوهُمۡ إِنَّكُمۡ لَمُشۡرِكُونَ﴾ **[الأنعام: ١٢١]**، الله بە ڕوونی فەرمووی کە ئەوان

موشریكن بە گوێڕایەڵی كردنیان بۆ شەیتان، وە ئەم هاوبەش دانانە بۆ الله لە گوێڕایەڵی كردندا و شوێنكەوتنی تەشریعێكی پێچەوانەی ئەو تەشریعەی الله دایناوە ئەمەیە مەبەست پێی لە پەرستنی شەیتان لە فەرمایشتی الله تعالی: ﴿أَلَمْ أَعْهَدْ إِلَيْكُمْ يَٰبَنِىٓ ءَادَمَ أَن لَّا تَعْبُدُوا۟ ٱلشَّيْطَٰنَ ۖ إِنَّهُۥ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ﴾ ، ﴿وَأَنِ ٱعْبُدُونِى ۚ هَٰذَا صِرَٰطٌ مُّسْتَقِيمٌ﴾ [يس: ٦٠-٦١]، وە فەرمایشتی الله تعالی دەربارەی پێغەمبەرەكەی إبراهیم: ﴿يَٰٓأَبَتِ لَا تَعْبُدِ ٱلشَّيْطَٰنَ ۖ إِنَّ ٱلشَّيْطَٰنَ كَانَ لِلرَّحْمَٰنِ عَصِيًّا﴾ [مریم: ٤٤]، وە فەرمایشتی الله تعالی: ﴿إِن يَدْعُونَ مِن دُونِهِۦٓ إِلَّآ إِنَٰثًا وَإِن يَدْعُونَ إِلَّا شَيْطَٰنًا مَّرِيدًا﴾ [النساء: ١١٧]، واتا: هیچ ناپەرستن جگە لە شەیتانێک نەبێت، ئەم پەرستنەش بە شوێنكەوتنی تەشریعی شەیتان دەبێت، هەر بۆیە ئەوانەی كە گوێڕایەڵی دەكرێن لە جوان كردنی تاوانەكان الله تعالی ناوی لێناون هاوبەش لە فەرمایشتی الله تعالی: ﴿وَكَذَٰلِكَ زَيَّنَ لِكَثِيرٍ مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ قَتْلَ أَوْلَٰدِهِمْ شُرَكَآؤُهُمْ﴾ [الأنعام: ١٣٧]، وە پێغەمبەر ﷺ ئەمەی بۆ عدي بن حاتم رضي الله عنه ڕوون كردەوە كاتێک پرسیاری لێكرد دەربارەی فەرمایشتی الله تعالی: ﴿ٱتَّخَذُوٓا۟ أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَٰنَهُمْ أَرْبَابًا مِّن دُونِ ٱللَّهِ﴾ [التوبة: ٣١]، بۆی ڕوون كردەوە كە زانا و عابیدەكانیان ئەو شتانەیان بۆ حەلال دەكردن كە الله حەڕامی كردووە، وە ئەو شتانەیان لەسەر حەڕام دەكردن كە الله حەلالی كردووە، خەڵكیش شوێنیان كەوتن لەمەدا، ئەم شوێنكەوتنەیان بوو ئەوانیان كرد بە پەروەردگاریان، وە ڕوونترین بەڵگە لەم بابەتەدا الله جل وعلا لە سورەتی النساء ڕوونی كردەوە ئەوانەی دەیانەوێ حوكم بەرنەوە بۆ لای غەیری شەرعی الله ئەوا سەیری پێ دێت كە پێیان وایە ئیماندارن، ئەم سەیر پێهاتنەش لەبەر ئەوەیە كە بانگەشە كردنیان بۆ ئیمان لەگەڵ هەبوونی ویستی حوكم بردنەوە بۆ لای طاغوت زیادەڕەوییە لە درۆ كردندا كە دەبێتە هۆی سەیر پێهاتن، ئەمەش بریتیە لە

**فەرمایشتی الله تعالى:** ﴿أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ يَزۡعُمُونَ أَنَّهُمۡ ءَامَنُواْ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبۡلِكَ يُرِيدُونَ أَن يَتَحَاكَمُوٓاْ إِلَى ٱلطَّٰغُوتِ وَقَدۡ أُمِرُوٓاْ أَن يَكۡفُرُواْ بِهِۦۖ وَيُرِيدُ ٱلشَّيۡطَٰنُ أَن يُضِلَّهُمۡ ضَلَٰلَۢا بَعِيدٗا﴾ **[النساء: ٦٠].**

جا بەم دەقە ئاسمانیانەی کە باسمان کرد دەردەکەوێ ئەوپەڕی دەرکەوتن کە ئەوانەی شوێنی یاسا دانراوەکان دەکەون کە شەیتان دایناوە لەسەر زمانی ئەولیاکانی کە پێچەوانەی ئەو شەرعەیە کە الله جل وعلا دایناوە لەسەر زمانی پێغەمبەرانی صلى الله علیهم وسلم، هیچ کەسێک گومانی لە کافری و شیرکیان نیە تەنها کەسێک الله چاو ڕۆشنی لێ سەند بێتەوە و کوێری کردبێ لە ئاست نوری وەحی وەک ئەوان.

**ئاگاداری:** بزانە کە پێویستە تەفصیل بدرێ لەنێوان نیزامی دانراو کە حوکم کردنی کافر بوون بە دروستکەری ئاسمانەکان و زەوی لێ دەکەوێتەوە، وە ئەو نیزامەی کە ئەم کوفرەی لێ ناکەوێتەوە، ڕوون کردنەوەی ئەمەش بەم جۆرەیە: نیزام دوو بەشە: ئیداری و شەرعی، نیزامی ئیداری کە مەبەست پێی ڕێکخستنی کاروبارەکانە بە باشی بە جۆرێک کە پێچەوانەوەی شەرع نیە، ئەمە هیچ ڕێگریەکی نیە و هیچ هاوەڵێک و دوای ئەوانیش لەمەدا خیلافیان نیە، عمر ﵁ کاری لەم شێوەی زۆر کردووە کە لە سەردەمی پێغەمبەر ﷺ نەبووە، وەک نوسینی ناوی سەربازەکان لە دیوان بۆ ڕێکخستن و زانینی کێ نەهاتووە و کێ هاتووە، ... (پاشان دەڵێ) وە هەروەها کڕینی ماڵی صفوان بن أمية لەلایەن عمر ﵁ لە مكة المكرمة، وە کردنی بە بەندیخانە، لە کاتێکدا نە پێغەمبەر ﷺ بەندیخانەی داناوە نە أبو بكر، جا ئەم جۆرە شتانە کاروباری ئیدارین کە ئەنجام دەدرێن بۆ ڕێکخستنی کاروبارەکان کە پێچەوانەی شەرع نیە، ئەمەیان هیچ کێشەی تێدا نیە، ئەم جۆرە لە نیزامی دانراو کێشەی تێدا نیە،

وە دەریش ناچێت لە قاعیدە شەرعیەکان لە ڕەچاو کردنی بەرژەوەندی گشتی، بەڵام نیزامی شەرعی کە پێچەوانەی تەشریعی دروستکەری ئاسمانەکان و زەوییە، حوکم کردنی کافر بوونە بە دروستکەری ئاسمانەکان و زەوی، **وەک بانگەشە کردنی زیاد وەرگرتنی نێر لە مێ لە میراتدا عەدالەت نیە، وە پێویستە یەکسان بن لە میرات وەرگرتن، وە وەک بانگەشە کردنی فرە ژنی زوڵمە، وە تەڵاق زوڵمە لە ئافرەت، وە ڕەجم کردن و دەست بڕین و هاوشێوەی ئەمانە کردەوەی وەحشیگەرین دروست نیە وابکرێ لە مرۆڤ، وە هاوشێوەی ئەم نیزامانە.**

جا حوکم کردنی ئەم جۆرە نیزامە لە گیان و ماڵ و ناموس و ڕەچەڵەک و عەقڵ و دینی کۆمەڵگا، کافر بوونە بە دروستکەری ئاسمانەکان و زەوی، وە یاخی بوونە لە نیزامی ئاسمان کە دروستکەری هەموو دروستکراوەکان دایناوە، وە الله زاناترە بە بەرژەوەندی دروستکراوەکانی سبحانە وتعالی لەوەی کە تەشریع دانەرێکی تری لەگەڵ هەبێت، بەرز و پاکە لە هەبوونی تەشریع دانەرێک لەگەڵیدا، ﴿أَمۡ لَهُمۡ شُرَكَٰٓؤُاْ شَرَعُواْ لَهُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا لَمۡ يَأۡذَنۢ بِهِ ٱللَّهُۚ﴾ **[الشورى: ٢١]**، ﴿قُلۡ أَرَءَيۡتُم مَّآ أَنزَلَ ٱللَّهُ لَكُم مِّن رِّزۡقٖ فَجَعَلۡتُم مِّنۡهُ حَرَامٗا وَحَلَٰلٗا قُلۡ ءَآللَّهُ أَذِنَ لَكُمۡۖ أَمۡ عَلَى ٱللَّهِ تَفۡتَرُونَ﴾ **[يونس: ٥٩]**، ﴿وَلَا تَقُولُواْ لِمَا تَصِفُ أَلۡسِنَتُكُمُ ٱلۡكَذِبَ هَٰذَا حَلَٰلٞ وَهَٰذَا حَرَامٞ لِّتَفۡتَرُواْ عَلَى ٱللَّهِ ٱلۡكَذِبَۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَفۡتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلۡكَذِبَ لَا يُفۡلِحُونَ﴾ **[النحل: ١١٦]**.

**[أضواء البيان: 4/108-111]**

ووتم: زۆر جار دەبینین لەم ووتەیەی الشنقیطي تەنها ئەم پارچەیە دەهێنن و بەڵگەی پێ دەهێننەوە (جا بەم دەقە ئاسمانیانەی کە باسمان کرد دەردەکەوێ ئەوپەڕی دەرکەوتن کە ئەوانەی شوێنی یاسا دانراوەکان دەکەون کە شەیتان دایناوە لەسەر زمانی ئەولیاکانی کە

پێچەوانەی ئەو شەرعەیە کە الله جل وعلا دایناوە لەسەر زمانی پێغەمبەرانی صلى الله علیهم وسلم، هیچ کەسێک گومانی نیە لە کافرێتیان و شیرکیان نیە تەنها کەسێک الله چاو ڕۆشنی لێ سەند بێتەوە و کوێری کردبێ لە ئاست نوری وەحی وەک ئەوان) بەبێ ئەوەی ووتەکانی پێش ئەمە و دوای ئەمە نەقل بکەن، بەڵام کاتێک هەموو ووتەکە دەهێنین وەکو خۆی بۆمان دەردەکەوێت باسی چی دەکات، تەنانەت ئەم پارچەیە بە تەنهاش وەری بگرین ئەوا هیچ بەڵگەیەکی تێدا نیە بۆیان کە یاسا دانان کوفری گەورە بێت بەبێ هیچ مەرجێک، چونکە الشنقیطي هەر لەم پارچە ووتەیەدا کە ئەوان دەیهێنینن دەبینین باسی تەشریع دەکات کە شەیتان دایدەنێت لەسەر زمانی ئەولیاکانی واتا حەرام و حەلال، دواتریش نموونە بە حەلال کردنی گۆشتی ئاژەڵی مردارەوە بوو دەهێنێتەوە لەلای شەیتانەوە لەسەر زمانی ئەولیاکانی، ئینجا دواتر کە باسی نیزامی تەشریعی دەکات و بە کوفر ناوی دەبات، سەیری نموونەکانی بکە، باسی ئەوە دەکات ڕەخنە لە حوکمەکانی الله بگیرێت و بە زوڵم دابنرێت و بە نەگونجاو وەصف بکرێت، نەک تەنها بەند کردنی دز لە بڕی دەست بڕینی بە کوفر ناو ببات بەبێ هیچ مەرجێک، ئایا هیچ جۆرێک لە حوکم نەکردنی بە قورئان بە کوفر ناوبرد بەبێ باسکردنی مەرج بۆی ؟ وەک ئێوە کە حوکم نەکردن بە قورئان و یاسا دانان بە ڕەهایی بە کوفر دەزانن بەبێ مەرج.

**ابن عاشور** دەربارەی ئایەتی: ﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾ دەڵێ: جمهوری موسڵمان کە بریتین لە ئەهلی سوننە لە هاوەڵان و دوای ئەوانیش بابەتەکە لەلای ئەوان موجمەلە، **چونکە واز هێنان لە حوکم کردن بەوەی الله دایبەزاندووە چەند حاڵەتێکی زۆری هەیە، جا ڕوونکردنەوەی ئەم موجمەلە بە کۆمەڵێک بەڵگەی زۆرە کە ئەوە یەکلا دەکاتەوە تەکفیر ناکرێ بە تاوان، سیاقی ئایەتەکەش ئەم موجمەلە ڕوون دەکاتەوە، هەر بۆیە جمهوری زانایان**

**وتوویانە: ئەوەی حوکم نەکات بەوەی الله دایبەزاندووە مەبەست پێی یەهودە لێرەدا**، ئەمەش البراء بن عازب وتوویەتی و ڕیوایەتی کردووە لە پێغەمبەری الله ﷺ، مسلم ڕیوایەتی کردووە لە صەحیحەکەی، جا بە پێی ئەمە بێت (مَن) موصولة، بە مانای (لام)ی عەهد دێت. **جا ماناکە ئاوای لێدێت: هەرکەسێک واز بهێنێت لە حوکم کردن بەوەی الله دایبەزاندووە، واز هێنانێک وەک واز هێنانی یەهود، کە بریتیە لە واز هێنانێکی تێکەڵ بە تانەدان لە گونجان و دروستی حوکمەکە، وە یەهود ناسراون بەوەی کە حاکمەکانیان زۆر موخالەفەی ئەحکامی کتێبەکانیان دەکەن لەسەر بنەمای گۆڕینی حوکمەکە بەو بڕوایەی کە حوکمەکە گونجاو نیە بۆ حاڵی ئەوان، هەروەک چۆن وایان کرد دەربارەی حەددی زینا**، ... (پاشان دەڵێ) وە ژمارەیەک زانا وتوویانە: مەبەست لە ﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ﴾ **ئەوەیە هەرکەسێک حوکم کردن بە حوکمی الله واز لێ بهێنێت ئینکاری لێ بکات یان بە سوک سەیری بکات یان تانە بدات لە حەق بوونی حوکمەکە** دوای ئەوەی لەلای جێگیر دەبێ کە ئەمە حوکمی الله-یە بە متواتری یان بە بیستنی لە پێغەمبەری الله، کەسێک کە تەکلیفی شەرعی لەسەرە خۆی دەیبیستێ، ئەمەش ڕیوایەت کراوە لە ابن مسعود و ابن عباس و مجاهد و الحسن.

**[التحرير والتنوير : 6/211-212]**

**الزمخشري** دەڵێ:

﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾ هەرکەسێک حوکم بەوە نەکات کە الله دایبەزاندووە **سوکایەتی پێ بکات** ئەوا ئەمانە کافر و زاڵم و فاسقن.

**[الكشاف : لاپەرە 292]**

ووتم: الزمخشري موعتەزیلەیەكی كافری سەرسەختە، بەڵام بۆیە تەفسیرەكەیم هێنا چونكە مەزهەبی موعتەزیلە لە خەواریج نزیكە لە بابەتی خروج كردن لە حاكمی زاڵم و فاسق، كەچی لەگەڵ ئەوەشدا تەكفیر كردنی لەم ئایەتەدا بەند كرد بە سوكایەتی كردن بە حوكمی الله.

## مكي بن أبي طالب دەڵێ:

﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ﴾ **واتا: ئەوەی حوكمی الله بشارێتەوە كە دایبەزاندووە لە كتێبەكەی دەربارەی پیاو و ژنی زیناكەری خێزاندار، وە جگە لەم دووانەش لە حەقی خوێنی كوژراو،** ﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾ **ئا ئەوانە حەق دەشارنەوە، ئەم ئایەتەش دەربارەی كافرانی ئەهلی كیتاب دابەزی.**

وە ووتراوە: دەربارەی موشریكان دابەزیوە.

وە ووتراوە: ماناكەی ئەوەیە ئەوەی حوكم بەوە نەكات كە الله دایبەزاندووە **ئەم حوكم نەكردنەش بە حەلال بزانێ**، ئا ئەوانە كافرن.

وە دوای ئەمە فەرموویەتی: زاڵمن، وە دوای ئەوە فەرموویەتی: فاسقن، جا ووتراوە: ئەم سێ وەصفە بۆ ئەو كەسەیە كە **حوكمی الله دەگۆڕێ** لە هەموو خەڵكی.

وە ووتراوە: ئەمە بۆ یەهودە كە **حوكمی الله-یان گۆڕی.**

وە ووتراوە: وەصفی یەكەم بۆ یەهودە، دووەم بۆ نەصارایە، سێیەم بۆ موسڵمانانە.

**وە ووتراوە: (الكافرون) دەربارەی موسڵمانان دابەزیوە گەر حوكمی الله بگۆڕن**، وە (الظالمون)یش دەربارەی یەهود دابەزیوە، وە (الفاسقون)یش دەربارەی نەصارا دابەزیوە، ئەمەش ڕووكەشی دەقەكەیە.

[الهداية إلى بلوغ النهاية : لاپەرە 1731-1732]

ووتم: بینیتان هیچ كام لە ووتەكان بە ڕەهایی بڵێ كوفرە بەبێ باسكردنی هیچ مەرجێک ؟ وە ئەمەی كۆتایی ووتەی الشعبي-ە، كە دەڵێ: (الكافرون) بۆ موسڵمانانە، بەڵام مەرجداری كرد بەوەی كە حوكمی الله بگۆڕن، نەک تەنها خودی حوكم نەكردن بە قورئان كوفر بێت.

## ابن عادل الحنبلي دەڵێ:

بزانە كە دەست بردنی خەڵک بۆ تەحریف كردن بێگومان یان بەهۆی ترسەوە دەبێت یان بەهۆی تەماع كردن و هیوا هەبوون بە دونیا دەبێت، جا لەبەر ئەوەی ترس كاریگەری بەهێزترە لە تەماع كردن، الله تعالى ذكره باسكردنی ترسی پێش خست، فەرمووی: ﴿فَلَا تَخۡشَوُاْ ٱلنَّاسَ وَٱخۡشَوۡنِ﴾ ماناكەی ئەوەیە: كتێبەكەم تەحریف مەكەن بەهۆی ترسان لە خەڵكی و پاشاكان و گەورەكان، جا حدودە واجبەكان لەسەریان لابەرن، وە بە فێڵ كردن تەكلیفەكانی الله لەسەریان لابەرن، جا كاتێک الله باسی ترسی كرد لە دوای ئەو باسی هیوا هەبوونی كرد بە دونیا، الله تعالى فەرمووی: ﴿وَلَا تَشۡتَرُواْ بِـَٔايَٰتِي ثَمَنٗا قَلِيلٗاۚ﴾ واتا: هەروەک چۆن نەهیم لێكردن لە گۆڕینی حوكمەكانم بەهۆی ترسەوە، بە هەمان شێوە نەهیتان لێدەكەم لە گۆڕینی حوكمەكانم لە پێناوی تەماع كردن لە پلە و سامان و بەرتیل وەرگرتن، خۆشیەكانی دونیا كەمن، جا كاتێک الله ڕێگری لێكردن لە هەردووكیان، بە دوای ئەمە هەڕەشەی توندی هێنا، الله تعالى

فەرمووی: ﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾ **ئەمە هەڕەشەیە بۆ یەهود لە درۆ هەڵبەستنیان لە تەحریف کردنی حوکمی الله دەربارەی حەددی زیناکەری خێزاندار، واتا کاتێک ئەوان ئینکاری حوکمی الله-یان کرد کە لە تەوراتدا نوسرا بوو، ووتیان: ڕەجم کردن واجب نیە،** ئەوا ئەوان کافرن بە ڕەهایی بە موسی و بە تەورات و بە محمد و بە عیسی ابن مریم علیه الصلاة والسلام.

**[اللباب في علوم الكتاب : 7/349-350]**

**الخطيب الإسكافي** دەڵێ:

فەرمایشتی الله: ﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾ مەبەست پێی یەهودە ئەوانەی کە حوکمی الله دەگۆڕنەوە بەو نرخە کەمەی کە وەری دەگرن بە بەرتیل، جا حوکمی الله دەگۆڕن بەو نرخە کەمەی کە وەری دەگرن، **بەڵام ئەوەی کە بووترێ حوکم کردن بە پێچەوانەی ئەوەی کە الله دایبەزاندووە کوفر بێت ئەمە مەزهەبی خەواریجە، دەڵێن: (مَن) لەم ئایەتەدا شرطية !**

**الخطيب الإسكافي دەڵێ: ئەمە تایبەتە بە یەهود ئەوانەی کە پێشتر باسکران و باسی گۆڕینیان کرا بۆ حوکمی الله بۆ ئەوەی پێغەمبەری الله بە درۆ بزانن، ئەمەش کوفرە.**

**[درة التنزيل وغرة التأويل : 1/463]**

**الخطيب الإسكافي** دەڵێ:

﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ﴾ **[المائدة: ٤٧]**، ئەوانەی لە المتقدمین کە ووتەکانیانم گێڕاوەتەوە دەربارەی ئەم ئایەتە وتوویانە: (مَن) بە مانای (الذي) دێت، وە ئەوەی من بۆی دەچم (مَن) لێرەدا شرطیة، بە مانای (الذي) نایەت، وەک دەووترێ دەربارەی ئەو کەسەی کە حوکم نەکات بەوەی الله دایبەزاندووە **لە ئێمە، چونکە ناگات بە پلەی کوفر، بەڵکو بە فسق وەصف دەکرێ**، هەر بۆیە الله فەرمووی: ﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ﴾.

**[درة التنزيل وغرة التأويل : 1/465-466]**

ووتم: (ومن لم یحکم بما أنزل الله فأولئك هم الکافرون) و (الظالمون) و (الفاسقون)، لەلای نەحوییەکان خیلاف هەیە کە ئایا (مَن) لەم ئایەتانەدا (شرطیة) یان (موصولة) ؟

گەر (شرطیة) بێت، واتا ئامرازی (مەرج) بێت، وەک لە ڕستەی: (مَن یجتهد ینجح)، واتا: ئەوەی تێبکۆشێ سەردەکەوێ.

من: (أداة الشرط)ە

یجتهد: (فعل الشرط)ە

ینجح: (جواب الشرط)ە

جا ئەگەر ووتمان (مَن) لەم ئایەتانەدا (شرطیة) ئەوا مانای ئایەتەکان بەم جۆرەی لێدێت:

(ئەوەی حوکم نەکات بەوەی کە الله دایبەزاندووە ئەوا کافرە، زاڵمە، فاسقە)

(من) دەبێتە أداة الشرط

(یحکم) دەبێتە فعل الشرط

(فأولئك هم الکافرون) دەبێتە جواب الشرط

بەم جۆرەش دەبێتە گشتی، هەموو کەسێک دەگرێتەوە کە حوکم نەکات بە قورئان بەبێ جیاوازی، تەنها ئەو کەسە نەبێت کە تایبەت کراوە ئەویش بە بەڵگەوە، هەر بۆیە الخطیب

الإسكافي لە ووتەی پێشوودا دەربارەی ئایەتی: (ومن لم يحكم بما أنزل الله فأولئك هم الكافرون) ووتی: خەواریجەکان دەڵێن: (مَن) لەم ئایەتەدا شرطية، واتا: هەر کەسێک حوکم بە قورئان نەکات کافرە، ئینجا الخطيب الإسكافي وەڵامی دانەوە بەوەی کە ئەمە تایبەتە بە یەهود موسڵمانان ناگرێتەوە، بەڵام لە ئایەتی: (ومن لم يحكم بما أنزل الله فأولئك هم الفاسقون) الخطيب الإسكافي بۆ ئەوە چووە کە (مَن) شرطية بێت، بەڵام (الفاسقون)ی بە بە پێی دەستەواژەی زانایان لێکداوەتەوە، کە لە عورفی ئەواندا کاتێک دەووترێ: (کوفر) مەبەست پێی دەرچوونە لە دین، وە کاتێک دەووترێ: (زوڵم) یان (فسق) مەبەست پێی تاوانە نەک دەرچوون لە دین، بۆیە کاتێک لە ئایەتی (الفاسقون) کە ووتی: (مَن) شرطية واتا هەموو کەسێک دەگرێتەوە پاشان دەڵێ: (ئەوەی لە ئێمە)، واتا لە ئوممەتی ئیسلام حوکم نەکات بە قورئان ئەوا فاسقە ناگاتە پلەی کوفر.

وە لەم ووتەیەی خوارەوە ڕوون دەبێتەوە گەر (مَن) موصولة بێت بە مانای (الذي) ئەوکات مانای ئایەتەکە چی لێدێت.

**النحاس** دەڵێ:

﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾ **جوانترین شت کە دەربارەی ووتراوە** ووتەکەی الشعبي-ە، ووتی: ئەم ئایەتە تایبەت بە یەهود دابەزیوە، وە ئەوەی الشعبي ووتی سێ شت بەڵگەیە لەسەری، لەوانە: یەهود باسکراون پێش ئەمە لە فەرمایشتی: ﴿لِلَّذِينَ هَادُواْ﴾ جا ڕاناوەکە (ضمير) بۆ ئەوان گەڕایەوە، وە لەوانە: سیاقی ووتەکە بەڵگەیە لەسەری، ئەی نابینیت لە دوای ئەم ئایەتە ئایەتی: ﴿وَكَتَبۡنَا عَلَيۡهِمۡ فِيهَآ﴾ هاتووە، ئەم ڕاناوە (عليهم) دەگەڕێتەوە بۆ یەهود بە ئیجماع، وە هەروەها یەهود بوون کە ئینکاری ڕەجم و تۆڵە کردنەوەی کوژراویان کرد لە بکوژ، **جا گەر کەسێک**

**بڵێ: (مَن) لێرەدا گەر (شرطية) بێت ئەوا گشتیە تەنها گەر بەڵگەیەک هەبێت بۆ تایبەت کردنی، ئەوا پێی دەووترێ: (مَن) لێرەدا بە مانای (الذي) دێت بە پێی ئەو بەڵگانەی کە باسمان کرد، جا مانای ئایەتەکە ئاوای لێدێت: (والیهود الذین لم یحكموا بما أنزل الله فأولئك هم الكافرون)، ئەمە جوانترین ووتەیە کە ووتراوە دەربارەی ئەم بابەتە**، وە ووتراوە: ئەوەی حوکم نەکردن بەوەی الله دایبەزاندووە بە حەلال بزانێت ئەوا کافرە، وە ووتراوە: ئەوەی واز بهێنێت لە حوکم کردن بە هەموو ئەو شتانەی کە الله دایبەزاندووە ئەوا کافرە.

**[إعراب القرآن : لاپەرە 233-234]**

ووتم: الشعبي دەڵێ: ئایەتی یەکەم دەربارەی موسڵمانان دابەزیوە، ناڵێ: دەربارەی یەهود دابەزیوە، نازانم النحاس ئەمەی لەکوێ هێناوە ! تەنانەت هەر خودی النحاس لە ووتەی دواتر کە دەیهێنین دەڵێ: الشعبي وتوویەتی: ئایەتی یەکەم دەربارەی موسڵمانان دابەزیوە ! واتا ئەم دوو نەقڵەی النحاس دژی یەکترن، کە نەقڵی دووەمیان ڕاستە.

جا ئەگەر بڵێین (مَن) لەم ئایەتەدا موصولة بە مانای (الذي) دێت وەک النحاس باسی کرد، ئەوکات مانای ئایەتە بەم جۆرە نامێنێت: (ئەوەی حوکم نەکات بەوەی کە الله دایبەزاندووە کافرە)، بەڵکو ماناکەی ئاوای لێدێت: (یەهود ئەوانەی کە حوکمیان نەکرد بەوەی الله دایبەزاندووە کافرن)، واتا ئایەتەکە دەربارەی یەهودە کە حوکمی الله-یان گۆڕی، موسڵمانان ناگرێتەوە گەر حوکم نەکەن بە قورئان بەو مەرجەی وەک یەهود نەکەن.

جا لەلای ئەو زانایانەی کە (مَن) شرطية بێت، حوکمەکە هەموو کەسێک بگرێتەوە بەم جۆرە لێکی دەدەنەوە هەر کەسێک هەمان کاری یەهود ئەنجام بدات ئەوا کافرە، کەواتە دەبێت حاڵی ئەم یەهودییانە بزانرێ تاکو بووترێ: هەر کەسێک هەمان کاری ئەوان ئەنجام

بدات وەک ئەوان کافرە، کارەکەی ئەوانیش بریتی بوو لە ئینکاری کردن و تەحریف کردنی حوکمی الله، جا هەر کەسێکیش لە موسڵمانان وەک ئەوان ئینکاری یان تەحریفی حوکمی الله بکات ئەوا کوفرەکە دەیگرێتەوە.

وە لەلای ئەو زانایانەش کە (مَن) موصولة بە مانای (الذي) دێت، ماناکەی بەم جۆرە دەبێت کە النحاس باسی کرد، واتا ئایەتەکە دەربارەی یەهودە.

بەڵام ئەوەی کە بووترێ: (مَن) شرطیة، بەو جۆرەی کە هەر کەسێک حوکم نەکات بە قورئان کافرە، بەبێ گوێدانە سیاقی ئایەتەکان و سەبەبی نزول، ئەوا ئەمە مەزهەبی خەواریجە کە ژمارەیەکی زۆر لە زانایان ئەم ووتەیان داوەتە پاڵ خەواریج، وە مولزەمیان کردوون بەوەی تەنانەت موسڵمان تاوانێکی بچووکیش ئەنجام بدات کافر بێت، چونکە لە حوکمی الله دا فرمانی پێکراوە ئەم تاوانە ئەنجام دەدات، جا کاتێک تاوانەکە ئەنجام دەدات ئەوا حوکمی بەوە نەکردووە کە الله دایبەزاندووە.

**النحاس** دەڵێ:

فەرمایشتی الله جل وعز: ﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾ **ابن عباس وتوویەتی: ئەمە کوفرە بەڵام کوفر نیە بە الله و فریشتەکانی و کتێبەکانی**، وە الشعبي وتوویەتی: ئایەتی یەکەم دەربارەی موسڵمانان و ئایەتی دووەم دەربارەی یەهود و ئایەتی سێیەم دەربارەی نەصارا دابەزیوە، وە غەیری الشعبي وتوویەتی: ئەوەی حوکمێک لە حوکمەکانی الله ڕەت بکاتەوە ئەوا کافر بووە.

ووتم: فەقیهەکان ئیجماعیان هەیە لەسەر ئەوەی هەر کەسێک بڵێ: ڕەجم واجب نیە لەسەر ئەو کەسەی کە زینا دەکات و خێزانداریشە، ئەوا کافرە چونکە حوکمێک لە حوکمەکانی الله جل وعز-ی ڕەت کردۆتەوە.

[معاني القرآن : 315/2]

**النحاس** دەڵێ:

جوانترین شت کە ووتراوە دەربارەی ئەم بابەتە ئەوەیە کە الأعمش ڕیوایەتی کردووە لە عبدالله بن مرة ئەویش لە البراء کە دەڵێ: **ئەم ئایەتانە هەمووی دەربارەی کافران دابەزیون، واتا ئایەتەکانی:** ﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَٰفِرُونَ﴾ ، ﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ﴾ ، ﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ﴾ **جا بە پێی ئەم ووتەیە مانای ئایەتەکە ئاوای لێدێت: ئەوانەی کە حوکمیان نەکرد بەوەی الله دایبەزاندووە، ئا ئەوانە کافرن.**

[معاني القرآن : 316/2]

ووتم: واتا ئەوانەی لە یەهود کە حوکمیان نەکرد بەوەی الله تعالی دایبەزاندووە کافرن، هەروەک پێش ئێستا باسمان کرد، وە لە ووتەی دواتریش دووبارەی دەکاتەوە.
چونکە ئایەتەکە دەربارەی ئەوان دابەزیوە، دەبێ بزانین ئەوان چ کارێکیان کردووە کە ئەم ئایەتەیان بەسەر دابەزیوە، جا هەرکەسێک هەمان کاری ئەوان بکات ئەوا حوکمی ئایەتەکە ئەویش دەگرێتەوە.

**النحاس** دەربارەی ئایەتی: ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَٰفِرُونَ﴾ دەڵێ:

**ئەوەی کە بووترێ: دەربارەی یەهود دابەزیوە لە هەموو ووتەکان لە پێشترە.**

**چونکە ئەم ووتەیە لە هاوەڵێک ڕیوایەت کراوە کە ئامادەی دابەزینی قورئان بووە، ڕایدەگەیەنێت کە بەهۆی ئەم کارەی یەهودەوە ئەم ئایەتە دابەزی،** ...

(پاشان دەڵێ) بەڵام حوکمی غەیری یەهودیش وەک حوکمی یەهودە، هەر کەسێک حوکم بکات بە غەیری ئەوەی الله جل وعز دایبەزاندووە، **ئینکاری لێ بکات هەروەک یەهود ئینکاریان لێی کرد، ئەوا کافر و زاڵم و فاسقە.**

**بڕوانە [الناسخ والمنسوخ : 2/299-300]**

***السعدي*** دەڵێ:

﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ﴾ هەر کەسێک حوکم بەوە نەکات کە الله دایبەزاندووە لە حەقی ڕوون و ئاشکرا، وە حوکم بەو باطلە بکات کە دەیزانێ بەهۆی ئامانجێک لە ئامانجە خراپەکانی ﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾ حوکم کردن بە غەیری ئەوەی الله دایبەزاندووە لە کردەوەی کافرانە، **جا دەبێتە کوفرێکی لە دین دەرخەر گەر پێی وابێت حەلالە و جائیزە، وە دەبێتە تاوانێکی گەورە لە تاوانە گەورەکان**، وە لە کردەوە کوفریەکانە، ئەو کەسەی ئەنجامی بدات شایستەی سزایەکی توندە.

**[تفسير السعدي : لاپەرە 256]**

***السعدي*** دەڵێ:

﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ﴾ **ابن عباس وتوویەتی: کفر دون کفر، و ظلم دون ظلم، و فسق دون فسق-ە.**

**زوڵمی گەورەیە لەکاتی بە حەلال دانانی، وە تاوانێکی گەورەیە کاتێک ئەنجامی**

**دەدات و بە حەلالی دانانێت.**

[تفسير السعدي : لاپەرە 257]

**النسفي** دەڵێ:

﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ﴾ هەر کەسێک حوکم نەکات بەوەی کە الله دایبەزاندووە **وەک سوکایەتی پێکردنی، ئا ئەوانە کافرن** ﴿فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَٰفِرُونَ﴾.

ابن عباس رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا وتوویەتی: هەر کەسێک حوکم نەکات بە قورئان ئینکاری لێ بکات ئەوا کافرە، وە ئەگەر ئینکاری لێ نەکات ئەوا فاسق و زاڵمە، وە ابن مسعود رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ وتوویەتی: ئەم حوکمە گشتیە بۆ یەهود و غەیری ئەوانیشە.

[تفسير النسفي : 449/1]

**الواحدي** دەڵێ:

﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَٰفِرُونَ﴾ **دابەزی دەربارەی ئەوانەی کە حوکمی الله-یان گۆڕی لە یەهود، وە ئەم ئایەتە و دوو ئایەتی دواتری هیچیان دەربارەی ئەهلی ئیسلام دانەبەزیون.**

[الوجيز في تفسير الكتاب العزيز : 321/1]

**الواحدي** دەڵێ:

**قتادة دەربارەی سێ ئایەتەکە دەڵێ: واللە بەو جۆرە نیە کە ئەهلی شوبوهات و ئەهلی بیدعە و ئەهلی درۆ کردن بەناوی الله و کتێبەکەی تەفسیری دەکەن،**

**بەڵکو ئەم ئایەتانەی کە دەیبیستن دەربارەی ئەهلی کیتاب دابەزین** کاتێک کتێبی الله-یان فڕێدا و حدودەکانیان پەکخست و فرمانەکانیان پشتگوێ خست و پێغەمبەرەکەنیان کوشت.

[الوسيط في تفسير القرآن المجيد : 191/2]

**الواحدي** دەڵێ:

فەرمایشتی الله تعالی: ﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾ زانایانی تەفسیر خیلافیان هەیە دەربارەی ئەم ئایەتە و دوو ئایەتی دواتری، ﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ﴾ ، ﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ﴾ **کۆمەڵێک لە زانایانی تەفسیر وتوویانە: هەر سێ ئایەتەکە دەربارەی کافران و ئەوانەی حوکمی الله-یان گۆڕی لە یەهود دابەزیون، هیچ ئایەتێکیان دەربارەی ئەهلی ئیسلام دانەبەزیوە، چونکە موسڵمان ئەگەرچی تاوانی گەورەش ئەنجام بدات پێی ناووترێ: کافر.**

[التفسير البسيط : 392/7]

**الواحدي** دەڵێ:

ابن مسعود و الحسن و النخعي وتوویانە: ئەم ئایەتانە گشتین، دەربارەی یەهود و ئەم ئوممەتەشن، هەر کەسێک بەرتیل وەربگرێ و **حوکم بگۆڕێ** جا حوکم بە غەیری حوکمی الله بکات ئەوا کافر بووە، **وە هەروەها السدي-ش بۆ ئەم ووتەیە ڕۆیشتووە.**

[التفسير البسيط : 7/395-396]

ووتم: الواحدي-ش ووتەکەی السدي بە ڕووکەش وەرنەگرت بەڵکو مەرجداری کرد بە گۆڕینی حوکمی الله.

**ابن جزي الكلبي** دەڵێ:

﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَٰفِرُونَ﴾ ابن عباس وتوویەتی: هەر سێکیان دەربارەی یەهود دابەزین (الكافرون) و (الظالمون) و (الفاسقون).

وە دەربارەی ئەمە چەند فەرموودەیەک لە پێغەمبەر ﷺ ڕیوایەت کراوە.

وە ژمارەیەک زانا وتوویانە: ئایەتەکە گشتیە دەربارەی هەموو کەسێکە کە حوکم نەکات بەوەی الله دایبەزاندووە لە یەهود و موسڵمان و جگە لەوانیش، **بەڵام (کوفر) دەربارەی موسڵمانان کوفری تاوانە لە ئیمان نایانخاتە دەرەوە.**

[التسهيل لعلوم التنزيل : 1/238]

**أبو السعود** دەڵێ:

﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ﴾ ئەوەی حوکم بەوە نەکات کە الله دایبەزاندووە، جا هەر کەسێک بێت نەک تەنها تایبەت بێ بە یەهود، یەهودیش دەچنە ناویەوە بە پلەی یەکەم، **واتا: ئەوەی حوکم نەکات پێی وەک سوکایەتی پێکردنی و ئینکارکردنی، وە ئەوەی یەهود ئەنجامیاندا لە تەحریف کردنی ئایەتەکانی الله سوکایەتی و ئینکار کردنی لێ دەکەوێتەوە زۆر بە ڕوونی،** ﴿فَأُو۟لَٰٓئِكَ﴾ ئاماژەیە بۆ (مَن)، (أولئك) بە کۆ هاتووە بە ڕەچاوکردنی ماناکەی، هەروەک چۆن (مَن) بە تاک هاتووە بە ڕەچاو

کردنی لەفزەکەی، ﴿هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾ **ئا ئەوانە کافرن بەهۆی سوکایەتی کردنیان بە حوکمی اللە.**

**[تفسير أبي السعود : 42/3]**

**ابن عطية** دەڵێ:

زانایان خیلافیان هەیە لە مەبەستی فەرمایشتی اللە تعالى: ﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾ **کۆمەڵێک زانا وتوویانە: مەبەست پێی یەهودە لە الكافرون و الظالمون و الفاسقون، وە دەربارەی ئەمە فەرموودەیەک ڕیوایەت کراوە لە پێغەمبەر ﷺ لە ڕێگای البراء بن عازب.**

وە کۆمەڵێکی زۆر لە زانایان وتوویانە: ئایەتەکە هەموو کەسێک دەگرێتەوە کە حوکم نەکات بەوەی اللە دایبەزاندووە **بەڵام دەربارەی کار بەدەستانی ئەم ئوممەتە کوفری تاوانە لە ئیمان نایانخاتە دەرەوە.**

**[المحرر الوجيز : 196/2]**

**ابن عطية** دەڵێ:

الكافرون و الظالمون و الفاسقون، ئەم صیفەتانە تەئکید کراوەتە لەسەری بۆ ئەو کەسەی کە حوکم ناکات بەوەی اللە دایبەزاندووە، وە صەوابترین شت کە دەربارەی بووترێ: هەموو ئیماندارێک و هەموو کافرێک دەگرێتەوە. **هەموو ئەم صیفەتانە دەربارەی کافر دێنە دی بە تەواوترین شێوە، وە دەربارەی ئیماندار دێنە دی لە شێوەی کوفری تاوان و زوڵمی تاوان و فسقی تاوان.**

**[المحرر الوجيز : 199/2]**

ووتم: (کوفری تاوان و زوڵمی تاوانی و فسقی تاوان) واتا: کفر دون کفر، و ظلم دون ظلم، و فسق دون فسق.

**محمد الأمين الشنقيطي** دەڵێ:

فەرمایشتی الله تعالى: ﴿وَمَا ٱخۡتَلَفۡتُمۡ فِيهِ مِن شَيۡءٖ فَحُكۡمُهُۥٓ إِلَى ٱللَّهِۚ﴾ **[الشورى: ١٠]**، ئەوەی ئەم ئایەتە بەڕێزە بەڵگەیە لەسەری ئەوەیە کە هەر یەکێک لە حوکمەکان خەڵکی خیلافیان تێیدا هەبوو ئەوا گەڕاندنەوەی حوکمەکەی بۆ لای الله-یە بە تەنها، نەک بۆ لای غەیری الله، ئەمەش بە ڕوونی لە ئایەتانێکی زۆردا هاتووە.

جا شەریک دانان بۆ الله لە حوکمیدا وەک شەریک دانانە بۆی لە پەرستنیدا، الله دەربارەی شەریک دانان لە حوکمیدا فەرموویەتی: ﴿وَلَا يُشۡرِكُ فِي حُكۡمِهِۦٓ أَحَدٗا﴾ **[الكهف: ٢٦]**، وە لە قیرائەتی ابن عامر کە لە حەوت قیرائەتەکەیە: ﴿وَلَا تُشۡرِكۡ فِي حُكۡمِهِۦٓ أَحَدٗا﴾ بە شێوەی نەهی هاتووە، وە دەربارەی شەریک دانان بۆی لە پەرستنیدا فەرموویەتی: ﴿وَلَا يُشۡرِكۡ بِعِبَادَةِ رَبِّهِۦٓ أَحَدَۢا﴾ **[الكهف: ١١٠]**، جا هەردووکیان یەکسانن هەروەک ڕوونکردنەوەکەی دەبینی إن شاء الله.

جا بەمە دەزانرێ حەلال ئەوەیە کە الله حەلالی کردووە، وە حەڕام ئەوەیە کە الله حەڕامی کردووە، وە دین ئەوەیە کە الله دایناوە، جا هەموو تەشریعێک لە غەیری تەشریعی باطلە، وە کارکردن پێی لە بڕی تەشریعی الله لەلای ئەو کەسەی **کە بڕوای وایە وەک تەشریعی الله-یە یان باشترە لە تەشریعی الله ئەوا کوفرێکی بەواحە هیچ ناکۆکی تێدا نیە.**

[أضواء البيان : 173/7]

ووتم: بڕوانە ووتی بەم مەرجە دەبێتە کوفر کە حوکمەکەی خۆی وەک تەشریعی الله دابنێت یان بە باشتری دابنێت، نەک بە ڕەهایی کوفر بێت.

**محمد الأمين الشنقيطي** دەڵێ:

**هەر کەسێک شوێنی تەشریعی غەیری الله بکەوێ بڕوای وابێت دانانی ئەم تەشریعە لەبڕی تەشریعی الله جائیزە یان لە تەشریعی الله باشترە، ئەوا ئەم کەسە کافرە بە ئیجماعی موسڵمانان**، وە ئایەتانێکی زۆر بەڵگەن لەسەر ئەمە: ﴿وَإِنْ أَطَعْتُمُوهُمْ إِنَّكُمْ لَمُشْرِكُونَ﴾ **[الأنعام: ١٢١]**، وە فەرمایشتی الله: ﴿أَلَمْ أَعْهَدْ إِلَيْكُمْ يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ أَن لَّا تَعْبُدُواْ ٱلشَّيْطَٰنَۖ إِنَّهُۥ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ﴾ **[یس: ٦٠]**، وە هاوشێوەی ئەم ئایەتانە.

[مذكرة أصول الفقه على روضة الناظر : لاپەرە 77-78]

ووتم: دووبارە باسی ئەو مەرجەی کرد کە تەشریعەکەی خۆی بە جائیز بزانێ یان بە باشتری بزانێ لە تەشریعی الله ئەوکات دەبێتە کوفر، ئەمەیە الشنقيطي کە هەمیشە ووتەکانی دەکەن بە بەڵگە بۆ ئەم بابەتە کەچی هەمووی لە دژی خۆتانە !!!

وە کاتێک دەڵێ: ئایەتانێکی زۆر بەڵگەن لەسەر ئەمە، بەڵگەی هێنایەوە بە ئایەتی: ﴿وَإِنْ أَطَعْتُمُوهُمْ إِنَّكُمْ لَمُشْرِكُونَ﴾ کە بە ئیجماعی سەلەف ئەم ئایەتە دەربارەی موسڵمانانە گەر گوێڕایەڵی موشریکان بکەن دەربارەی حەلال کردنی گۆشتی مردارەوە بوو، نەک تەنها گوێڕایەڵی کردن بەبێ حەلال کردنی حەڕام و حەڕام کردنی حەلال کوفر بێت، وەک لە بەشی دووەمدا بە درێژی باسی دەکەین.

**ابن کثیر** دەڵێ:

علي بن أبي طلحة دەڵێ: **عن ابن عباس:** ﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾ ووتی: هەر کەسێک **ئینکاری** ئەوە بکات کە الله دایبەزاندووە ئەوا **کافر بووە، وە ئەوەی دانی پێ بنێت و حوکمی پێ نەکات ئەوا زاڵم و فاسقە،** ابن جریر ڕیوایەتی کردووە، **پاشان ابن جریر ئەوەی هەڵبژارد کە ئایەتەکە مەبەست پێی ئەهلی کیتابە، یان مەبەست پێی ئەوکەسەیە کە ئینکاری حوکمی الله دەکات کە لە کتێبەکەی دایبەزاندووە.**

**[تفسیر ابن کثیر : 119/3]**

**ابن کثیر** دەڵێ:

هەروەها عبدالرزاق دەڵێ: أخبرنا معمر عن ابن طاوس عن أبيه ووتی: پرسیار لە ابن عباس کرا دەربارەی فەرمایشتی الله: ﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾ **ووتی: ئەمە کوفرە.**

**ابن طاوس دەڵێ: وەک ئەو کەسە نیە کە کافرە بە الله و فریشتەکانی و کتێبەکانی و پێغەمبەرانی.**

وە الثوري دەڵێ: عن ابن جريج عن عطاء ووتی: **كفر دون كفر، و ظلم دون ظلم، و فسق دون فسق. ابن جریر ڕیوایەتی کردووە.**

وە وکیع دەڵێ: عن سفيان عن سعيد المكي عن طاوس: ﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾ **ووتی: کوفرێک نیە لە دین دەرخەر بێت.**

وە ابن أبي حاتم دەڵێ: حدثنا محمد بن عبدالله بن يزيد المقرئ حدثنا سفيان بن عيينة عن هشام ابن حجير عن طاوس عن ابن عباس دەربارەی فەرمایشتی الله: ﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾ **ووتی: ئەو کوفرە نیە کە ئەوان بۆی دەچن.**

وە الحاكم-یش ڕیوایەتی کردووە لە المستدرك لە ڕێگای سفیان بن عیینة، وە دەڵێ: صەحیحە لەسەر مەرجی البخاري و مسلم، وە ئەوان ڕیوایەتیان نەکردووە.

**[تفسير ابن كثير : 120/3]**

ووتم: ابن کثیر هەمان تەفسیرەکانی سەلەف نەقل دەکات کە دەڵێن کوفری بچووکە، هیچ قسەشی لەسەر ناکات، تەنانەت تەصحیح کردنی الحاکم بۆ ئەثەرەکەی ابن عباس نەقل دەکات، مەحاڵە ابن کثیر پێی وابێت ئەمە زەعیفە کەچی بێدەنگیش بێت لەسەری، لەکاتێکدا لە بابەتی زۆر لەمە سادەتر وەک بابەتە فقهیەکان گەر بە سەنەدێکی زەعیف هاتبێ ئەوا قسەی لەسەر دەکات و بێدەنگ نابێت، دەڵێ: (غريب)ە، واتا زەعیفە، بەڵام کاتێک دێتە سەر بابەتێکی ئاوا هەستیار و گرنگ کە بابەتەکە لە دین دەرچوون و مانەوە لە دینە، کۆمەڵێک ڕیوایەت بە دوای یەک نەقل دەکات کە هەمووی دەڵێن کوفری بچووکە، ئینجا بێدەنگ دەبێت لەسەری، ئایا کەسی عاقڵ دەڵێ: ابن کثیر بە زەعیفی زانیوە بەڵام بێدەنگ بووە ؟! وە باسی ئەوەش دەکات کە هەڵبژاردەی الطبري چیە لەم بابەتەدا، کە الطبري بۆ ئەوە چووە ئایەتەکە تایبەتە بە ئەهلی کیتاب، یان موسڵمانانیش دەگرێتەوە بەو مەرجەی وەک ئەهلی کیتاب ئینکاری حوکمی الله بکەن، کەچی ابن کثیر بێدەنگ دەبێت لەسەری، هەرکەسێکیش تەفسیری ابن کثیر بخوێنێتەوە ئەوا باش دەزانێ هەرکاتێک هەڵبژاردەی الطبري نەقل بکات و بە صەوابی نەزانێت ئەوا قسەی لەسەر دەکات، تەنانەت لە بابەتی زۆر سادەتر لەمە گەر تەرجیحی الطبري بە دڵ نەبێت قسەی لەسەر دەکات.

ئەصلەن بینیتان لە سەردەمی تابعینەوە تا سەدەی ڕابردوو یەک زانا باسی زەعیفی ئەم ئەثەرانە بکات ؟ تەنها یەک زانا زیاتر نا ؟ هەمووی نەقلی دەکەن و قبوڵی دەکەن، ئایا کەسیان نەیانزانی زەعیفە تا لەم سەردەمە هەندێک زانا پەیدا بوون بۆیان دەرکەوت کە زەعیفە ؟! یان زانا کۆنەکانیش دەیانزانی زەعیفە بەڵام بێدەنگ بوون لەسەری، بگرە قبوڵیان کرد سەرەڕای زانینی زەعیفیەکەی ؟!

**أحمد شاكر** (دەربارەی ئەثەرەکەی ابن عباس) دەڵێ:

الحاكم لە المستدرك ڕیوایەتی کردووە بە لەفزی: **(ئەو کوفرە نیە کە ئێوە بۆی دەچن، ئەمە کوفرێک نیە لە دین دەرخەر بێت،** ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَٰفِرُونَ﴾ **كفر دون كفر).**

**وە الذهبي-ش موافەقەی الحاكم-ی کردووە لە تەصحیح کردنی.**

**بڕوانە حاشیەی [عمدة التفسير : 684/1]**

ووتم: أحمد شاكر لە ووڵاتی مصر ژیاوە لە سەدەی ڕابردوو، قازی شەرعی بووە، کاتێک یاسای فەرەنسی دەگوازرێتەوە بۆ مصر و لە مەحکەمەکان کاری پێ دەکرێت أحمد شاكر دەست لە کار دەکێشێتەوە و زۆر دژی ئەم کارە دەوەستێ، بە هەموو توانای خۆی دژایەتی دەکات، کە لەو سەردەمەدا گۆڕانێکی یەکجار گەورە لە ووڵاتانی بەناو ئیسلامی و بە تایبەتی مصر ڕوو دەدات، لە کرانەوە بەرەو کوفر و عەلمانیەت و پشت گوێ خستنی دین، کەچی لەگەڵ ئەم هەموو دژایەتی کردنە، وە باسکردنی ئەوەی کە کەسانێکی گومڕاکەر لە سەردەمەکەیدا یاری بەم ئەثەرەی ابن عباس دەکەن و دەیکەن بە بیانوو بۆ ڕێگەدان بە یاسای دانراوی بت پەرستان، بەڵام نەیووت ئەثەرەکە زەعیفە، بەڵکو تەصحیحی الحاكم و

موافەقە کردنی الذهبي لەسەر تەصحیح کردنەکە نەقل کرد، ئەمە لە کاتێکدا أحمد شاکر فەرمووودەناسیش بووە، کەسێک نەبووە نەزانێ صەحیح و زەعیف چیە.

وە هەر کەسێک کە ووتەی أحمد شاکر دەکات بە بەڵگە بۆ تەکفیر کردن بە تەنها بەهۆی یاسا دانان بە ڕەهایی، بەبێ مەرجدار کردنی ئەو مەرجانەی سەلەف باسیان کردووە، ئەوا با بزانێت کە أحمد شاکر بە یاسا دانەران دەڵێ: (با زانایانی شەرع و یاسا دانەران بەیەکەوە لیژنەیەک پێک بهێنن بۆ دانانی یاسا بە پێی قورئان و سوننەت، ئێوەش سەرپەرشتی یاساکان بکەن لە چوار چێوەی قورئان و سوننەت یاسا دابنێن، من چەندین ساڵە بانگتان دەکەم بۆ ئەم پرۆژەیە، گەر بێتو وەڵام نەدەنەوە ئەوا من داوا لە زانایانی شەرع دەکەم کە ئەم کارە بگرنە ئەستۆ، ئەوکات لە هەڵبژاردنەکان ڕکابەرایەتیتان دەکەین و حوکم دەبەینەوە بۆ خەڵکی، گەر ئەوان دەنگیان پێداین و ئەندامەکانی ئێمەیان نارده پەرلەمانەوە، ئەوکات دەبێ دەسەڵاتمان تەسلیم بکەن هەروەک چۆن هەر حزبێکی براوە دەسەڵاتی تەسلیم دەکرێت، وە ئەوکات ئەو بەڵێنە بەجێ دەگەیەنین کە بە خەڵکمان داوە لە حوکم کردن بە قورئان و سوننەت) !!!.

**بڕوانە [الكتاب والسنة يجب أن يكونا مصدر القوانين في مصر : لاپەرە 37-41]**

وە ئەگەر بەڵگەش بە ووتەی محمد بن إبراهیم آل الشیخ دەهێننەوە کە لە (رسالة تحكيم القوانين) دەڵێ: ئەوەی جارێک و دووان حوکم بە قورئان نەکات ئەوکات کفر دون کفر-ە، ئەوا بیرتان نەچێت محمد بن إبراهیم موفتی سعودیە بوو، پاشای سعودیەی بە وەلی ئەمر دەزانی ! بەڵێ أحمد شاکر و محمد بن إبراهیم آل الشیخ دوو کەسی دیار بوونە لە سەدەی ڕابردوو لە دژایەتی کردنی یاسا دانراوەکان، وە هەوڵی زۆریان داوە بۆ حوکم کردن بە قورئان و سوننەت، وە جێی پەنجەیان دیارە لەم بابەتەدا ئەمە شتێکە ئینکاری لێ ناکرێت، بەڵام ئەوانەی کە زیادەڕەویان هەیە لەم بابەتە، بیرتان نەچێ کە ئێوە پشت لە ووتەی سەلەف

دەکەن لەم بابەتەدا، لە بەرامبەردا دەست بە ووتەی دوو کەس دەگرن کە پەڵەیان لەسەرە لەم بابەتەدا بە تایبەتی أحمد شاکر.

أحمد شاکر وەک لە کتێب و نوسراوەکانی دەردەکەوێ یاسا دانراوەکان بە ڕەهایی بە کوفر دەزانێت بەبێ هیچ مەرجێک، بەڵام لە واقعدا وەک بڵێی أحمد شاکر-ێکی تر دەبینین بەرامبەر دەسەڵاتداران، بۆ نموونە: (محمود فهمي النقراشي) سەرۆک وەزیرانی مصر، کاتێک لە کۆتایی ساڵی ١٩٤٨ بڕیاری هەڵوەشاندنەوەی حزبی ئیخوان دەدات، کەسێک لە ئیخوان هەڵدەستێ بە کوشتنی النقراشي بە چەند ڕۆژێک دوای دەرکردنی بڕیارەکە، جا کاتێک النقراشي لە ١٩٤٨/١٢/٢٨ دەکوژرێت، پێنج ڕۆژ دوای ئەم ڕووداوە أحمد شاکر لە ڕۆژنامەی (الأساس) لە بەرواری: ١٩٤٩/١/٢ نوسراوێک بڵاو دەکاتەوە دەربارەی کوشتنی النقراشي، بە ناونیشانی (الإیمان قید الفتك) کە ئەمە دەقەیەکەتی:

(جیهانی ئیسلامی و جیهانی عەرەبی توشی ترس بوون، بەڵکو زۆربەی شوێنانی تر جگە لە وولاتانی ئیسلامی و عەرەبی بەهۆی کوشتنی ئەم پیاوە، پیاو پڕ بە مانای ووشە، النقراشي شەهید الله لێی خۆش بێ، بیگەیەنێت بە ڕاستگۆیان و شەهیدان و چاکەکاران.

... پاشان دەڵێ:

بینیم کە واجبە لەسەرم ئەم کارە ڕوون بکەمەوە لە ڕووی ئیسلامەتی دروستەوە، تاکو هیچ بیانوونێک بۆ کەسی بیانوو هێنەرەوە نەبێت، وە بەڵکو الله هیدایەتی هەندێک لەم خەواریجە تاوانبارانە بدات بگەڕێنەوە بۆ دینەکەیان پێش ئەوەی ڕێگا نەبێت بۆ گەڕانەوە، وە نازانین کێ دوای النقراشي لە لیستی ئەم کەسانەدا هەیە.

الله سبحانە هەڕەشەی کردووە هەڕەشەیەکی زۆر توند لەسەر کوشتنی نەفسی حەرامکراو، لە چەند ئایەتێکدا لە کتێبەکەی ﴿وَمَن يَقۡتُلۡ مُؤۡمِنٗا مُّتَعَمِّدٗا فَجَزَآؤُهُۥ جَهَنَّمُ خَٰلِدٗا فِيهَا وَغَضِبَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَلَعَنَهُۥ وَأَعَدَّ لَهُۥ عَذَابًا عَظِيمٗا﴾ [النساء: ٩٣].

ئەمە لە شتە سەرەتاییەکانی ئیسلامە جاهیل پێش زانا دەیزانێت، وە ئەم هەڕەشەیە بۆ کوشتنی ئەنقەستە، کە لەنێوان خەڵکی ڕوو دەدات لە ڕووداوەکان و دزی کردنەکان و جگە لەمانەش، بکوژەکە کوشتن ئەنجام دەدات و دەزانێت تاوانێکی گەورە ئەنجام دەدات، بەڵام کوشتنی سیاسی کە مشتومڕێکی درێژمان دەربارەی خوێندۆتەوە، ئەمەیان حاڵی گەورەترە، ئەمەشیان شتێکی ترە.

بکوژی سیاسی کەسەکە دەکوژێت بە سینگ فراوانیەوە، دڵی ڕازییە بڕوای وایە کارێکی خێر دەکات، بەهۆی ئەم هەڵانەی کە تێیدا بڵاو بۆتەوە بڕوای وایە کارێکی حەلالی دروست ئەنجام دەدات، ئەگەر بڕوای وانەبێت کە هەڵساوە بە کارێکی ئیسلامیانە کە خەڵکانی تر کەم و کوڕیان کردووە تێیدا، جا ئەم کەسە مورتەددە لە دەرەوەی ئیسلامە پێویستە مامەڵەی مورتەددەکانی لەگەڵ بکرێت، وە حوکمی مورتەددەکانی لەسەر جێبەجێ بکرێ لە شەریعەت و یاسادا، ئەوانە خەواریجن وەک خەواریجەکانی پێشوو ئەوانەی هاوەڵانی پێغەمبەری الله-یان دەکوشت و وازیان دەهێنا لەو کەسەی دانی دەنا بە کوفر لەسەر خۆی، ڕووکەشیان وەک ڕووکەشی ئەم خەواریجانە بوو، بەڵکو باشتر بوون لەمانە، پێغەمبەری الله بە وەحی وەصفی کردوون پێش ئەوەی بیان بینێت.

... پاشان دەڵێ:

شتە سەرەتاییەکانی ئیسلام ئەمەیان بڕاندۆتەوە کە هەرکەسێک خوێنی حەڕام حەلال بکات ئەوا پەتی ئیسلامەتی لە ملی کردۆتەوە.

ئەمە حوکمی کوشتنی سیاسیە، توندترە لە کوشتنی ئەنقەست کە لەنێوان خەڵکی ڕوو دەدات، بکوژ لەوانەیە الله لێی خۆش بێ بە فەزلی خۆی، وە تۆڵە کردنەوە دەکات بە کەفارەتی تاوانەکەی بە فەزل و ڕەحمەتی خۆی، بەڵام بکوژی سیاسی سوورە لەسەر کارەکەی تا دوا ساتی ژیانی، شانازی پێوە دەکات و پێی وایە کاری پاڵەوانانەی ئەنجام داوە.

... پاشان دەڵێ:

پێغەمبەری الله ﷺ فەرموویەتی: (إن الإيمان قيد الفتك، لا يفتك مؤمن).

واتا: ئیمان موسڵمان بەند دەکات لەوەی کە خۆی هەڵداتە دۆڵی هەڵگەڕانەوە، جا ئەگەر وایکرد ئەوا ئیماندار نیە.

سەبارەت بە النقراشي، الله ڕێزی لێنا بە شەهید بوون، فەزل و کەرامەتی شەهیدەکانی هەیە لەلای الله، مردنێک مرد زۆربەی هاوەڵانی پێغەمبەری الله هیوایان دەخواست بەم مردنە، عمر بن الخطاب هیوای ئەم مردنەی دەخواست تاکو بە دەستی هێنا، جا ئەو لەلای الله پلەیەکی گەورە و بەرزی هەبوو.

وە تاوان و سەرشۆڕیش لەسەر ئەم خەواریجانە بکوژانەیە کە خوێن حەلال دەکەن، وە لەسەر ئەو کەسەشە کە بەرگریان لێ دەکات، دەیەوێ وولاتەکەمان هەڵ بداتە ناو ئەو دۆڵەی کە ئەوروپا خۆی هەڵدایە ناوی بە حەلال کردنی کوشتنی سیاسی، یان سووک کردنی سزاکەی، ئەوانە نازانن چی دەکەن، وە نامەوێ تۆمەتباریان بکەم بەوەی کە دەزانن و دەیانەوێ ئەوە بکەن، وە هیدایەتیش هیدایەتی الله-یە).

**بڕوانە [جمهرة مقالات أحمد شاكر: 1/472-475]**

ووتم: سەیرکە چۆن باسی سەرۆک وەزیرانێک دەکات و بە شەهید وەصفی دەکات کە لە سەردەمەکەی ئەودا هەر حوکم بە یاسا دانراوەکان کراوە، کەچی لە کاتی فەتوا دەرکردن موخالەفەی سەلەف دەکات و دەڵێ حوکم کردن بە یاسای دانراو بە ڕەهایی کوفرە، دواتریش شیوەن دەگێڕێ بۆ سەرۆک وەزیران و بکوژەکەش تەکفیر دەکات گوایە بە حەلالی زانیوە !!!

**المراغي** دەڵێ:

﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾ واتا: هەرکەسێک لا بدات لە حوکم کردن بەوەی الله دایبەزاندووە، **وە بیشارێتەوە** و حوکم بە غەیری ئەو بکات **وەک حوکمی یەهودییەکان** دەربارەی ژن و پیاوە زیناکەرە خێزاندارەکە بە ڕوو ڕەش کردن

و **شاردنەوەی ڕەجم**، وە حوكم كردنیان لە هەندێك كوژراو بە پێدانی حەقی خوێن بە تەواوی، وە لە هەندێك كوژراو بە پێدانی نیوەی حەقی خوێنەكە، لە كاتێكدا الله یەكسانی كردووە لەنێوان هەموویان لە حوكمدا، **جا ئەمانە كافرن كە ئەو حەقەیان شاردەوە كە لەسەریان بوو ئاشكرای بكەن و ڕوونی بكەنەوە،** شاردیانەوە و حوكمێكی تریان نیشاندان و كاریان پێی كرد، ... (دوای نەقل كردنی چەند ڕیوایەتێك لە سەلەف دەربارەی ئایەتەكە پاشان دەڵێ) **پوختەی مانای ئایەتەكە ئەمەیە: هەر كەسێك حوكم بەوە نەكات كە الله دایبەزاندووە سوكایەتی پێ بكات و ئینكاری لێ بكات، ئەوا كافرە بەهۆی ئینكاری كردن لێی و بە كەم سەیر كردنی فرمانی الله.**

**بڕوانە [تفسير المراغي : 125/6]**

***ابن تيمية*** دەڵێ:

**الله فەرموویەتی:** ﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾ **وە گومان لەوە دانیە هەر كەسێك بڕوای وانەبێت كە حوكم كردن بەوەی الله دایبەزاندووە بەسەر پێغەمبەرەكەی واجبە ئەوا ئەم كەسە كافرە، جا هەر كەسێك بە حەلالی بزانێت حوكم بكات لەنێوان خەڵكی بەوەی كە خۆی بە عەدلی دەزانێت بەبێ شوێنكەوتنی ئەوەی الله دایبەزاندووە ئەوا ئەم كەسە كافرە،** هیچ ئوممەتێك نیە ئیللا فرمان دەكات بەوەی كە حوكم بە عەدل بكرێ، جا لەوانەیە عەدل لە دینی ئوممەتەكە ئەوە بێت كە گەورەكانیان بە عەدلی دەزانن، بەڵكو زۆرینەی ئەوانەی خۆیان داوەتە پاڵ ئیسلام حوكم بە عادەتەكانیان دەكەن كە الله

سبحانه وتعالی داینەبەزاندووە، وەک عادەتی پێشینی دەشتەکیەکان، وەک فرمانی ئەوانەی کە گوێڕایەڵی دەکرێن لەناویاندا، **وە پێیان وایە ئەمە دەبێت حوکمی پێ بکرێ نەک قورئان و سوننەت، ئەمەش کوفرە**، زۆرێک لە خەڵکی موسڵمان بوونە بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا حوکم ناکەن تەنها بە عادەتە باوەکانی خۆیان نەبێ، ئەو عادەتانەی کە گوێڕایەڵی کراوەکان فرمانی پێ دەکەن، جا ئەمانە گەر زانیان دروست نیە حوکم بکرێ تەنها بەوەی الله دایبەزاندووە، وە پابەند نەبوون پێیەوە، **بەڵکو بە حەلالیان زانی حوکم بکەن بە پێچەوانەی ئەوەی الله دایبەزاندووە ئەوا ئەمانە کافرن، وە ئەگەر نا جاهیلن.**

**[منهاج السنة النبوية : 130/5]**

عبداللطيف بن عبدالرحمن بن حسن دەڵێ:

**حوکم بردنەوە حەڕامە گەر بۆ لای شەریعەتێکی باطل بێت پێچەوانەی قورئان و سوننەت بێت، وەک حوکمەکانی یۆنان و ئەوروپا و مەغۆلەکان، وە یاساکانیان کە سەرچاوەکەی بریتیە لە ڕەئی و ئارەزووەکانیان، وە بە هەمان شێوە عادەتی پێشینی دەشتەکیەکان و عادەتە باوەکانیان، جا هەرکەسێک بە حەلالی بزانێت حوکم بەمە بکات لە بابەتی خوێن و جگە لەویش ئەوا کافرە، الله تعالی فەرموویەتی:** ﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾ **ئەم ئایەتە هەندێک لە زانایانی تەفسیر باسیان کردووە کە کوفر لەم ئایەتە مەبەست پێی کوفری گەورە نیە، چونکە تێگەیشتوون گەر بووترێ کوفری گەورەیە ئەوکات ئەو کەسەش دەگرێتەوە کە حوکم بە غەیری ئەوە دەکات کە**

**الله دایبەزاندووە و بە حەلالیشی نازانێت. بەڵام زانایانی تەفسیر خیلافیان لەوە نیە ئایەتەکە ئەو کەسە دەگرێتەوە کە حوکم نەکردن بە قورئان بە حەلال دەزانێت، وە کوفرەکەی لە دین دەرخەرە.**

**[منهاج التأسيس والتقديس : لاپەرە 71]**

ووتم: بڕوانە بە حوکم کردن بە یاسای یۆنان و ئەوروپا و مەغۆلیش تەکفیریان ناکات بە ڕەهایی، بەڵکو مەرجی حەلال کردن باس دەکات.

**ابن تیمیة** دەڵێ:

مرۆڤ هەر کاتێک حەڕامێکی ئیجماع لەسەر حەلال بکات، یان حەلالێکی ئیجماع لەسەر حەڕام بکات، یان شەرعێکی ئیجماع لەسەر بگۆڕێت، ئەوا کافر و مورتەددە بە یەکدەنگی فەقیهەکان، وە بە پێی یەکێک لە دوو ووتەکەی زانایانی تەفسیر دەربارەی ئەمە فەرمایشتی الله دابەزیوە: ﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾ **واتا: حوکم کردن بە غەیری ئەوەی الله دایبەزاندووە بە حەلال دەزانێت.**

**[مجموع الفتاوى : 3/267-268]**

ووتم: زیادەڕەوەکان دونیایان پڕ کردووە بە دووبارە کردنەوەی ئەم ووتەیە، نازانم ئەم ووتەیە چ بەڵگەیەکی تێدایە بۆیان ؟ ئەصلەن بەڵگەیە لە دژیان.

**ابن تیمیة** دەڵێ:

لەفزی (شەرع) لە عورفی خەڵکدا بە سێ مانا دێت:

الشرع المنزل: ئەوەیە کە پێغەمبەر ﷺ پێی هاتووە، وە ئەمە شوێنکەوتنی واجبە، وە هەر کەسێک موخالەفەی بکات دەبێ سزا بدرێت.

دووەم: الشرع المؤول: ئەمەش ڕەئی زانا موجتەهیدەکانە، وەک مەزهەبی مالك و هاوشێوەکانی، ئەمەیان شوێنکەوتنی دروستە بەڵام واجب نیە و حەڕامیش نیە، وە بۆ هیچ کەسێک نیە تەواوی خەڵکی پابەند بکات پێیەوە، وە تەواوی خەڵکیشی لێ قەدەغە ناکرێ.

وە سێیەم: الشرع المبدل: ئەمەیان درۆیە بە ناوی الله و پێغەمبەرەکەی، یان درۆ کردنە بە دەمی خەڵکەوە بە شایەتیدانی درۆ و هاوشێوەکانی و زوڵمی ڕوون و ئاشکرا، **جا هەر کەسێک بڵێ: ئەمە لە شەرعی الله-یە ئەوا کافر بووە بەبێ خیلاف، هەروەک کەسێک بڵێ: خوێن و ئاژەڵی مردارەوە بوو حەلالە، ئەگەرچی بڵێ: ئەمە مەزهەبی منە یان قسەیەکی لەم جۆرە.**

**[مجموع الفتاوى : 3/268]**

**ابن تيمية** دەڵێ:

گەر حاکم کەسێکی دەست گرتوو بێت بە دین بەڵام حوکم بکات بەبێ عیلم ئەوا لە ئەهلی دۆزەخ بێ، وە ئەگەر زانا بێت بەڵام حوکم بکات بە پێچەوانەی ئەو حەقەی کە دەیزانێ ئەوا لە ئەهلی دۆزەخ بێ، جا ئەگەر حوکم بکات بەبێ عەدل و بەبێ عیلم ئەوا لە پێشترە کە ئەهلی دۆزەخ بێ، ئەمە گەر حوکم بکات لە بابەتێکی دیاریکراو بۆ کەسێک، **بەڵام گەر حوکمێکی گشتی بکات لە دینی موسڵمانان، حەق بکات بە باطل و باطلیش بکات بە حەق، سوننەت بکات بیدعە و بیدعەش بکات بە**

**سوننەت، باش بکات بە خراپ و خراپیش بکات بە باش، وە نەهی بکات لەوەی کە الله و پێغەمبەرەی فرمانیان پێی کردووە، وە فرمان بکات بەوەی کە الله و پێغەمبەرەکەی نەهیان لێی کردووە، ئەمەیان جۆرێکی ترە،** پەروەردگاری جیهانیان و ئیلاهی پێغەمبەران و خاوەنی ڕۆژی پاداشت و حیساب حوکمی تێدا دەکات.

[مجموع الفتاوى : 388/35]

ووتم: گەر حاکم حوکمێکی گشتی بکات لە دینی موسڵمانان، حەق بکات بە باطل و باطلیش بکات بە حەق، سوننەت بکات بە بیدعە و بیدعەش بکات بە سوننەت، فرمان بە خراپە بکات و نەهی لە چاکە بکات، ئینجا سەرەڕای هەموو ئەمانە ابن تیمیة دوو دڵە لە حوکمدان لەسەری، حوکمەکەی دەگەڕێنێتەوە بۆ لای الله.

**الراغب الأصبهاني** دەڵێ:

**فەرمایشتی الله:** ﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾ **خەواریجەکان پێیەوە بەستەن، پێیان وایە ئەوەی تەرکی حوکمی الله بکات کافرە لە هەموو حاڵێکدا.**

[تفسير الراغب الأصبهاني : 1/361-362]

**القاضي أبو يعلى** (دەربارەی تەکفیر کردنی فاسق لەلایەن خەواریجەوە) دەڵێ:

بەڵگەی هێنایەوە بە فەرمایشتی الله: ﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾ ڕووکەشی ئەمە تەکفیر کردنی پێشەوایە زاڵمەکانی لێ دەکەوێتەوە، ئەمەش ووتەی ئێمەیە.

**وەڵامی ئەم ووتەیە: مەبەست لەم ئایەتە یەهودە**، ئەوەی ئەمە ڕوون دەکاتەوە ئەوەیە کە الله جل وعز باسی یەهودی کرد، فەرمووی: ﴿فَإِن جَآءُوكَ فَٱحۡكُم بَيۡنَهُمۡ أَوۡ أَعۡرِضۡ عَنۡهُمۡۖ﴾ تا فەرمایشتی: ﴿وَكَيۡفَ يُحَكِّمُونَكَ وَعِندَهُمُ ٱلتَّوۡرَىٰةُ فِيهَا حُكۡمُ ٱللَّهِ﴾ دواتر فەرمووی: ﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾ ئینجا باسکردنی یەهودی بە کۆتا نەهێنا، بەڵکو فەرمووی: ﴿وَكَتَبۡنَا عَلَيۡهِمۡ فِيهَآ أَنَّ ٱلنَّفۡسَ بِٱلنَّفۡسِ﴾ تا فەرمایشتی: ﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ﴾ ﴿وَقَفَّيۡنَا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم بِعِيسَى ٱبۡنِ مَرۡيَمَ﴾ [المائدة:٤٢-٤٦]، **جا کاتێک چیرۆکەکە سەرەتاکە وکۆتاییەکەی دەربارەی یەهود بێت، ئەوا ئایەتەکەش بۆ ئەوانە.**

**[مسائل الإيمان : لاپەرە 340-341]**

**ابن تيمية** دەڵێ:

ئەو تاوانانەی کە حەددی دیاریکراو وکەفارەتی تێدا نیە وەک ئەو کەسەی منداڵێک ماچ دەکات یان ئافرەتی نامەحرەم یان پێستی بەر پێستی دەکەوێ بەبێ جووت بوون، یان شتێک دەخوات کە بۆی حەلال نیە وەک خوێن و ئاژەڵی مردارەوە بوو، یان خەڵکی تۆمەتبار دەکات بە شتانێک جگە لە زینا، یان شتێک دەدزێت کە لە شوێنێکی پارێزراو هەڵنەگیراوە یان شتێکی کەم دەدزێت، یان خیانەت لە ئەمانەتەکەی دەکات وەک ئەو کەسەی وەکیلی پارە و سامانی بیت المال-ە، یان ئەو شتانەی وەقف کراون، وە ماڵی یەتیم و ئەم جۆرە شتانە گەر خیانەتیان تێدا کرد، وەک وەکیلەکان و شەریکەکان گەر خیانەت بکەن یان فێڵ بکەن لە مامەڵە کردن وەک ئەوانەی فێڵ دەکەن لە خواردن و جل و بەرگ و ئەم جۆرە شتانە، یان فێڵ دەکات لە پێوان و

کێشان، یان شایەتی دەدات بە درۆ یان شایەتیدانی درۆ فێری خەڵک دەکات، **یان بەرتیل وەردەگرێ لە حوکم کردنی، یان حوکم دەکات بە غەیری ئەوەی الله دایبەزاندووە**، یان دەستدرێژی دەکاتە سەر ژێردەستەکانی، یان خۆی بەو شتانە هەڵدەکێشێ کە لە جاهیلی خۆیان پێ هەڵدەکێشا، یان بە دەم هاوار و بانگەوازی جاهیلی دەچێت، وە جگە لەمانەش لە جۆرەکانی شتە حەڕامکراوەکان، **جا ئەمانە سزا دەدرێن وەک تەمبێ کردن و تۆڵە کردنەوە و فێرە ئەدەب کردن، بە قەدەر ئەوەی کە کار بەدەست بە باشی دەزانێت بە پێی زۆری و کەمی ئەم تاوانە لە ناو خەڵکیدا، جا گەر زۆر بێت ئەوا سزاکە زیاد دەکات، بە پێچەوانەی ئەوەی کە تاوانەکە کەم بێت.**

[السیاسة الشرعیة : لاپەرە 144-145]

ووتم: بڕوانە بەرتیل وەرگرتن لە حوکم و حوکم کردن بە غەیری ئەوەی الله دایبەزاندووە هەردووکیان بەو تاوانانە هەژمار کرد کە حەد و کەفارەتیان لەسەر نیە، چ جای ئەوەی تەکفیریان بکات ! لە شەرعدا کوفر و تاوان هەیە، کوفر حەددی هەڵگەڕانەوەی لەسەر جێبەجێ دەکرێ کە کوشتنە، تاوانیش سزای جۆراو جۆری هەیە، هەیانە حەددەکەی کوشتنە یان رەجمە، هەیانە حەددەکەی قامچیە، هەیانە حەددەکەی دەست بڕینە، هەیانە کەفارەتی لەسەرە وەک شکاندنی سوێند یان الظهار یان چوونە لای ئافرەت لە ڕۆژووی رەمەزاندا، یان چوونە لای ئافرەت لەکاتی سوڕی مانگانەدا، وە هەیانە هیچ حەد و کەفارەتێکی بۆ دانەنراوە حاکم سەرپشکە لەوەی بە چ سزایەک تەمبێ دەکات، جا ابن تیمیة حوکم نەکردن بە قورئانی لەم جۆرە داناوە، کە لێرەدا مەبەست پێی ئەو ئەمیرانەیە کە لەلایەن خەلیفەی موسڵمانانەوە دادەنرێن، واتا خەلیفە ئەمیرەکانی تەمبێ بکات، ئەگینا گەر خەلیفە خۆی

وابكات ئەوا كەس دەسەڵاتی بەسەریەوە نیە تا تەمبێی بكات، ئینجا ابن تیمیة باسی زۆری و كەمی تاوانەكەی كرد، نەیووت گەر جارێک و دووان حوكمی نەكرد بە قورئان تاوانە بەڵام گەر زۆر بوو دەبێتە كوفر، بەڵكو ووتی بە پێی زۆری و كەمی تاوانەكە سزا دەدرێت، تا تاوانەكەی زۆرتر بێت سزاكەی زیاتر دەبێت.

**الشاطبي** دەربارەی ئایەتی: ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَٰفِرُونَ﴾ دەڵێ:
ئەگەرچی دەربارەی یەهود دابەزیوە، وە سیاقی ئایەتەكەش بەڵگەیە لەسەری، پاشان زانایان جگە لە كافرانیشیان خستە ناو ئایەتەكەوە، **وە ووتیان: كفر دون كفر-ە.**
**[الموافقات : 211/2]**

**ابن حزم** دەڵێ:
**ئەوەی تاوانباران تەكفیر دەكات بەڵگەی هێناوەتەوە بە فەرمایشتی الله عز وجل:** ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَٰفِرُونَ﴾ وە بە فەرمایشتی الله تعالى: ﴿فَأَنذَرْتُكُمْ نَارًا تَلَظَّىٰ﴾ ﴿لَا يَصْلَىٰهَآ إِلَّا ٱلْأَشْقَى﴾ ﴿ٱلَّذِى كَذَّبَ وَتَوَلَّىٰ﴾ **[الليل : ١٤-١٦]**.
**[الفصل في الملل والأهواء والنحل : 275/3]**

**ابن حزم** دەڵێ:
الله عزوجل فەرموویەتی: ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَٰفِرُونَ﴾ ، ﴿وَلْيَحْكُمْ أَهْلُ ٱلْإِنجِيلِ بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فِيهِ ۚ وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ﴾ ، ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ﴾ **جا موعتەزیلە پابەند دەبن بەوەی كە بڵێن**

**هەموو تاوانبارێک و زاڵمێک و فاسقێک کافرە، چونکە هەر کەسێک کە تاوان ئەنجام دەدات ئەوا حوکمی نەکردووە بەوەی کە الله دایبەزاندووە.**

**[الفصل في الملل والأهواء والنحل : 3/278-279]**

**الحسين و عبدالله** (دوو کوڕەکەی شێخ محمد بن عبدالوهاب) :

پرسیاریان لێ کرا دەربارەی سوێند خواردن بە غەیری الله، وەک سوێند خواردن بە پێغەمبەر و بە وەلی، یان بە سەری فلان، یان بە خۆڵەکەی گۆڕی فلان، ئایا دەبێتە شیرک ؟ یان مەکروهە ؟

وەڵامیان دایەوە: سوێند خواردن بە غەیری الله لە جۆرەکانی شیرکی بچووکە، وە دەبێتە شیرکی گەورەش بە پێی حاڵ و مەبەستی کەسی سوێند خواردوو، **وە کوفر و شیرک چەند جۆرێکن، هەیانە لە دین دەرخەر نیە، وەک ابن عباس** رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا **دەربارەی فەرمایشتی الله تعالی:** ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَٰفِرُونَ﴾ **ووتی: کفر دون کفر، و ظلم دون ظلم، و فسق دون فسق.**

**[الدرر السنية : 10/148]**

**محمد بن إبراهيم آل الشيخ** دەڵێ:

بەدی هێنانی مانای (محمد رسول الله) بریتیە لە حوکم کردن بە شەریعەتەکەی و پابەند بوون پێیەوە، وە فڕێدانی هەر شتێک کە موخالەفەی شەریعەتەکەی دەکات لە یاسا دانراوەکان و باقی شتەکانی تر کە الله هیچ بەڵگەیەکی لەسەر دانەبەزاندووە، **کە هەر کەسێک حوکمی پێ بکات یان حوکم بەرێتەوە بۆ لای، بڕوای وابێت**

**ئەم کارە دروستە و جائیزە، ئەوا ئەم کەسە کافرە کوفرێکی لە دین دەرخەر، وە ئەگەر ئەم کارە بکات بەبێ بڕوا بوون بە دروستی و جائیزی کارەکە، ئەوا کافرە کوفرێکی عەمەلی کە لە دین دەرخەر نیە. (١٣٨٥/١/٩ هـ).**

**[فتاوى ورسائل محمد بن إبراهيم آل الشيخ : 80/1]**

ووتم: (رسالة تحكيم القوانين) لە ساڵی (١٣٨٠ هـ) بۆ یەکەم جار چاپ کرا، کە محمد بن إبراهیم زۆر بە ڕوونی تێیدا جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە حوکم کردن بە یاسا دانراوەکان کوفری گەورەیە، بەبێ مەرجدار کردنی حەلال کردن و ئینکار کردن و ئەو مەرجانەی کە سەلەف باسیان کردووە، بەڵام ئەم فەتوایەی کە تازە نەقلمان وەک دەبینن لە ساڵی ١٣٨٥ نوسیویەتی، واتا پێنج ساڵ دوای چاپ کردنی (رسالة تحكيم القوانين) ئەم فەتوایەی داوە کە تێیدا لەسەر مەزهەبی سەلەف ڕۆیشتووە و دەڵێ: گەر حوکم کردن بە یاسای دانراو یان حوکم بردنەوە بۆ یاسای دانراو بە حەلال نەزانێت ئەوا کوفری عەمەلیە لە دین نایخاتە دەرەوە.

جا من لێرەدا نامەوێ بڵێم شێخ محمد بن إبراهیم لە ناوەڕۆکی (رسالة تحكيم القوانين) پەشیمان بۆتەوە یان نا، چونکە ئەم نامەیەی شێخ ناوبانگێکی زۆری هەیە بە پێچەوانەی ئەم فەتوایەی دواتری کە وەڵامی پرسیاری کەسێک دەداتەوە، نامەکە وەک بەرهەمێکی سەربەخۆی شێخ چاپ کرا لە ژیانیدا، چونکە شێخ ساڵی ١٣٨٩ مردووە، واتا ٩ ساڵ بەر لە مردنی چاپ کراوە، جا کاتێک لە ساڵی ١٣٨٥ ئەم فەتوایە نوێیە دەدات کە پێچەوانەی نامە چاپ کراوەکەیەتی ئەوا جێگای خۆی بوو کە ئاماژە بەوە بدات پێشتر لە نامەیەکدا بە پێچەوانەی ئێستا فەتوام داوە، چونکە نامەکە بڵاو بوویەوە و دەنگۆیەکی زۆری هەبوو، وە ئێستاش هەیەتی، بەڵام ئەم فەتوایە تەنها بۆ یەک کەس دراوە کە پرسیاری کردووە لە شێخ، ئینجا ١٠ ساڵ دوای مردنی شێخ فەتوا و نامەکانی کۆکراونەتەوە و چاپ کراون، بۆیە لە بابەتێکی ئاوا هەستیار و گەورەدا گەر پەشیمان بوونەوە لە ئارادا بێت ئەوا دەبوو شێخ بە

نامەیەکی ئاشکرا یان نامیلکەیەک یان نوسراوێک ئەمە بخاتە ڕوو کە پەشیمان بۆتەوە، بەڵام سەرەڕای دەرنەبڕینی پەشیمانی ئەوا هیچ گومان لەوەدا نیە کە ئەم فەتوا تازەیەی شێخ پێچەوانەی (رسالة تحكيم القوانين)ە، بۆیە ئەوانەی وازیان لە ڕێبازی سەلەف هێناوە شوێنی شێخ کەوتوون ئەوا با بیریان نەچێت کە شێخ دواتر ئەم فەتوایەشی داوە، ئەمە لە کاتێکدا کە ووتەی سەلەف هەبوو لە بابەتەکە ئاوڕ لە ووتەی هیچ کەسێکی تر نادەینەوە بۆ بنیات نانی عەقیدەمان دەربارەی بابەتەکە، تەنها بۆ دەوڵەمەند کردنی بابەتەکە دەیهێنین.

**عبداللطيف بن عبدالرحمن بن حسن** (لە نامەیەکدا بۆ هاوڕێیەکی) دەڵێ:

ئەوەی باست کرد دەربارەی دەشتەکیەکان **لە جیاوازی کردن لەنێوان ئەوەی حوکم کردن بە غەیری ئەوەی الله دایبەزاندووە بە حەلال دەزانێت و ئەوەی حوکم کردن بە غەیری ئەوەی الله دایبەزاندووە بە حەلال نازانێت، ئەم جیاوازی کردنەیە کە کاری پێ دەکرێت و ئەهلی عیلم بۆی دەگەڕێنەوە.**

[مجموعة الرسائل والمسائل النجدية : 311/3]

ووتم: بڕوانە جیاوازی کردن لەنێوان ئەوەی بە حەلالی زانیوە یان بە حەلالی نەزانیوە بە مەزهەبی جەهمی و مورجیئە نازانێت، بەڵکو دەڵێ ئەهلی عیلم دەگەڕێنەوە بۆ ئەم جیاوازی کردنە و لەسەری دەڕۆن.

**سليمان بن سحمان** (دەربارەی ووتەکەی پێشووی شێخ عبداللطيف) دەڵێ:

واتا: گەر حوکم کردن بە غەیری ئەوەی الله دایبەزاندووە بە حەلال بزانێ، وە پێی وابێ حوکمی طاغوت باشترە لە حوکمی الله، وە ئەو کەسانەی لە شارەکان دەژین هیچ نازانن جگە لە حوکمەکانی میرات، وە ئەوەی دەشتەکیەکان لەسەری دەڕۆن لە

حوکمی پێشینانیان و عادەتەکانیان ئەوەیان حەقە، هەرکەسێک ئەم بڕوایەی هەبێت ئەوا کافرە، **بەڵام ئەو کەسەی ئەمە بە حەلال نەزانێ، وە پێی وایە حوکمی طاغوت باطلە، وە حوکمی الله و پێغەمبەرەکەی حەقن، ئەوا ئەم کەسە کافر نابێت و لە ئیسلام ناچێتە دەرەوە.**

**[مجموعة الرسائل والمسائل النجدية : 309/3]**

ووتم: گەر یەکێک بڵێ: چۆن دەکرێ شێخ عبداللطیف لە لاپەرە 311 ئەم قسەیە بکات، کەچی سلیمان بن سحمان لە لاپەرە 309 ووتەکەی ئەو ڕوون بکاتەوە، لە کاتێکدا ڕوونکردنەوە لە دوای ووتەکە دێت نەک پێش ووتەکە ؟!

لە وەڵامدا دەڵێم: سلیمان بن سحمان بەم جۆرە نامە و فەتواکانی شێخ عبداللطیف-ی کۆکردۆتەوە و دایڕشتووە، سەرەتا باسی نامە و فەتوا و وەڵامەکانی شێخ عبداللطیف دەکات، ئینجا دواتر دەقی ووتەکەی شێخ نەقل دەکات، لێرەشدا سەرەتا ڕوونی کردۆتەوە پاشان دەڵێ ئەمەش دەقی ووتەکەیەتی.

**ابن تيمية** (دەربارەی خەواریجەکان) دەڵێ:

ووتیان: عثمان و علي ئەوانەشی کە پشتیوانی و دۆستایەتیان دەکەن حوکمیان کردووە بە غەیری ئەوەی الله دایبەزاندووە، ﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾ جا بەمە و بە غەیری ئەمەش موسڵمانانیان تەکفیر کرد، وە تەکفیری ئەم خەواریجانە و تەکفیری تەواوی ئەهلی بیدعەکان لەسەر دوو پێشەکی باطل بنیات نراوە، یەکێکیان، ئەمە موخالەفەی قورئانە، وە دووەمیان: **هەر کەسێک موخالەفەی قورئان بکات کافر دەبێت ئەگەرچی هەڵەش بێ یان تاوانبار بێ**

**بڕوای بە واجبەکان و حەڕامکراوەکان هەبێت.**

[مجموع الفتاوى : 13/208-209]

**محمد أبو زهرة** دەڵێ:

ئایا هەر کەسێک حوکم بەوە نەکات کە الله تعالى دایبەزاندووە بەسەر پێغەمبەرانی کافرە ؟

ئەوەی بۆم دەردەکەوێ: ئەوەی حوکم بە غەیری حوکمی الله بکات سوکایەتی پێ بکات و ئینکاری لێ بکات، لەوانەیە پلەی ئینکاری لێ کردنی بگات بە سوکایەتی و گاڵتە کردن پێی، جا ئەمە بە کافر دادەنرێت، چونکە ئەمە ئینکاری و گاڵتە کردنە بە ئایەتەکانی الله گەر بزانێ ئەم حوکمە لەلای الله تعالى هاتووە و ئینکاری جێبەجێ کردنی بکات، وە ئەوەی ئینکاری حوکمەکانی قورئان بکات ئەوا کافر بووە، **عبدالله بن عباس دەربارەی ئەمە وتوویەتی: ئەوەی ئینکاری حوکمی الله بکات کافر بووە، وە ئەوەی حوکمی پێ نەکات و دانی پێ بنێت ئەوا زاڵم و فاسقە.**

**جا بە پێی ئەمە دەقی ئەم ئایەتە دەربارەی ئەو کەسە هاتووە کە حوکم بە غەیری حوکمی الله تعالى دەکات و ئینکاری لێ دەکات.**

[زهرة التفاسير : لاپەرە 2204]

**أبو منصور الماتريدي** دەڵێ:

فەرمایشتی الله تعالى: ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَٰفِرُونَ﴾ **بەم جۆرە ئەوەی ئینکاری حوکم کردن بەوەی الله دایبەزاندووە بکات، وە بە حەقی نەزانێ**

**ئەوا کافرە.**

[تفسير القرآن العظيم : 42/2]

**أبو منصور الماتريدي** دەڵێ:

فەرمایشتی الله تعالى: ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ﴾ **ئەمە گەر واز بهێنێت لە حوکم کردن بەوەی الله دایبەزاندووە بە ئینکار کردنەوە، ئەوا کافرە.**

[تفسير القرآن العظيم : 43/2]

**أبو منصور الماتريدي** دەڵێ:

فەرمایشتی الله تعالى: ﴿وَلْيَحْكُمْ أَهْلُ ٱلْإِنجِيلِ بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فِيهِ ۚ وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ﴾ الله لە شوێنێکدا فەرمووی: ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَٰفِرُونَ﴾ وە لە شوێنێکدا فەرمووی: ﴿ٱلظَّٰلِمُونَ﴾ وە لە شوێنێکدا فەرمووی: ﴿ٱلْفَٰسِقُونَ﴾ جا دەکرێ هەمووی یەک شت بێ، **ئەوەی حوکم بەوە نەکات کە الله دایبەزاندووە ئینکاری لێ بکات و بە سوک سەیری بکات ئەوا کافر و زاڵم و فاسقە، وە دەکرێ ئەو کوفرەی کە باس کراوە بە واز هێنان لە حوکم کردن بەوەی الله دایبەزاندووە بە ئینکار کردنەوە بێت، وە ئەو زوڵم و فسقەی کە باس کراوە دەربارەی موسڵمانان بێت**، چونکە فەرمووی: ﴿وَكَتَبْنَا عَلَيْهِمْ فِيهَآ أَنَّ ٱلنَّفْسَ بِٱلنَّفْسِ وَٱلْعَيْنَ بِٱلْعَيْنِ وَٱلْأَنفَ بِٱلْأَنفِ وَٱلْأُذُنَ بِٱلْأُذُنِ وَٱلسِّنَّ بِٱلسِّنِّ وَٱلْجُرُوحَ قِصَاصٌ ۚ﴾ دواتر فەرمووی: ﴿فَمَن تَصَدَّقَ بِهِۦ فَهُوَ كَفَّارَةٌ لَّهُۥ ۚ﴾ دواتر فەرمووی: ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ

أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ﴾ **وازیان هێنا لە حوکم کردن بەوەی الله دایبەزاندووە بەهۆی شوێنکەوتی ئارەزووەکانیانەوە نەک ئینکاری کردن لێی.**

**[تفسير القرآن العظيم : 2/43-44]**

ووتم: واتا گەر بەبێ ئینکاری کردن حوکم نەکەن بە قورئان ئەوا زوڵم و فسقە.

**محمد بن علي بن غريب** (زاوای شێخ محمد بن عبدالوهاب) دەڵێ:

عكرمة وتوویەتی: هەر کەسێک لە دڵیەوە بزانێ کە ئەمە حوکمی الله-یە، بەڵام بە زمان دانی پێ نەنێت و بە دڵیش ملکەچی نەبێت بەڵکو ئینکاری لێ بکات، ئەوا کوفری کردووە کوفرێک کە ئیمانی لەگەڵدا نیە، بەڵام ئەوەی بە دڵ و زمانی دانی پێ بنێت کە ئەمە حوکمی الله-یە، بەڵام هەڵە بکات لە پێکان **یان حوکم بکات بە پێچەوانەی حوکمی الله لەگەڵ زانینی حوکمی الله و دان پێدانانی، ئەوا کوفر نیە، وە ابن عباس و طاوس وتوویانە: کوفرێک نیە لە دین دەرخەر بێت. بەڵکو هەر کاتێک ئەم کارەی تێدا بینرا ئەوا کوفری کردووە، بەڵام وەک ئەو کەسە نیە کە کافر بێت بە الله و بە ڕۆژی دوایی.**

وە پرسیار کرا لە عبدالعزيز بن يحيى الكناني دەربارەی فەرمایشتی الله تعالى: ﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾ جا ووتی: ئەم ئایەتە هەموو ئەو شتانە دەگرێتەوە کە الله تعالى دایبەزاندووە نەک هەندێکی، جا هەر کەسێک حوکم بە هەموو ئەو شتانە نەکات کە الله دایبەزاندووە ئەوا کافر و زاڵم و فاسقە. **بەڵام ئەوەی حوکم بەوە بکات کە الله دایبەزاندووە لە تەوحید و واز هێنان لە**

**شیرک، پاشان حوکم بە هەندێک شت نەکات کە الله دایبەزاندووە لە شەرائیعەکان کە سەرچاوەکەی بابەتە فەرعیەکانە، ئەوا کوفر جێگیر ناکات بە حەقیقی، ووتەکەی ابن عباس و طاوس-یش هەر بەمە لێک دەدرێتەوە.**

**[التوضيح عن توحيد الخلاق في جواب أهل العراق : 1/421-422]**

ووتم: پێشتر ئەم ووتەیەی عبدالعزيز الكناني-مان ڕوون کردەوە کە مەبەستی لە هەموو حوکمەکان ئەوەیە کە تەوحید و واز هێنان لە شیرکیش دەگرێتەوە هەروەک خۆی باسی دەکات، جا بۆیە بەمە تەکفیری دەکات، بەڵام گەر حوکمی بە تەوحید کرد و وازی هێنا لە شیرک ئەوا موسڵمانە ئەگەرچی حوکم بە باقی شەرائیعەکانی تر نەکات کە پەیوەندیان بە تەوحیدەوە نیە.

ئەم کتێبە لە چاپی العامرة الشرفية و دار طيبة دراوەتە پاڵ شێخ سليمان بن عبدالله کە نەوەی شێخ محمد بن عبدالوهاب-ە، بەڵام ئەمە هەڵەیە، ئەوەی دروستە کتێبەکە هی شێخ محمد بن علي بن غريب-ە وەک لە چاپی دار التوحيد هاتووە، کە کچی شێخ محمد بن عبدالوهاب لەلای بووە، وە 3 ساڵ دوای وەفاتی شێخ محمد ئەویش مردووە، تەنانەت کاتێک ئەم کتێبەی نوسیوە تەمەنی شێخ سليمان بن عبدالله 18 ساڵ یان کەمتریش بووە، ئەمەش دوورە کە لەناو ئەم هەموو زانایەی نەجد گەنجێکی تەمەن بچووک هەڵسێ بە نوسینی کتێبێک کە کتێبەکەش کتێبێکی ئاسایی نیە، بەڵکو ڕەددانەوەیە بۆ زانایەکی عیراقی بەناوی (عبدالله أفندي الراوي) کە هێرشی کردۆتە سەر شێخ محمد بن عبدالوهاب، زاواکەشی بەم کتێبە وەڵامی داوەتەوە، جا کوڕەکانی شێخ و زاواکەی لە پێشترن هەڵسن بەم کارە نەک نەوەکەی کە تازە پێدەگات، ئەمە وەک وەڵامێکی عەقڵانی، جگە لەوەش ئەو دەستنوسەی کەوتۆتە دەستی تەحقیق کەرانی ئەم کتێبە ئەوە پشت ڕاست دەکاتەوە کە کتێبەکە هی شێخ محمد بن علي بن غريب-ە.

وە خاڵێک هەیە بە پێویستی دەزانم ئاماژەی پێ بدەم، ئەویش ئەمەیە کە شێخ محمد بن علي بن غريب لەم کتێبەدا زۆربەی ووتەی زانایان بە ماناوە نەقل دەکات نەک بە هەمان لەفزەوە، بۆیە دەبینین لەکاتی نەقل کردنی ووتەکاندا هەمان لەفز نیە بەڵکو بە تەعبیری خۆی مانا و مەبەستی ووتە نەقل کراوەکە دەردەبڕێ و تەفصیلی پێ دەدات.

**محمد بن علي بن غريب** (لە وەڵامدانەوەی عبدالله أفندي الراوي) دەڵێ:

وە سەبارەت بە ووتەکەتان کە دەڵێن: (الفريابي و سعيد بن منصور و ابن المنذر و جگە لەمانەش ڕیوایەتیان کردووە لە ابن عباس رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا لە تەفسیری فەرمایشتی الله تعالى: ﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾ وتوویەتی: ئەمە کوفرێک نیە لە دین دەرخەر بێت، کفر دون کفر-ە، وە عطاء وتوویەتی: کفر دون کفر، و ظلم دون ظلم، و فسق دون فسق).

**دەڵێین: ووتەکەی ابن عباس رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا دەربارەی کەسێکە کە حوکم نەکات بەوەی الله دایبەزاندووە لەو شەرائیعانەی کە سەرچاوەکەی تایبەتە بە بابەتە فەرعیەکان**، لەگەڵ دان پێدانانی دڵ و ووتنی بە زمان کە ئەوەی لێی لاداوە حوکمی الله بوو، هەروەک عکرمة لە فەرمایشتی الله تعالى: ﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾ ووتی: هەر کەسێک لە دڵیەوە بزانێ کە ئەمە حوکمی الله-یە، بەڵام بە زمان دانی پێ نەنێت و بە دڵ ملکەچی نەبێت بەڵکو ئینکاری لێ بکات، ئەوا کوفری کردووە کوفرێک کە ئیمانی لەگەڵدا نیە.

بەڵام ئەو کەسەی بە دڵ دانی پێ دەنێت و بە زمان دەری دەبڕێت کە ئەمە حوکمی الله-یە، بەڵام هەڵە دەکات لە پێکان، **وە حوکمێکی پێچەوانەی حوکمی الله**

**دەهێنێ لە بابەتە فەرعیەکان کە پەیوەندی بە ئەصلەوە نیە بەبێ حەلال کردنی کارەکەی، ئەوا ناچێتە ناو کوفری حەقیقیەوە.**

**[التوضيح عن توحيد الخلاق في جواب أهل العراق : 1/422-423]**

ووتم: بڕوانە ووتی: (حوکمێکی پێچەوانەی حوکمی الله دەهێنێ لە بابەتە فەرعیەکان، بەڵام بەبێ حەلال کردنی کارەکەی، ئەوا کوفری گەورە نیە)

پوختەی ووتەکەی: مادام بابەتەکە غەیری تەوحید بێت کە ئەو بە بابەتە فەرعیەکان ناوی دەبات، گەر یاسای بەند کردن لە بڕی دەست بڕین بۆ دز دەربکات ئەوا کافر نابێت مادام کارەکەی خۆی بە حەلال نازانێت یان بە باشتر نازانێت، بەڵام گەر بابەتە تەوحید بوو کە ئەو بە بابەتە ئەصلەکان ناوی دەبات ئەوا بە ڕەهایی کافرە بەبێ هیچ مەرجێک.

**محمد بن علي بن غريب** دەڵێ:

علي بن أبي طلحة لە ابن عباس رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا ڕیوایەتی کردووە کە دەڵێ: ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَٰفِرُونَ﴾ هەرکەسێک بە دڵ ملکەچی نەبێت و بە زمان دانی پێ نەنێت ئەوا کوفری کردووە کوفرێکی حەقیقی، **وە ئەوەی دانی پێ بنێت و ملکەچی بێت بەڵام لە ڕووکەشدا حوکمی پێ نەکات، ئەوا زاڵم و فاسقە**، ابن جرير ڕیوایەتی کردووە.

**[التوضيح عن توحيد الخلاق في جواب أهل العراق : 1/424]**

**محمد بن علي بن غريب** دەربارەی ئایەتی: ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَٰفِرُونَ﴾ دەڵێ:

سەبەب نزولی ئایەتەکە ئەگەرچی تایبەتە بە ئەهلی کیتاب، بەڵام عمومی لەفزەکەی گەر نەسخ نەبوو بێتەوە ئەوا ڕەچاو دەکرێت، چونکە فەرمایشتی الله: ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ﴾ ووشەی (مَن)ی تێدایە لە ڕستەیەکی (شرطي)دا، جا حوکمەکە بۆ هەمووانە، **بەڵام تەحقیقی مانای ئایەتەکە ئەمەیە: حوکم کردن بە غەیری ئەوەی الله دایبەزاندووە گەر لە بابەتە ئەصلەکان بێت وەک تەوحید و واز هێنان لە شیرک، یان لە بابەتە فەرعیەکان بێت بەڵام بە زمانی دانی پێ نەنێت و بە دڵ ملکەچی نەبێت ئەوا کوفری حەقیقیە ئیمانی لەگەڵدا نیە، هەروەک پێشتر هێنامان لە عکرمة-وە، بەڵام ئەوەی بە دڵ و زمانی دان بە حوکمی الله بنێت بەڵام لە ڕووکەشدا حوکم بە پێچەوانەکەی بکات بە تایبەت لە بابەتە فەرعیەکان ئەوا کوفرێک نیە لە دین دەرخەر بێت.**

طاوس دەڵێ: وەک ئەو کەسە نیە کە کافرە بە الله و فریشتەکانی و کتێبەکانی و پێغەمبەرانی.

وە الثوري دەڵێ: عن ابن جريج عن عطاء ووتی: ئەمە كفر دون كفر-ە، وظلم دون ظلم-ە، و فسق دون فسق-ە. ابن جرير ڕیوایەتی کردووە.

**[التوضيح عن توحيد الخلاق في جواب أهل العراق : 425/1]**

## محمد بن علي بن غريب دەڵێ:

وکیع دەڵێ: (عن سعید المكي) عن طاوس ووتی: حوکم کردن بە غەیری ئەوەی الله دایبەزاندووە **لە بابەتە فەرعیەکان** لەگەڵ دان پێدانان بە حوکمەکەی و هەبوونی خۆشویستن بۆی، **لە دین دەرخەر نیە.**

لە طاوس-ەوە ڕیوایەت کراوە ئەویش لە ابن عباس-ەوە کە وتوویەتی: ئەو کوفرە نیە کە ئێوە بۆی دەچن، الحاکم ڕیوایەتی کردووە، وە دەڵێ: لەسەر مەرجی البخاري و مسلم-ە، بەڵام ڕیوایەتیان کردووە.

**وە خەواریجەکان بۆ ئەوە چوون کە حوکمەکە گشتیە بەهۆی ڕووکەشی ئایەتەکە، وە ووتیان: ئەم ئایەتە دەقە دەربارەی هەر کەسێک کە حوکم بە غەیری ئەوە بکات الله دایبەزاندووە ئەوا کافرە، وە هەر کەسێک تاوان بکات ئەوا حوکمی بە غەیری ئەوە کردووە کە الله دایبەزاندووە جا دەبێ کافر بێت، وە ئیجماعی ئەهلی سوننەت و جەماعەت دامەزراوە بە پێچەوانەی ووتەی خەواریجەکان.**

وە ئێمە کەسمان تەکفیر نەکردووە تەنها ئەوە نەبێت کە حوکمی بەوە نەکردووە کە الله دایبەزاندووە **لە تەوحید، بەڵکو حوکمی بە پێچەوانەکەی کردووە و شیرکی ئەنجام داوە و پشتیوانی ئەهلی شیرکی کردووە و سەری خستوون بەسەر موەحیدان.**

[التوضيح عن توحيد الخلاق في جواب أهل العراق : 426/1]

ووتم: (وكيع عن سعيد المكي) هەڵەیە، ڕاستەکەی ئەمەیە: (وكيع عن سفيان عن سعيد المكي)، لەهەر سێ چاپەکەی ئەم کتێبە سفیان کەوتووە، وە هیچ کام لە محققەکان ئاماژەیان پێ نەداوە، ئەمەش ڕەنگە هەڵەی نوسەری کتێب بێت لەکاتی نەقل کردندا لێی کەوتبێ.

**محمد بن علي بن غريب** (لە وەڵامدانەوەی عبدالله أفندي الراوي) دەڵێ:

سەبارەت بە ووتەکەتان کە دەڵێن: (وكيع دەڵێ: عن سفيان عن ابن جريج عن عطاء

ووتی: كفر دون كفر، وظلم دون ظلم، و فسق دون فسق).

دەڵێین: ئەمە خودی ئەو ووتەیە کە ابن القيم و جگە لەویش وتوویانە، **نەقلیان کردووە لە هاوەڵان و تابعین**، کە کردەوە ئاشکراکانی ئەندامەکانی لەش وەک زینا و خواردنەوەی عەرەق و چوون بۆ لای کاهین بەبێ پێش خستنی ووتەی کاهینەکە بەسەر ووتەی پێغەمبەر، وە ئەو کەسەی کە دراوسێکەی ئەمین نیە لە خراپەکانی، **وە ئەو کەسەی حوکم بەوە ناکات کە الله دایبەزاندووە لە شەرائیعەکان کە سەرچاوەکەی بابەتە فەرعیەکانە لەگەڵ هەبوونی ملکەچی بۆ حوکمی الله لە بابەتە ئەصلیەکان بە دڵ و ووتەی زمان، وە باقی تاوانە ئاشکراکان ئەنجامدەرەکەی پێی ناچێتە دەرەوە لە دینی ئیسلام، ئەگەرچی پێی نەووترێ ئیمانداری حەقیقی ئەوا پێی ناووترێ کافری حەقیقی، جا لێرەدا كفر دون كفر، و نفاق دون نفاق، و شرك دون شرك، و ظلم دون ظلم، و فسق دون فسق هەیە**، سفيان بن عيينة دەڵێ: عن هشام بن حجير عن طاوس عن ابن عباس رضي الله عنهما دەربارەی فەرمایشتی الله تعالى: ﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾ **ووتی: ئەو کوفرە نیە کە ئێوە بۆی دەچن.**

وە عبدالرزاق دەڵێ: أخبرنا معمر عن ابن طاوس عن أبيه طاوس ووتی: پرسیار کرا لە ابن عباس دەربارەی فەرمایشتی الله: ﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾ **ووتی: ئەمە کوفریانە، بەڵام وەک ئەو کەسە نیە کە کافرە بە الله و فریشتەکانی و کتێبەکانی و پێغەمبەرانی. وە لە ڕیوایەتێکی تردا دەڵێ: کوفرێک نیە لە دین دەرخەر بێت.**

وە پێشتر بە چڕی قسەمان لەسەری کرد لەو شوێنەی کە دەڵێ: (الفريابي و سعيد بن منصور و ابن المنذر و جگە لەمانەش ڕیوایەتیان کردووە لە ابن عباس لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا) **ابن عباس** ﵄ **تەفصیلێکی جوانی کردووە کە پێشتر باسمان کرد لێیەوە.**

وە وكيع دەڵێ: عن سفيان عن ابن جريج عن عطاء ووتی: **كفر دون كفر، و ظلم دون ظلم، و فسق دون فسق.**

**جا هەموو ئەمانە ڕەددن بۆ موعتەزیلە و خەواریج کە گومڕا بوونە لە ڕێگای حەق و صەواب، وە لایانداوە لە ڕێگای باشترین خۆشەویستەکان.**

**[التوضيح عن توحيد الخلاق في جواب أهل العراق : 1/450-451]**

**محمد بن علي بن غريب** دەربارەی ووتەکانی ابن القيم لە کتێبی (الصلاة) دەڵێ:

ابن القيم بە ڕاشکاوی ووتی کە واز هێنان لە نوێژ بە ئەنقەست، وە حوکم کردن بە غەیری ئەوەی الله دایبەزاندووە **گەر ڕەت کردنەوەی دەقی حوکمی الله-ی تێدا بێت بە ئاشکرا و بە ئەنقەست**، ئەوا کوفرە بە حەقیقی، دژی ئیمانە.

**[التوضيح عن توحيد الخلاق في جواب أهل العراق : 1/413]**

**محمد بن علي بن غريب** دەڵێ:

ابن القيم تەفصیلی پێدا و جیاوازی کرد لەنێوان کوفری ئەو کەسەی وازی لە نوێژ هێناوە، وە کوفری ئەو حاکمەی کە حوکم بە غەیری ئەوە دەکات الله دایبەزاندووە **بە مەرجی خۆی**، لەگەڵ کوفری دز و زیناکەر و عەرەق خۆر و ئەوەی کە دراوسێکەی

ئەمین نیە لە خراپەکانی.

**[التوضيح عن توحيد الخلاق في جواب أهل العراق : 1/413-414]**

ووتم: بڕوانە ووتی: (بە مەرجی خۆی)، واتا ئەو حاکمەی کە حوکم ناکات بە قورئان بە ڕەهایی کافر نیە، بەڵکو بە مەرج کافر دەبێت، مەرجەکەش لەم ووتەیەدا ئەوە بوو کە ووتی حوکمی الله ڕەت بکاتەوە.

**محمد بن علي بن غريب** (ووتەکەی ابن القيم نەقل دەکات) دەڵێ:

کوفری عەمەل دابەش دەبێت بۆ ئەو کوفرەی دژی ئیمانە و ئەو کوفرەی دژی ئیمان نیە، یەکەمیان: وەک سوجدە بردن بۆ بت و سوکایەتی کردن بە قورئان و کوشتنی پێغەمبەر و جنێو دان پێی و گاڵتە کردن بەوەی کە پێی هاتووە، **وە حوکم کردن بە غەیری ئەوەی الله دایبەزاندووە کە ڕەت کردنەوەی دەقی حوکمی الله-ی بە ئاشکرا تێدا بێت و بەمە ڕازی بێت**، وە واز هێنان لە نوێژ بە عینادی و سەرکەشیەوە.

دووەمیان: ئەوەی تاوانێک ئەنجام بدات کە نایخاتە دەرەوە لە ئیمان بە تەواوی، وەک زیناکەر و دز و عەرەق خۆر و ئەو کەسەی دراوسێکەی ئەمین نیە لە خراپەکانی.

**[التوضيح عن توحيد الخلاق في جواب أهل العراق : 1/412]**

ووتم: بڕوانە دووبارە حوکم نەکردن بە قورئانی بە کوفری گەورە دانا، بەڵام بەو مەرجەی کە حوکمی الله ڕەت بکاتەوە، وە کاتێک بە ڕەهایی باسی حوکم نەکردن بە قورئان دەکات بەبێ باسکردنی هیچ مەرجێک ئەوکات بە کوفری بچووکی دادەنێت وەک پێشتر هێنامان لە ووتەکانی، جا تۆش تێبگە رحمك الله.

**محمد بن علي بن غريب** دەڵێ:

ووتەکەی ابن القیم کە بە زمانی خۆی ووتی و بە قەڵەمی خۆی نوسی ئەمەیە: الإعتقاد کە لە پیشەکانی دڵە و زانستی دڵ لەخۆ دەگرێت وەک ئیمان هەبوون بە الله و فریشتەکانی و کتێبەکانی و پێغەمبەرانی و ڕۆژی دوایی و قەدەر، وە بڕوا هەبوون بە پێغەمبەر لەو شتانەی کە هێناویەتی و هەواڵی پێداوە، وە کارکردن بە لێکەوتەکانی ئەمانە مەرجی دروستی ئیمانە، **یان ئەو شتانەی کە دژی ئیمانن** وەک بە درۆ دانان یان شیرک یان کار نەکردن پێی **وەک حوکم نەکردن بەوەی الله دایبەزاندووە گەر ڕەت کردنەوەی دەقی حوکمی الله-ی تێدا بێت بە ئاشکرا و بە ئەنقەست**، وە واز هێنان لە نوێژ بە تەواوی بە ئەنقەست و عینادیەوە، جا ئەوەی یەکەمیان ئەو دینەیە کە الله جگە لەو هیچی تری قبوڵ نیە، وە دووەمیان ئەو کوفرەیە کە ئیمانی لەگەڵدا نیە، بەڵام کردارە ئاشکراکانی ئەندامەکانی لەش وەک زینا و خواردنەوەی عەرەق و چوون بۆ لای کاهین بەبێ پێش خستنی ووتەی کاهینەکە بەسەر ووتەی پێغەمبەر، وە ئەوەی کە دراوسێکەی ئەمین نیە لە خراپەکانی، وە موسڵمانان لە ملی یەکتری بدەن، **وە حوکم نەکردن بەوەی الله دایبەزاندووە لە بابەتە فەرعیەکان ئەوانەی کە ئەصلی دین نین**، لەگەڵ دان پێدانان بە حوکمی الله لە دڵ و زمانیدا، وە خۆشویستن و ملکەچ بوون بۆی لە دڵ و زمانیدا، وە پارێزگاری نەکردن لە ئەنجامدانی نوێژەکان لەکاتی خۆیدا، **ئەمانە ئەگەرچی خاوەنی شەرع ووشەی (کوفر) بۆ ئەنجامدەرەکەی بەکار بهێنێت بەڵام لە دین دەرناچێت**، لەبەر فەرمووودەکەی أبو ذر و جگە لەوەش لە فەرموودەکانی تر، وە فەرموودەکەی عبادة بن الصامت کە صەحیح و ناودارە، وە لەگەڵ فەرمایشتی الله تعالی: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغۡفِرُ

أَن يُشۡرَكَ بِهِۦ وَيَغۡفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُۚ﴾ [النساء: ٤٨ و ١١٦]، **وە سەلەف و چاکەکارانی ئوممەت لەسەر ئەمە ڕۆیشتوون، وە ئەوان زاناترن بە مانای کەلامی اللە و دەقی ووتەی پێغەمبەری اللە ﷺ.**

**[التوضيح عن توحيد الخلاق في جواب أهل العراق : 1/427-428]**

ووتم: بڕوانە حوکم نەکردن لە بابەتە ئەصلیەکان وەک تەوحید بە کوفر دەزانێت بەبێ هیچ مەرجێک، بەڵام لە بابەتە فەرعیەکان واتا غەیری تەوحید کوفرەکە مەرجدار دەکات بە ڕەت کردنەوەی حوکمی اللە، وابزانم لەمە ڕوونتر نیە کە چەندین جار لە ووتەکانی ئەمەی دووبارە کردۆتەوە.

مەبەستی لە فەرموودەی أبو ذر ئەمەیە: (من قال لا إله إلا الله دخل الجنة، وإن زنى وإن سرق)، وە مەبەستی لە فەرموودەی عبادة بن الصامت ئەمەیە: (أن رسول الله ﷺ قال: بايعوني على أن لا تشركوا بالله شيئا، ولا تسرقوا، ولا تزنوا، ولا تقتلوا أولادكم، ولا تأتوا ببهتان تفترونه بين أيديكم وأرجلكم، ولا تعصوا في معروف، فمن وفى منكم فأجره على الله، ومن أصاب من ذلك شيئا ثم ستره الله فهو إلى الله، إن شاء عفا عنه وإن شاء عاقبه. فبايعناه على ذلك).

## هود بن محكم الهواري (دەربارەی ووتەکەی حذیفة کە ووتی باشترین برا بۆ ئێوە بەنی ئیسرائیلە گەر هەرچی شیرینی هەیە بۆ ئێوە بێت و هەرچی تاڵی هەیە بۆ ئەوان بێت) دەڵێ:

واتا ئەم ئایەتانە گشتین ئەهلی کیتاب دەگرێتەوە لە یەهود و نەصارا لەگەڵ ئەهلی ئیسلامیش، هەر یەکێک لەوان حوکم بەوە نەکات کە لە کتێبەکەیدا هەیە، وە حوکم بەوە نەکات کە اللە و پێغەمبەرەکەی محمد ﷺ فرمانیان پێی کردووە، ئەوا کافر و زاڵم و فاسقە، **بەڵام کوفری ئەهلی کیتاب کوفری ئینکاری کردنە کە ئەمەش**

**شیرکە، وە کوفری ئەوانەی کە دانیان ناوە بە الله و بە پێغەمبەرەکەی کوفری نیفاقە کە ئەمەش وازهێنانە لە سوپاس کردنی نیعمەت، کە ئەمەش کفر دون کفر و ظلم دون ظلم و فسق دون فسق-ە.**

**[مختصر تفسير يحيى بن سلام لهود بن محكم الهواري : 474/1]**

ووتم: هود بن محكم الهواري ئیباضیە کە یەکێکە لە گروپەکانی خەواریج، بەڵام وەک ئەوان توند نین ئەگەرچی لە هەندێک بابەت هاوڕان وەک تەعطیلی صیفاتی الله، ووتنی قورئان مەخلوقە، خروج کردن لە پێشەوایە زاڵمەکان، ڕەت کردنەوەی شەفاعەت و چەندەها بابەتی تر، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەبینین هود ئینکاری کفر دون کفر و ظلم دون ظلم و فسق دون فسق ناکات.

**الخطيب الشربيني** دەڵێ:

﴿وَلَا تَشْتَرُواْ بِـَٔايَـٰتِي ثَمَنًا قَلِيلًا﴾ واتا: حوکمەکانم کە دامبەزاندووە مەیگۆڕنەوە بە نرخێکی کەم لە بەرتیل و جگە لەویش، **بۆ ئەوەی حوکمی الله بشارنەوە یان بیگۆڕن هەروەک ئەهلی کیتاب ئەنجامیاندا**، وە فەرمایشتی الله تعالى: ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَـٰفِرُونَ﴾ عكرمة وتوویەتی: ماناکەی ئەمەیە: هەر کەسێک حوکم بەوە نەکات کە الله دایبەزاندووە **ئینکاری لێ بکات ئەوا کافر بووە، وە ئەوەی دانی پێ بنێت و حوکمی پێ نەکات ئەوا زاڵم و فاسقە.**

**[السراج المنير : 377/1]**

**الخطيب الشربيني** دەڵێ:

﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ﴾ واتا: ئەوەی حوکم بەوە نەکات کە الله دایبەزاندووە دەربارەی کوشتنەوەی بکوژ و جگە لەوەش، ئەوا ﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ﴾ واتا: ئەوانەی وازیان هێنا لە عەدل گومڕا بوون وەک ئەو کەسەیان لێهات کە لە تاریکیدا دەڕوات، **جا ئەگەر واز هێنانیان لە حوکمی الله بە دینداریەوە بێت ئەوا ئەوپەڕی زوڵمە کە بریتیە لە کوفر، وە ئەگەرنا تاوانە.**

**[السراج المنير : 1/377-378]**

ووتم: (واز هێنان لە حوکمی الله بە دینداریەوە) واتا حوکمە دانراوەکەی خۆیان بدەنە پاڵ شەرعی الله وەک یەهود.

**الخطيب الشربيني** دەڵێ:

﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ﴾ **گەر حوکم نەکردنیان بە دینداریەوە بێت ئەوا کوفرە، وە ئەگەر بۆ شوێنکەوتنی ئارەزووەکان بێت ئەوا تەنها تاوانە.**

**[السراج المنير : 1/378]**

**ابن وهب الدينوري** دەڵێ:

﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ﴾ **دەفەرمووێ: هەر کەسێک ئەوە ڕوون نەکاتەوە کە الله ڕوونی کردۆتەوە لە تەورات دەربارەی وەصفی محمد و ڕەجم،** ﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَٰفِرُونَ﴾ ئا ئەوانە کافرن بە الله و پێغەمبەر و کتێب.

**[التفسير الواضح : 2/587]**

ووتم: مەبەستی ئەوەیە هەر کەسێک حوکمی اللە بشارێتەوە هەروەک یەهود کە وەصفی پێغەمبەر و حوکمی ڕەجمیان شاردیانەوە، ئەوا کافرە.

**عبدالرحمن بن محمد الدوسري** دەڵێ:

فەرمایشتی اللە سبحانە: ﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾ ئەوەی ڕاسترە ئەوەیە کە ئەم ئایەتە گشتیە دەربارەی ئەهلی کیتاب و جگە لەوانیشە، **هەموو کەسێک کە ئینکاری شەرعی اللە بکات یان بڕوای بە ڕاستی و دروستی شەرعی اللە نەبێت یان بڕوای وابێت کە ناگونجێ بۆ ئەم سەردەمە و لەگەڵ پێشکەوتن نارِوات وەک مەنطقی طاغوتە قەومیەکان و فەیلەسوفەکانیان، ئەوانەی کە ئەم بیروباوەڕەیان هەیە و پێیان وایە حدودەکانی اللە توندن، جا ئەم جۆرانە لە خەڵکی گومان نیە لە کافر بوونیان**، بەڵکو کوفرەکەیان کوفری هەڵگەڕانەوەیە توندتر و قێزەونترە لە کوفری یەهودە ئەصلیەکان، پەنا بە اللە.

[صفوة الآثار والمفاهيم: 8/497]

**عبدالرحمن بن محمد الدوسري** دەڵێ:

فەرمایشتی اللە سبحانە: ﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ﴾ زاڵمەکان کافرەکانن، ناونراون بە زاڵمەکان بەهۆی کەم کردنەوەی حەقی اللە، هیچ کەسێکیش حەق کەم ناکاتەوە جگە لە زاڵم، وە کەم کردنەوەیان بۆ حەقی اللە لە سوک سەیر کردنیان بۆ زاتی بەڕێزی و گوێ پێنەدانی دروستە بووە، **ئەمەش ئەگەر بووترێ: ظلم دون ظلم و کفر دون کفر، ئەوا پێشتر مەبەستی ئەمەمان ڕوون کردەوە.**

**هەرکەسێک حوکم بکات بە غەیری ئەوەی الله دایبەزاندووە بە جەهل یان بە تەئویل، یان شوێنکەوتنی طەماع و ئارەزوو، وە ئەم کەسە دان بنێت بە حوکمی الله و ڕێزی لێ بنێت، ئینکاری لێ نەکات و گاڵتەی پێ نەکات، وە غەیری ئەو بە باشتر نەزانێ لە حوکمی الله، ئەمەیە کە لە دین دەرناچێت، وە زوڵمەکەی زوڵمی بچووکە**، بەڵام ئەو کەسەی حوکم بە غەیری ئەوە دەکات کە الله دایبەزاندووە وەک بە سوک سەیر کردنی ئولوهیەتی و پاشایەتی الله و کەم کردنەوەی زاتی الله و سوکایەتی کردنی بە شەریعەتەکەی، وە گاڵتە کردن و بڕوا بوون بەوەی کە شەریعەتی الله دروست نیە یان ناگونجێ، **وە بە باشتر دانانی یاسا دانراوەکان لە شەریعەتی الله، ئەمە گومان نیە لە کافر بوونی**، وە کوفرەکەی کوفری هەڵگەڕانەوەیە، توندتر و قێزەونترە لە کوفری ئەصلی.

وە بە هەمان شێوە قسە کردن دەربارەی فەرمایشتی الله سبحانە: ﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ﴾ فسق: دەرچوونە لە دین، **بەڵام بەو مەرجانەی کە پێویستە ڕەچاو بکرێن و پشتگوێ نەخرێن و لێی لانەدرێن.**

[صفوة الآثار والمفاهيم : 8/498-499]

**عبدالرحمن بن محمد الدوسري** دەڵێ:

لە وەڵامەکەی أبو مجلز هیچ بەڵگەیەکی تێدا نیە بۆ باطل ویستانی سەردەمەکەمان کە عوزر دەهێننەوە بۆ ئەوانەی حوکمێکی عەلمانیان داناوە، **دان نانێت بە ئیسلام و حەلال و حەڕام و تەشریعەکانی، بەڵکو حوکمی ئیسلام ڕەت دەکاتەوە و گاڵتە بە تەشریعەکانی دەکات، پێی وایە ناگونجێ لەگەڵ سەردەم و گونجاو نیە**

**بۆ مرۆڤایەتی، بەڵكو توندە پێچەوانەی مافی مرۆڤە**، تا دوا گاڵتە كردن و هێرش كردنیان بۆ سەر حوكمەكانی الله، جا هەڵقۆزتنەوەی ئەم دوو ئەثەرە و بەڵگە پێ هێنانەوەی بۆ عوزر هێنانەوە بۆ مورتەددان كارێكی پێكەنیناویە.

**[صفوة الآثار والمفاهيم : 502/8]**

ووتم: شێخ عبدالرحمن بن محمد الدوسري لە سەدەی ڕابردوو ژیاوە، لەم تەفسیرەیدا كە نەیتوانیوە تەواوی بكات زۆر ڕەددی عەلمانی و دیموكراسیخوازان و قەومیەكانی داوەتەوە و كوفرەكانی ڕوون كردوونەتەوە، چونكە لەوكات ئەم گروپانە تازە خەریكی دەركەوتن و گەشەكردن بوون لە وولاتانی عەرەبیدا، وە لە ووتەكانیدا بە ڕوونی دیارە ئەوكاتیش كەسانێک هەبوونە بەناو زانا بەرگریان لەم عەلمانیانە كردووە و بیانوویان بۆ هێناونەتەوە، هەر ئەمەشە وایكردووە شێخ الدوسري بەرگەی بیانووەكانیان نەگرێت و لەكاتی ڕەتدانەوەیان لە مەنهەجی سەلەف لابدات و تەنانەت جۆرێک لە بێ ڕێزیش بكات بەرامبەر ابن عباس و أبو مجلز، هۆكاری ئەمەش تێنەگەیشتنە لە ووتەی ابن عباس كە زۆرینەی موسڵمانان واهەست دەكەن گەر ووتەكەی ابن عباس وەربگرن ئەوكات ناتوانن عەلمانیەكان تەكفیر بكەن یان ناتوانن ئەو كەسە تەكفیر بكەن كە گاڵتە بە شەرعی ئیسلام دەكات و ڕەتی دەكاتەوە و بە قێزەون و توندوتیژ وەصفی دەكات، شێخ الدوسري ئەگەرچی لە تەفسیری ئایەتەكانی حوكم نەكردن بەوەی الله دایبەزاندووە لەسەر هەمان مەنهەجی سەلەف ڕۆیشتووە، كە ڕەت كردنەوە و گاڵتە كردن بە شەرع یان ناوبردنی بە توندوتیژی یان تەفزیل كردنی یاسا دانراوەكان بەسەر شەرعی الله، ئەمانەی كردۆتە مەرجی تەكفیر كردن، وە ئەگەر ئەم مەرجانەی تێدا نەبوو ئەوا بە كوفری بچووكی دەزانێت، بەڵام لە لاپەرەكانی دواتردا دەڵێ: هەندێک لە خەڵكی ئەم سەردەمە ووتەی ابن عباس دەكەنە بیانوو كە دەڵێ: گەر حوكم نەكات بە قورئان وەک ئینكاری كردن ئەوكات كافرە، الله تعالى داوای لێنەكردووین دینداری بكەین بە ووتەی ابن عباس و أبو مجلز و كەسانی تر، جگە لە شوێنكەوتنی ووتەكانی پێغەمبەر ﷺ كە مەعصومە

شوێنی ووتەی کەسی تر ناکەوین، ووتەی ابن عباس بەڵگە نیە بەسەر ئوممەت، ووتەی أبو مجلز بێ یان هەر کەسێکی تر بێت بەڵگە نیە لەم بابەتەدا چونکە لە پێغەمبەر ﷺ نەقل نەکراوە، دروست نیە هیچ شتێک بکرێتە بەڵگە و پشتی پێ ببەسترێ جگە لە دەقی قورئان و سوننەت نەبێت. (ئەمە پوختەی ووتەکەی بوو).

ئەوەی وادەکات کە بڵێم شێخ الدوسري لە ووتەی ابن عباس تێنەگەیشتووە ئەوەیە کە ووتەکانی محمد رشید رضا نەقل دەکات لە تەفسیری المنار، کە محمد رشید رضا لەم تەفیسرەدا لەسەر هەمان مەنهەجی سەلەف بابەتەکە باس دەکات، شێخ الدوسري دەڵێ: محمد رشید رضا باسی مەزهەبی فەقیهەکان و ووتەی هەندێک لە زانایانی تەفسیری نەقل کرد دەربارەی ئایەتەکە کە پێشتر باسمان کرد بەڵگە نیە و پشتی پێ نابەسترێ چونکە ووتەی پێغەمبەر نیە کە مەعصومە !!! بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئێمە ئینکاری لەو جیاکارییە ناکەین کە هەندێکیان باسیان کردووە لە مەرجی ئینکاری کردن و بە ناشرین دانانی حوکمی الله و تەفزیل کردنی حوکمی طاغوت بەسەریدا، بەڵکو پشتمان پێی بەستووە و لەگەڵ ئینصاف ڕۆیشتووین.

ئەمە ئەوە دەردەخات کە لە ووتەکەی ابن عباس تێنەگەیشتووە بۆیە بەم جۆرە قسەی لەسەر دەکات، واحاڵی بووە کە ابن عباس دەڵێ: گەر ئینکاری بکات ئیللا ئەوکات کافرە، تەنها ئینکاری کردن مەرجە، ئایا دەکرێ ابن عباس گاڵتە کردن بە حوکمی الله و بە توندوتیژ وەصف کردنی و بووترێ ناگونجێ لەگەڵ سەردەم و مرۆڤایەتی، یان تەفزیل کردنی حوکمی طاغوت بەسەریدا بە کوفر نەزانێت ؟! ئەو مەرجانەی شێخ الدوسري باسی کرد ابن عباس و هەموو هاوەڵان کۆکن لەسەری کە ئەمانە کوفرن، بەڵام کە هەر زانایەک باسی مەرجێک دەکات مانای ئەوەیە نیە کە تەنها ئەم مەرجە بە کوفر بزانێ، کە زید گاڵتە کردن بە حوکمی الله دەکاتە مەرجی تەکفیر مانای ئەوە نیە ڕەت کردنەوەی حوکمی الله بە کوفر نەزانێت، کە عمرو ئینکاری کردن لە حوکمی الله دەکاتە مەرجی تەکفیر مانای ئەوە نیە گاڵتە کردن بە حوکمی الله بە کوفر نەزانێت، جا ئەوەی شێخ الدوسري کردوویەتی بە مەرجی تەکفیر هیچ دژی

ووتەکانی ابن عباس نیە بەڵکو هاوڕایەتی، بۆیە ئەم جۆرە قسە کردنەی دەربارەی ابن عباس بە هیچ نازانم جگە لەوەی کە لە مەبەستی ابن عباس تێنەگەیشتووە، یان کاریگەری زاناکانی ئەوکات وای لێکردووە کە هەمیشە بیانوو بۆ عەلمانیەکان دەهێننەوە، وەک ئەمڕۆ دەبینین زۆرێک لە موسڵمانان لەژێر کاریگەری مەدخەلیەکان وایان لێهاتووە ئەثەرەکەی ابن عباس ڕەت بکەنەوە.

**عبدالرحمن بن محمد الدوسري** دەڵێ:

چەندە کافرە ئەوکەسەی جورئەت دەکات تەشریع بۆ خەڵکی دابنێت بە پێچەوانەی حوکمی الله، **پێی وایە باشترە لە شەرعی الله و گونجاوترە بۆ سەردەمەکەیان.**

**[صفوة الآثار والمفاهيم : 533/8]**

ووتم: واتا یاسا دانان بەم مەرجە بە کوفر دەزانێت کە پێی وابێت باشترە لە حوکمی الله و گونجاوترە بۆ سەردەمەکەیان.

**البكري** دەڵێ:

﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَٰفِرُونَ﴾ ئەوەی حوکم بەوە نەکات کە الله دایبەزاندووە، ئەوا ئەمانە کافرن بەوەی الله دایبەزاندووە، وە زوڵم لە خۆیان و جگە لە خۆیان دەکەن، وە فاسقن بە دەرچوونیان لە گوێڕایەڵی کردن، الله وەصفی کردن بەمانە بەهۆی وازهێنانیان لە دەقی کتێبی الله **وەک ئینکاری کردن و گاڵتە پێکردن، بەڵام ئەوەی ئیمان بهێنێت و واز بهێنێت لە حوکم پێکردنی، ئەوا فاسقە کافر نیە.**

**[تفسير البكري : 315/1]**

ووتم: ئەمە ئەو (البكري)ە نیە كە ابن تیمیة ڕەددی داوەتەوە، ئەمە ساڵی 952 هـ مردووە، ئەوەی ابن تیمیة ڕەددی داوەتەوە ساڵی 724 هـ مردووە، بەڵام هەردووكیان مصری و شافعی و صۆفین.

# گومانی ئەوەی کە ابن مسعود ﵁ بەرتیل خواردنی لە حوکمدا بە کوفر ناوبردووە:

یەکێک لە گومانەکانی زیادەڕەوەکان لە بابەتی حوکم نەکردن بە قورئان ئەوەیە کە ابن مسعود کاتێک پرسیاری لێدەکەن دەربارەی بەرتیل وەرگرتن لە حوکمدا، لە وەڵامدا دەڵێ: ئەمە کوفرە، وە بە (ئەلیف و لام) ووشەی کوفر دەردەبڕێ، پاشان ئایەتی: ﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾ دەخوێنێتەوە، جا دەڵێن: کەواتە ئەم کوفرەی لەم ئایەتەدا هاتووە کوفری گەورەیە لەلای ابن مسعود.

**ابن أبي حاتم** دەڵێ:

﴿أَكَّٰلُونَ لِلسُّحۡتِۚ﴾ [المائدة: ٤٢]

حدثنا عبدالله بن جعفر الرقي حدثنا عبيدالله بن عمرو عن زيد ابن أبي أنيسة عن بكير بن مرزوق عن عبيد بن أبي الجعد عن مسروق عن **عبدالله بن مسعود ووتی:**

هەر کەسێک تکا بکات بۆ کەسێکی تر تاکو زوڵمێکی لەسەر لا بدات یان حەقێکی بۆ بگەڕێنێتەوە، جا دیارییەکی پێشکەش بکرێ ئەویش وەری بگرێت، ئەمە سوحتە.

مسروق دەڵێ: ووتمان: ئەی باوکی عبدالرحمن ئێمە بەرتیل وەرگرتنمان لە حوکمدا بە سوحت دەزانی، عبدالله ووتی: ﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾.

**[تفسير ابن أبي حاتم : 85/5]**

ووتم: (بكير بن مرزوق) نازانم کێیە کەسم نەدۆزیەوە بەم ناوە، ڕەنگە بكير بن معروف بێت تەصحیف کرابێ.

(عبيد بن أبي الجعد) برای (سالم بن أبي الجعد)ە، ڕیوایەتی کەمە، خۆی سالم ئەم ئەثەرە

لە مسروق ڕیوایەت دەکات، جا نازانم عبيد-ی براشی ڕیوایەتی کردووە لە مسروق یان لێرەدا بە هەڵە کراوە بە عبيد.

وە مەبەست لەم ووتانە تەزعیف کردنی ئەثەرەکە نیە، تەنها ڕاست کردنەوەی هەڵەکانی چاپە، ئەگینا ئەثەرەکە جێگیرە لە ابن مسعود-ەوە، کەس ڕەتی ناکاتەوە ئیللا مەگەر عیناد بێت.

**الطبري** دەڵێ:

حدثنا سفيان بن وكيع و واصل بن عبدالأعلى قالا حدثنا ابن فضيل عن الأعمش عن سلمة بن كهيل عن سالم بن أبي الجعد ووتی:

بە عبدالله ووترا: سوحت چیە ؟ ووتی: بەرتیلە، ووتیان: ئەی لە حوکمدا ؟ ووتی: **ئەوە کوفرە (ذاك الكفر).**

**[تفسير الطبري : 429/8]**

**الطبري** دەڵێ:

حدثنا هناد قال حدثنا وكيع، وحدثنا ابن وكيع قال حدثنا أبي عن حريث عن عامر عن مسروق ووتی:

ووتمان بە عبدالله: ئێمە سوحتمان بە هیچ نەدەزانی جگە لە بەرتیل وەرگرتن نەبێ لە حوکمدا، عبدالله ووتی: **ئەوە کوفرە (ذاك الكفر).**

**[تفسير الطبري : 430/8]**

**الطبري** دەڵێ:

حدثنا القاسم قال حدثنا الحسين قال حدثني حجاج عن المسعودي عن بكير بن أبي بكير عن مسلم بن صبيح ووتی:

مسروق تکای بۆ پیاوێک کرد لە کارێکیدا، پیاوەکەش ئافرەتێکی جاریەی پێشکەش بە مسروق کرد، مسروق زۆر تورە بوو، ووتی: گەر بمزانیبوایە تۆ ئەم کارە دەکەیت ئەوا تکام بۆت نەدەکرد لە کارەکەتدا، وە لەمەودوا هیچ تکات بۆ ناکەم لە کارەکەتدا، بیستم ابن مسعود دەیووت: هەر کەسێک تکا بکات بۆ ئەوەی حەقێکی پێ بگەڕێنێتەوە یان زوڵمێکی پێ لا بەرێت، ئینجا دیاری پێشکەش بکرێت ئەویش قبوڵی بکات، ئەوا ئەمە سوحتە، بە ابن مسعود ووترا: ئەی باوکی عبدالرحمن ئێمە ئەم کارەمان بە سوحت نەدەزانی تەنها لە بەرتیل وەرگرتن نەبێ لە حوکمدا، ابن مسعود ووتی: بەرتیل وەرگرتن لە حوکمدا کوفرە.

**[تفسير الطبري : 8/432-433]**

**الطبري** دەڵێ:

حدثنا هناد قال حدثنا عبيدة عن عمار عن مسلم بن صبيح عن مسروق ووتی:

پرسیارم لە ابن مسعود کرد دەربارەی سوحت، ئایا بەرتیل وەرگرتنە لە حوکمدا ؟ ووتی: نەخێر، ئەوەی حوکم نەکات بەوەی کە الله دایبەزاندووە ئەوا کافرە، وە ئەوەی حوکم نەکات بەوەی کە الله دایبەزاندووە ئەوا زاڵمە، وە ئەوەی حوکم نەکات بەوەی کە الله دایبەزاندووە ئەوا فاسقە، بەڵام سوحت ئەوەیە کەسێک داوای یارمەتیت لێ بکات لە وەرگرتنی حەقە خوراوەکەی، تۆش یارمەتی بدەیت، ئەویش دیارییەکەت پێشکەش بکات تۆش وەری بگریت.

**[تفسير الطبري : 8/433]**

**الطبري** دەڵێ:

حدثنا ابن حميد عن جرير عن منصور عن سالم عن مسروق عن **عبدالله ووتی:**

بەرتیل سوحتە، مسروق دەڵێ: ووتمان بە عبدالله: لە حوکمدا ؟ ووتی: نەخێر، پاشان ئەم ئایەتانەی خوێند: ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَٰفِرُونَ﴾ ، ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ﴾ ، ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ﴾.

**[تفسير الطبري : 8/434-435]**

**عبدالرزاق** دەڵێ:

عن سفيان عن عاصم عن زر بن حبيش ووتی: **ابن مسعود ووتی:**

سوحت بەرتیل وەرگرتنە لە دین.

عبدالرزاق دەڵێ: سفیان ووتی: (لە دین) واتا: لە حوکم.

**[مصنف عبدالرزاق : 6/483]**

ووتم: (سفيان) واتا الثوري.

**سعيد بن منصور** دەڵێ:

حدثنا حماد بن يحيى الأبح عن أبي إسحاق عن أبي الأحوص عن **عبدالله بن مسعود ووتی:**

بەرتیل وەرگرتن لە حوکمدا کوفرە، وەرگرتنی لەنێوان خەڵکیدا سوحتە.

**[التفسير من سنن سعيد بن منصور : ژمارە 740]**

**أحمد بن حنبل** دەڵێ:

حدثنا يحيى بن آدم قال حدثنا شريك عن السدي عن أبي الضحى عن مسروق ووتی:

پرسیارکرا لە عبداللە ﵁ دەربارەی سوحت، ووتی: بەرتیلە، پێی ووترا: لە حوکمدا؟ ووتی: **ئەوە کوفرە (ذاك الكفر)**، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾.

**[الجامع في كتب الإيمان والرد على المرجئة لعادل / كتاب الإيمان لأحمد بن حنبل : ژمارە 249]**

## أحمد بن حنبل دەڵێ:

حدثنا هشيم قال حدثنا عبدالملك بن أبي سليمان عن سلمة بن كهيل عن علقمة و الأسود:

پرسیاریان لە ابن مسعود کرد ﵁ دەربارەی بەرتیل ؟ ووتی: ئەمە سوحتە، ووتیان: ئەی لە حوکمدا ؟ ووتی: **ئەوە کوفرە (ذلك الكفر)**، پاشان ئەم ئایەتەی خوێند: ﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾.

**[الجامع في كتب الإيمان والرد على المرجئة لعادل / كتاب الإيمان لأحمد بن حنبل : ژمارە 250]**

## أحمد بن حنبل دەڵێ:

حدثنا عبدالعزيز العمي  قال حدثني منصور بن المعتمر عن سالم بن أبي الجعد عن مسروق ووتی:

پیاوێک پرسیاری لە عبداللە بن مسعود ﵁ کرد دەربارەی سوحت، ابن مسعود ووتی: بەرتیلە، پیاوەکە ووتی: بەرتیلە لە حوکم ؟ ابن مسعود ووتی: نەخێر، ﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾ ، ﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ﴾ ، ﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ﴾.

**[الجامع في كتب الإيمان والرد على المرجئة لعادل / كتاب الإيمان لأحمد بن حنبل : ژمارە 251]**

**أحمد بن حنبل** دەڵێ:

حدثنا محمد بن جعفر قال حدثنا شعبة عن منصور عن سالم بن أبي الجعد عن مسروق عن **عبدالله** رَضِيَ اللهُ عَنْهُ **ووتی:** زوڵم لە حوکمدا کوفرە، وە سوحتیش بەرتیلە.

[الجامع في كتب الإيمان والرد على المرجئة لعادل / كتاب الإيمان لأحمد بن حنبل: ژمارە 264]

## وەڵامی ئەم گومانە:

ابن بطة لە (الإبانة الكبرى) وەک پێشتر باسمان کرد بابێکی داناوە دەربارەی ئەو تاوانانەی کە لە دین دەرخەر نین ئەگەرچی ووشەی کوفریش بۆیان بەکارهاتبێ، واتا مەبەست پێی کوفری بچووکە، جا بینیمان کە لە ژێر بابەکە ئایەتی: ﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾ هێنا بوو لەگەڵ تەفسیری سەلەف کە دەڵێن کفر دون کفر-ە.

ئینجا هەر لە ژێر ئەم بابەدا ئەم ئەثەرانەی ابن مسعود-ی هێناوە کە دەربارەی بەرتیل وەرگرتن لە حوکمدا دەڵێ: کوفرە، بە (ئەلیف و لام) دەری دەبڕێ، وە ئایەتەکەی سورەتی المائدة-ی لەگەڵ دەخوێنێتەوە، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ابن بطة تێگەیشتووە ابن مسعود مەبەستی کوفری بچووکە کە دەڵێ بەرتیل لە حوکمدا کوفرە.

**ابن بطة** دەڵێ:

حدثنا أبو عبدالله أحمد بن علي بن علاء الجوزجاني قال حدثنا زياد بن أيوب الطوسي قال حدثما هشيم قال حدثنا عبدالملك بن أبي سليمان عن سلمة بن كهيل عن علقمة و مسروق:

پرسیاریان لە ابن مسعود کرد دەربارەی بەرتیل، ووتی: لە سوحتە، ووتیان: ئەی لە حوکمدا ؟ **ووتی: ئەوە کوفرە (ذلك الكفر)**، پاشان ئەم ئایەتەی خوێند: ﴿وَمَن لَّمۡ

يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾.

**[الإبانة الكبرى : ژمارە 1069]**

## ابن بطة دەڵێ:

حدثنا أبو شيبة عبدالعزيز بن جعفر قال حدثنا محمد بن إسماعيل قال حدثنا وكيع قال حدثنا حريث بن أبي مطر عن الشعبي عن مسروق ووتی:

ووتمان بە عبدالله: ئێمە سوحتمان بە هیچ شتێک نەدەزانی جگە لە بەرتیل وەرگرتن نەبێ لە حوکمدا، عبدالله ووتی: **ئەوە کوفرە (ذلك الكفر).**

**[الإبانة الكبرى : ژمارە 1070]**

## ابن بطة دەڵێ:

حدثنا أبو شيبة عبدالعزيز بن جعفر قال حدثنا محمد بن إسماعيل قال حدثنا يزيد بن هارون عن محمد بن إسحاق عن حكم عن سالم بن أبي الجعد عن مسروق ووتی:

پرسیارمان لە عبدالله بن مسعود کرد دەربارەی فەرمایشتی الله عز وجل: ﴿وَأَكَّٰلِهِمُ ٱلسُّحۡتَۚ﴾ [المائدة: ٦٢]، ووتی: بەرتیلە، ووتم: لە حوکمدا ؟ ووتی: **ئەوە کوفرە (ذلك الكفر).**

**[الإبانة الكبرى : ژمارە 1071]**

ووتم: (حكم) حكم بن عتيبة-یە، لە سەنەدەکە بە (حكيم) هاتووە، عادل آل حمدان هەر بە حكيم هێناویەتی هیچی لەسەر نەووتوە، بەڵام لە چاپی دار الراية محقق لە حاشیە ئاماژەی پێداوە کە حكيم هەڵەیە حكم ڕاستە، ووتەکەی محقق دروستە، حكم و سالم بن أبي الجعد هەردووکیان کوفین، وە حكم ڕیوایەتی هەیە لە سالم.

جا هێنانی ئەم ڕیوایەتانە لەم بابەدا و لەلایەن زانایەکی ئاوا و لە کتێبێکی ئاوادا، گەر کێشەی دروست کردبوایە بۆ عەقیدی خەڵکی ئەوا مەحاڵ بوو زانایان لێی بێدەنگ بن، چۆن ابن بطة کوفری گەورە دەکات بە کوفری بچووک، هیچ زانایەکیش تا ئەمڕۆ ڕەخنەی لێ ناگرێت ؟!

تەنانەت هەندێک لەم ڕیوایەتانەی دەکرێن بە بەڵگە لە لایەن زیادەڕەوەکان، خودی ڕیوایەتەکە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ابن مسعود مەبەستی کوفری بچووکە، بۆ نموونە:

**أحمد بن حنبل** دەڵێ:

حدثنا محمد بن جعفر قال حدثنا شعبة عن منصور عن سالم بن أبي الجعد عن مسروق عن **عبدالله** رضي الله عنه **ووتی:** زوڵم لە حوکمدا کوفرە، وە سوحتیش بەرتیلە.

**[الجامع في كتب الإيمان والرد على المرجئة لعادل / كتاب الإيمان لأحمد بن حنبل: ژمارە 264]**

ووتم: گەر بپرسین لە زیادەڕەوەکان: ئایا زوڵم کردن لە حوکمدا کوفرە ؟ دەڵێن: نەخێر، چونکە گەر کوفر بێت ئاوا هەموو حاکمێکی زاڵم کافرە.

جا دەپرسین: ئەی کەواتە بۆ دەکرێ ئەم کوفرەی کە باسکرا کوفری بچووک بێت لەلای ابن مسعود، بەڵام ئەو کوفرەی کە خۆتان مەبەستانە کوفری گەورە بێت ؟! ئەی بەرتیل وەرگرتن لە حوکمدا ئەویش هەر زوڵم نیە ؟! هەروەها ابن بطة ئەم ئەثەرەشی هەر لە ژێر بابی کوفری بچووک هێناوە.

چەند ڕیوایەتێکی تر کە ئەم گومانە پوچەڵ دەکەنەوە:

**أحمد بن حنبل** دەڵێ:

حدثنا يحيى بن سعيد عن حبيب الشهيد قال حدثنا الحسن عن أبي الأحوص عن **عبدالله** رَضِيَ اللهُ عَنْهُ **ووتی:** جنێو دان بە موسڵمان فسقە، **وە شەڕ کردن لەگەڵی کوفرە.**

**[الجامع في كتب الإيمان والرد على المرجئة لعادل / كتاب الإيمان لأحمد بن حنبل : ژمارە 274]**

**أحمد بن حنبل** دەڵێ:

حدثنا وكيع و عبدالرحمن عن سفيان عن زبيد عن أبي وائل عن عبدالله رَضِيَ اللهُ عَنْهُ ووتی:

**پێغەمبەری الله** ﷺ **فەرمووی:** (سباب المسلم فسوق، **وقتاله كفر**)، واتا: جنێو دان بە موسڵمان فسقە، **وە شەڕکردن لەگەڵی کوفرە.**

**[الجامع في كتب الإيمان والرد على المرجئة لعادل / كتاب الإيمان لأحمد بن حنبل : ژمارە 275]**

ووتم: ئەم فەرموودەیە لە (الصحیحین) هاتووە، جا ئەوەی مەبەستمە ئەثەرەکەی ابن مسعود بوو کە لە ڕیوایەتی پێشوو ئیمام أحمد هێناویەتی، ئەو ابن مسعود-ەی کە ووتی: بەرتیل وەرگرتن لە حوکمدا کوفرە، هەمان ئەو ابن مسعود-یە کە دەڵێ: شەڕ کردن لەگەڵ موسڵمان کوفرە، جا گەر ئەوەی یەکەم بە کوفری گەورە بزانن، ئەوا دەبێ ئەوەی دووەمیش بە کوفری گەورە بزانن کە ئەمەش گومڕاییەکی ڕوونە، گەر هەردووکیشیان بە کوفری بچووک بزانن ئەوا دروستە و ئەوکات دەبێتە بەڵگە لە دژتان کە مەبەستی ابن مسعود کوفری بچووکە نەک کوفری گەورە، گەر بڵێن ئاخر (ئەلیف و لام)ی لەگەڵ نیە، ئەوا دەڵێین کە بە (ئەلیف و لام) ووتی الكفر ابن بطة هەر بە کوفری بچووکی دانا، وە بەشێک لە هاوەڵان و تابعین چوونە لای ئافرەت لە دواوە بە کوفر وەصف دەکەن بە (ئەلیف و لام) کە مەبەستیان کوفری بچووکە، ووتەکەی ابن مسعود-یش دەبێت بە هەمان مانا لێک بدرێتەوە، وە ئەوانەی موخالەفەی ئاثاری سەلەف دەکەن لە مەسەلەی حوکم هەموویان کۆکن لەسەر ئەوەی گەر حاکم حوکم نەکات بە قورئان بەهۆی بەرتیلەوە ئەوا کوفری بچووکە، ئەی چۆن ئێستا ووتەکەی ابن مسعود بە کوفری گەورە دەزانن کە دەڵێ: بەرتیل وەرگرتن لە حوکمدا کوفرە؟!

**أحمد بن حنبل** دەڵێ:

حدثنا عبدالرزاق قال حدثنا معمر عن ابن طاوس عن أبيه ووتی:

پرسیار کرا لە ابن عباس رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا دەربارەی ئەو پیاوەی کە لە دواوە دەچێتە لای ژنەکەی؟ **ووتی: ئەمە پرسیارم لێ دەکات دەربارەی کوفر (هذا يسألني عن الكفر).**

**[الجامع في كتب الإيمان والرد على المرجئة لعادل / كتاب الإيمان لأحمد بن حنبل : ژمارە 266]**

**أحمد بن حنبل** دەڵێ:

حدثنا عبدالوهاب الخفاف قال أنبأنا ابن جريج عن إبراهيم بن أبي بكر ووتی:

پیاوێک پرسیاری لە طاوس کرد دەربارەی چوونە لای ئافرەتان لە دواوە ؟

**ووتی: ئەمە پرسیارم لێ دەکات دەربارەی کوفر (هذا يسألني عن الكفر).**

**[الجامع في كتب الإيمان والرد على المرجئة لعادل / كتاب الإيمان لأحمد بن حنبل : ژمارە 270]**

**أحمد بن حنبل** دەڵێ:

حدثنا يحيى بن سعيد عن سعيد عن قتادة عن عقبة بن وساج عن **أبي الدرداء** رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ **ووتی:**

هیچ کەسێک ئەم کارە دەکات **جگە لە کافر؟!.**

**[الجامع في كتب الإيمان والرد على المرجئة لعادل / كتاب الإيمان لأحمد بن حنبل : ژمارە 267]**

ووتم: واتا چوونە لای ئافرەت لە دواوە.

**أحمد بن حنبل** دەڵێ:

حدثنا إسماعيل عن ليث عن مجاهد ووتی: **أبو هريرة** ﵁ **ووتی:**

هەرکەسێک لە دواوە بچێتە لای ئافرەتان و پیاوان **ئەوا کوفری کردووە.**

**[الجامع في كتب الإيمان والرد على المرجئة لعادل / كتاب الإيمان لأحمد بن حنبل : ژمارە 268]**

## أحمد بن حنبل دەڵێ:

حدثنا عبدالرحمن قال حدثني محمد بن مسلم عن عمرو بن قتادة:

پرسیاری لە طاوس کرد دەربارەی چوونە لای ئافرەتان لە دواوە ؟ **ووتی: ئەمە کوفرە**، دەزانی سەرەتای قەومی لوط چی بوو؟ پیاوان لە دواوە دەچوونە لای ئافرەتان، دواتر پیاوان لەگەڵ پیاوان ئەنجامیاندا.

**[الجامع في كتب الإيمان والرد على المرجئة لعادل / كتاب الإيمان لأحمد بن حنبل : ژمارە 269]**

## عبدالله بن عبدالرحمن الدارمي دەڵێ:

أخبرنا محمد بن يزيد حدثنا يونس بن بكير حدثني ابن إسحاق حدثني أبان بن صالح عن **طاوس و سعيد و مجاهد و عطاء:** سەرزەنشتی چوونە لای ئافرەتیان دەکرد لە دواوە، وە دەیان ووت: **ئەمە کوفرە (هو الكفر).**

**[مسند الدارمي : ژمارە 1272-1275]**

ووتم: ئەگەر دەڵێن ابن مسعود بە (ئەلیف و لام) باسی کوفری کردووە وتوویەتی: (الكفر) نەیووتوە: (كفر)، هاتنی کوفریش بە (الـ) مەبەست پێی کوفری گەورەیە، ئەوا دەڵێین: ابن عباس و طاوس و عطاء و سعید و مجاهد کاتێک پرسیاریان لێکرا دەربارەی چوونە لای ئافرەت لە دواوە، ووتیان: ئەمە پرسیارم لێدەکات دەربارەی کوفر (هذا يسألني عن الكفر) یان ووتیان:

ئەمە کوفرە (هو الكفر)، هەموویان بە (الـ) ووشەی کوفریان دەربڕی، ئێستا دەڵێن چی ؟ چوونە لای ئافرەت لە دواوە کوفری گەورەیە کە بە (الـ) هاتووە ؟! یان ووتەکەی أبو الدرداء کە ووتی: هیچ کەسێک ئەم کارە ناکات جگە لە کافر، ئایا مانای ئەوەیە هەر موسڵمانێک لە دواوە بچێتە لای ئافرەت کافرە ؟! یان أبو هريرة کە ووتی: چوونە لای ئافرەت لە دواوە کوفرە، ئینجا گەر هەر سور بن لەسەر ئەوەی کە ابن مسعود مەبەستی کوفری گەورەیە، ئەوا مولزەم دەبن بەوەی کە بڵێن: حاکم تەنها بۆ یەکجاریش لە ژیانی حوکم بە قورئان نەکات بەهۆی بەرتیلەوە ئەوا کافر دەبێت، کە ئەمەش کەستان نایڵێن و هەمووتان دەڵێن ئەمە کوفری بچووکە، واتا بەڵگە لە دژی خۆتان دەهێننەوە، جا ئەگەر بەڵگەکە بە کوفری بچووک بزانن هەر لە دژتانە، وە ئەگەر بە کوفری گەورەشی بزانن هەر لە دژتانە.

دوو ڕیوایەتی تر کە زیادەڕەوەکان مولزەم دەکات بەوەی یان دەست هەڵگرن لە ڕووکەشی ووتەکەی ابن مسعود کە ووتی بەرتیل لە حوکمدا کوفرە ئینجا ئایەتی (٤٤)ی سورەتی المائدة خوێندەوە، وە یان دەبێت موسڵمان تەکفیر بکەن بە تاوان، لەم دوو ڕێگایە زیاتریان لە بەردەمدا نیە.

**أحمد بن حنبل** دەڵێ:

حدثنا هشيم عن يعلى بن عطاء عن مجاهد ووتی:

ماوەیەک دابڕام لە ابن عمر، کاتێک هاتمەوە چووم بۆ لای، پێی ووتم: ئایا هەستت کرد **خەڵکی کافر بوون** لە دوای تۆ ؟ واتا: هەندێکیان هەندێکیانی کوشت.

**[الجامع في كتب الإيمان والرد على المرجئة لعادل / كتاب الإيمان لأحمد بن حنبل : ژمارە 279]**

ووتم: ابن عمر مەبەستی کافری لە دین دەرچوو نیە، بەڵکو مەبەستی ئەو فەرموودەیە کە ئێستا دەیهێنین.

## أحمد بن حنبل دەڵێ:

حدثنا عبدالله بن نمير قال حدثنا فضيل -يعني ابن غزوان- عن عكرمة عن ابن عباس رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا ووتی:

**پێغەمبەری الله** ﷺ لە حەجی ماڵئاوایی فەرمووی: (لا ترجعوا بعدي **كفارا** يضرب بعضكم رقاب بعض)، واتا: لە دوای من نەگەڕێنەوە ببن بە **کافر**، هەندێکتان بدەن لە ملی هەندێکتان.

**[الجامع في كتب الإيمان والرد على المرجئة لعادل / كتاب الإيمان لأحمد بن حنبل : ژمارە 301]**

ووتم: ئایا کەس پێی وایە ئەمە کوفری گەورە بێت و موسڵمان پێی لە دین دەربچێت ؟ جگە لە نەززامیە زندیقەکان نەبێت کە بە ڕووکەش فەرموودەکە وەردەگرن، کاتێکیش پێیان دەووترێ: ئەی حوکمی ئیمامی علي و الزبير و طلحة و معاوية رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ چیە کە لە جەنگی (الجمل) و (صفين) لەیەکتریان کوشت ؟ ئایا کافر بوون بە پێی ڕووکەشی فەرموودەکە کە دەستان پێیەوە گرتووە ؟ جا ئەو کەسەی کە ووتەکەی ابن مسعود بە ڕووکەش وەردەگرێت و گوێ نادات بە ڕوونکردنەوەی زانایان، ئەوا با لۆمەی نەززامیەکانیش نەکات کە تەنها ڕووکەشی دەقەکان وەردەگرن و گوێ نادەن بە ووتەی هیچ زانایەک.

ڕیوایەتێکی تر کە زیادەڕەوەکان دەستی پێوە دەگرن، کەچی بەڵگەی تێدا لە دژی خۆیان:

## ابن أبي حاتم دەڵێ:

﴿أَكَّٰلُونَ لِلسُّحۡتِۚ﴾ [المائدة:٤٢]

حدثنا عبدالله بن جعفر الرقي حدثنا عبيدالله بن عمرو عن زيد ابن أبي أنيسة عن بكير بن مرزوق عن عبيد بن أبي الجعد عن مسروق عن **عبدالله بن مسعود ووتی:**

هەر کەسێک تکا بکات بۆ کەسێکی تر تاکو زوڵمێکی لەسەر لا بدات یان حەقێکی بۆ بگەڕێنێتەوە، جا دیارییەکی پێشکەش بکرێ ئەویش وەری بگرێت، ئەمە سوحتە.
مسروق دەڵێ: ووتمان: ئەی باوکی عبدالرحمن ئێمە بەرتیل وەرگرتنمان لە حوکمدا بە سوحت دەزانی، عبدالله ووتی: ﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾.
[تفسير ابن أبي حاتم : 85/5]

ووتم: لەم ئەثەرەدا ابن مسعود بۆ قوتابیەکانی ڕوون دەکاتەوە کە دیاری وەرگرتن لە خەڵکی بەرامبەر ئەوەی کە کارێکت بۆیان کردووە یان بە زاراوەی ئەمڕۆ پێی دەووترێ (واسطة) ئەوا ئەم دیاری وەرگرتنە سوحتە.
جا مسروق کە قوتابی ابن مسعود-ە دەڵێ: ئێمە پێمان وابوو بەرتیل وەرگرتن لە حوکمدا سوحتە، نەک ئەوەی کە تۆ باسی دەکەیت.
ابن مسعود وەڵامی دەداتەوە دەڵێ: نەخێر، بەرتیل وەرگرتن لە حوکمدا کوفرە، ئینجا لەگەڵیدا ئایەتەکە دەخوێنێتەوە.

جا لێرەدا لە زیادەڕەوەکان دەپرسین: گەر ئەم کوفرەی ابن مسعود باسی کرد کوفری گەورە بێت، ئایا قوتابیەکانی ابن مسعود بێ ئاگا بوون لەم کوفرە و نەیاندەزانی ئەم کارە کوفرە لە پێشوودا، چونکە وەک دیارە لە هەندێک ڕیوایەتدا مسروق باسی ئەوە دەکات کە ئەوان پێشتر نەیانزانیوە ئەم کارە کوفرە لەم مەجلیسەدا فێری بوونە، هەروەک لە ڕیوایەتی تردا بە ابن مسعود دەڵێ: ئێمە سوحتمان بە هیچ شتێک نەدەزانی جگە لە بەرتیل وەرگرتن لە حوکمدا، ابن مسعود لە وەڵامدا دەڵێ: ئەمە کوفرە.
ئایا قوتابیەکانی ابن مسعود ئەم ماوە درێژە بێ ئاگا بوون لەم کوفرە گەورەیە کە ئێوە تەواوی تەوحیدتان لەم بابەتەدا کۆکردۆتەوە ؟ ئایا قوتابیەکانی ابن مسعود بێ ئاگا بوون لە کوفرێک کە ئێوە لەمڕۆدا هەر باسی کوفر بکرێت یەکەم شت بیرتان بۆ ئەم بابەتە دەچێت ؟!

خاڵێکی تر: ابن مسعود کە دەڵێ: سوحت بەرتیل نیە لە حوکمدا، بەڵکو سوحت وەرگرتنی دیارییە بەرامبەر کارێک کە بۆ کەسێکی ئەنجام دەدەیت، بەرتیل وەرگرتن لە حوکمدا کوفرە، ئەوا ابن عباس و ژمارەیەک لە تابعین بە پێچەوانەی ابن مسعود دەڵێن: سوحت بەرتیل وەرگرتنە لە حوکمدا، مەعلومیشە کە سوحت کوفر نیە بەڵکو تاوانە، جا گەر ابن مسعود پێی وابێت بەرتیل وەرگرتن لە حوکمدا کوفری گەورەیە، ئەوانیش پێیان وابێت بەرتیل وەرگرتن لە حوکمدا تاوانە، ئەوا خیلافێکی ناسراو بوونی دەبوو لەنێوانیان، کەچی هیچ خیلافێکی لەم جۆرە باس نەکراوە لەم بارەیەوە، وەرگرتنی بەرتیل تاوانێکی گەورەیە لەعنەت لە بەرتیل دەر و بەرتیل خۆر کراوە، جا ناوبردنی ئەم کارە بە تاوانی گەورە یان بە کوفری بچووک ئەوا خیلافێکی لەفزیە زیاتر، چونکە زۆربەی تاوانە گەورەکان لە پلەی کوفری بچووکدان، زۆرێکیان لە شەرعدا بە کوفری بچووک ناوبراون.

ئەو زانایانەی کە سوحتیان بە بەرتیل وەرگرتن لە حوکمدا تەفسیر کردووە:

**الطبري** دەڵێ:

حدثني محمد بن سعد قال حدثني أبي قال حدثني عمي قال حدثني أبي عن أبيه عن **ابن عباس ووتی:** ﴿سَمَّٰعُونَ لِلۡكَذِبِ أَكَّٰلُونَ لِلسُّحۡتِۚ﴾ **[المائدة: ٤٢]**، یەهود بەرتیلیان وەرگرت لە حوکمدا، وە حوکمیان کرد بە درۆ.

**[تفسير الطبري : 433/8]**

**آدم بن أبي إياس** دەڵێ:

﴿أَكَّٰلُونَ لِلسُّحۡتِۚ﴾ **[المائدة: ٤٢]**

حدثنا ورقاء عن ابن أبي نجيح عن **مجاهد ووتی:**

سوحت واتا: بەرتیل وەرگرتن لە حوکمدا، ئەوانیش یەهود بوون.

**[تفسير مجاهد : لاپەرە 309]**

## ابن أبي حاتم دەڵێ:

وە ڕیوایەت کراوە لە (سعيد بن جبير والحسن البصري و إبراهيم النخعي و عكرمة) وتوویانە: سوحت: بەرتیل وەرگرتنە لە حوکمدا.

**[تفسير ابن أبي حاتم : 87/5]**

## الطبري دەڵێ:

حدثنا هناد قال حدثنا ابن فضيل عن يحيى بن سعيد عن **عبدالله بن هبيرة السبئي ووتی:**

سێ شت لە سوحتن: پارەی ئافرەتی زیناکەر، بەرتیل لە حوکمدا، وە ئەوەی دەدرا بە کاهینەکان لە سەردەمی جاهیلیدا.

**[تفسير الطبري : 433/8]**

## الطبري دەڵێ:

حدثني المثنى حدثنا مسلم بن إبراهيم قال حدثنا أبو عقيل ووتی:

بیستم الحسن البصري دەربارەی فەرمایشتی الله: ﴿سَمَّٰعُونَ لِلۡكَذِبِ أَكَّٰلُونَ لِلسُّحۡتِۚ﴾ دەیووت: ئەمانە حاکمەکان بوون، گوێ بیستی درۆ دەبوون و بەرتیلیان دەخوارد.

**[تفسير الطبري : 428/8-429]**

ووتم: واتا گوێ گرتن لە درۆی شایەتەکان لەگەڵ زانینی ئەوەی کە درۆ دەکەن.

**الطبري** دەڵێ:

حدثنا بشر بن معاذ قال حدثنا يزيد بن زريع قال حدثنا سعيد عن **قتادة:**

﴿سَمَّٰعُونَ لِلۡكَذِبِ أَكَّٰلُونَ لِلسُّحۡتِۚ﴾ ووتی: ئەمە دەربارەی حاکمەکانی یەهود دابەزی بەر لە ئێوە، گوێ بیستی درۆ دەبوون و بەرتیلیان وەردەگرت.

**[تفسير الطبري : 429/8]**

**مقاتل بن سليمان** دەڵێ:

﴿أَكَّٰلُونَ لِلسُّحۡتِۚ﴾ واتا: بەرتیل وەرگرتن لە حوکمدا، حاکمەکانی یەهود لە هەموو ساڵێکدا پارەیان بۆ تەرخان کرابوو، لە بەرامبەر ئەوەی کە حوکم بکەن بە زوڵم لە بەرژەوەندی ئەو کەسانەی پارەیان دەدا.

**[تفسير مقاتل بن سليمان : 478/1]**

گریمان بشڵێین ئەم کوفرەی ابن مسعود باسی کرد کوفری گەورەیە ئەوا بەم مەرجە کوفری گەورەیە کە وەک یەهود لە پێناوی بەرتیل حوکمی الله بگۆڕن، نەک تەنها بە بەرتیل وەرگرتن لە حوکمدا کافر ببێت، هەر چەندە ئەم تەئویلە لاوازە ئەوەی صەوابە والله أعلم ئەوەیە کە مەبەستی کوفری بچووک بێت وەک زانایان باسیان کردووە، بەڵام گەر بووتریێ کوفری گەورەیە ئەوا بوارێکی دەبێت ئەویش بەپێی ئەم مەرجەی کە باسمان کرد، هەروەک هەندێک لە زانایانی تەفسیر باسی گۆڕینی حوکمی الله-یان کردووە لەلایەن یەهودەوە بەهۆی بەرتیلەوە.

**الطبري** دەڵێ:

﴿وَلَا تَشۡتَرُواْ بِـَٔايَٰتِي ثَمَنٗا قَلِيلٗاۚ﴾ الله دەفەرمووێ: بەرامبەر وازهێنان لە حوکم کردن بە ئایەتەکانی کتێبەکەم کە بۆ موسی-م دابەزاند شتێکی هیچ و کەم وەرمەگرن ئەی زاناکانی یەهود کە بریتیە لە نرخێکی کەم، **الله تعالی ذکره ویستی نەهیان لێ بکات لە خواردنی بەرتیل بەرامبەر گۆڕینی کتێبی الله، وە گۆڕینی حوکمی الله کە دەربارەی ژن و پیاوی خێزانداری زیناکەر داویەتی، وە جگە لەمەش لەو حوکمانەی کە گۆڕییان تاکو بەرتیلی پێوەر بگرن.**

**[تفسير الطبري : 455/8]**

**الطبري** دەڵێ:

حدثني يونس قال أخبرنا ابن وهب ووتی:

**ابن زيد** دەربارەی فەرمایشتی الله: ﴿وَلَا تَشۡتَرُواْ بِـَٔايَٰتِي ثَمَنٗا قَلِيلٗاۚ﴾ ووتی: **بەرتیل مەخۆن لەسەر کتێبەکەم.**

**[تفسير الطبري : 455/8]**

**الطبري** دەڵێ:

﴿سَمَّٰعُونَ لِلۡكَذِبِ أَكَّٰلُونَ لِلسُّحۡتِۚ﴾ الله تعالى ذكره دەفەرمووێ: ئەوانەی یەهود کە وەصفی صیفەتەکانیانم بۆ کردیت ئەی محمد، گوێ دەگرن لە ووتەی باطل و درۆ، وەک ووتنی هەندێکیان بۆ هەندێکیان: محمد درۆزنە پێغەمبەر نیە، وە ووتەی هەندێکیان: **حوکمی زیناکەری خێزاندار لە تەوراتدا قامچی لێدان و ڕوو ڕەش کردنە بە خەڵوز،** وە جگە لەمانە لە شتانی باطل و بوهتان، **وە بەرتیل وەردەگرن**

**و دەیخۆن لە بەرامبەر درۆ کردنیان بە ناوی الله و بوهتان کردنیان بۆ الله.**

**[تفسير الطبري : 428/8]**

**الطبري** دەڵێ:

حدثنا محمد بن الحسين قال حدثنا أحمد بن المفضل قال حدثنا أسباط عن **السدي:**

﴿وَلَا تَشۡتَرُواْ بِـَٔايَٰتِي ثَمَنٗا قَلِيلٗاۚ﴾ ووتی: تەماعێکی کەم وەرمەگرن **لە بەرامبەر شاردنەوەی ئەوەی کە دامبەزاندووە.**

**[تفسير الطبري : 456/8]**

**النسفي** دەڵێ:

﴿أَكَّٰلُونَ لِلسُّحۡتِۚ﴾ یەهود بەرتیلیان وەردەگرت لەسەر حوکمەکان و **حەلاڵ کردنی حەرام.**

**[تفسير النسفي : 448/1]**

وە پێشتر باسمان کرد کە الطبري ووتەی سەلەفی دەربارەی سێ ئایەتەکەی المائدة کردووە بە پێنج ووتە، جا الطبري لە ووتەی چوارەمدا دەڵێ: ووتەی ئەو کەسانەی کە وتوویانە ئەم ئایەتانە دەربارەی ئەهلی کیتاب دابەزین بەڵام مەبەست پێی هەموو خەڵکیە بە موسڵمان و کافرەوە، ئینجا الطبري ووتەی ئەو کەسانە نەقل دەکات کە لەسەر ئەمەن، لە چوار چێوەیاندا ئەو ڕیوایەتە دەهێنێت کە علمقة و مسروق پرسیار لە ابن مسعود دەکەن دەربارەی بەرتیل وەرگرتن لە حوکم، ئەویش دەڵێ: ئەوە کوفرە، ئینجا ئایەتی: ﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾ دەخوێنێتەوە.

کەواتە الطبري-ش ووتەکەی ابن مسعود-ی بەوە لێکداوەتەوە کە ئەگەر موسڵمانانیش وەک ئەهلی کیتاب لە پێناوی بەرتیل حوکمی الله بگۆڕن ئەوا کوفر دەیانگرێتەوە، هەر بۆیەش ئەم ووتەیەی ابن مسعود-ی لە چوارچێوەی ووتەی چوارەمدا هێناوە.

**بڕوانە [تفسير الطبري : 467/8]**

# یاسای دانراو لە دەوڵەتی ئیسلامیدا

زیادەڕەوەکان دەڵێن گەر حوکم کردن بە غەیری شەرعی الله جارێک و دووان نەبێت بەردەوام بن لەسەری وەک یاسایەکی دانراو پەیڕەوی بکەن ئەوا دەبێتە کوفری گەورە، ئێمەش لێرەدا چەند نموونەیەک باس دەکەین لە یاسای دانراوی پێچەوانەی شەرعی الله لە دەوڵە ئیسلامیەکاندا، کەچی زانایان بەم کارانە تەکفیریان نەکردوون.

**أبو عبيد القاسم بن سلام** (دوای هێنانی چەند فەرموودەیەک دەربارەی المکس) دەڵێ: مانای ئەم فەرموودانەی کە تێیدا باسی العاشر و کەراهەتی المکس و توندی حوکمەکەیمان کرد ئەوەیە کە ئەم کارە ئەصلی هەبووە لە سەردەمی جاهیلی، پاشاکانی عەرەب و عەجەم هەموویان ئەنجامیان دەدا، جا عادەتیان وابوو یەک بەش لە دە بەشی ماڵ و سامانی بازرگانان وەربگرن کاتێک بە لایاندا تێدەپەڕین.
ئەو نامانەی کە پێغەمبەر ﷺ ناردوویەتی بۆ خەڵکی شارەکان ئەمە ڕوون دەکاتەوە کە باسمان کرد، وەک: ثقيف و البحرين و دومة الجندل و جگە لەمانەش ئەوانەی کە موسڵمان بوونە (أنهم لا يحشرون ولا يعشرون)، جا بەمە زانیمان کە ئەمە لە عادەتی جاهیلی بووە لەگەڵ کۆمەڵێک فەرموودەی زۆر دەربارەی، جا الله ئەمەی بەتاڵ کردەوە بە پێغەمبەرەکەی ﷺ و بە ئیسلام، وە فەرزی زەکات هات بە پێدانی یەک بەش لە چل بەش، لە هەر 200 درهەمێک 5 درهەم.
**[الأموال : 201/2]**

ووتم: (العاشر) ئەو کەسەیە کە یەک بەش لە دە بەشی سامانی بازرگانان وەردەگرێ، (المکس) بە زاراوەی ئەمڕۆ پێی دەووترێ باج (ضريبة)، یەکەم جار ئومەوییەکانیان (المکس)یان

داهێنا لە ئیسلامدا.

**أبو عبيد القاسم بن سلام** دەڵێ:

حدثنا أبو معاوية عن الأعمش عن شقيق عن **مسروق ووتی:**

والله هیچ کردەوەیەک نازانم زیاتر لێی بترسم لەوەی بمخاتە دۆزەخەوە لەم کارەی ئێوە، وە لەم کارەدا زوڵمم لە هیچ موسڵمان و کافرێکی خاوەن پەیمان نەکردووە نە دینارێک و نە درهەمێک، **بەڵام نازانم ئەم گوریسە چیە کە نە پێغەمبەری الله ﷺ دایناوە نە أبو بکر نە عمر.**

بە مسروق-یان ووت: ئەی چ شتێک وای لێکردیت کە بچیتە ناو ئەم کارەوە ؟

ووتی: زیاد و شریح و شەیتان وازیان لێ نەهێنام تا چوومە ناویەوە.

**[الأموال : ژمارە 1460]**

ووتم: ئەم کارەی مسروق المكس نەبوو، بەڵکو زەکات وەرگرتن بوو لە خەڵکی بە زۆر بەبێ ئەوەی بە ویستی خۆیان بیهێنن، پەتێکیان لەناو دەریا دادەنا هەرکەشتیەک بەوێدا تێپەڕی بوایە ڕایان دەگرت ئەو ماڵەی کە هەیبوو گەر زەکاتی لەسەر بوایە لێیان وەردەگرت، بۆیە مسروق زۆر بەلایەوە سەخت بووە ئەم کارە چونکە لەوێدا کراوە بە بەرپرسی کارەکە هەر لەبەر ئەمەش دەڵێ زۆر لەو کارە دەترسم کە بمخاتە دۆزەخەوە، زیاد بن أبیه والی کوفە بوو وە شریح القاضي ئەوکات قازی کوفە بووە، بۆ ماوەیەک کوفە جێ دەهێڵێت دەچێتە بەصرە، جا زیاد و شریح داوا لە مسروق دەکەن کە ئەم ماوەیە ئەم کارە بگرێتە ئەستۆ تاکو شریح دەگەڕێتەوە، هەر بۆیە مسروق دەڵێ زیاد و شریح و شەیتان وازیان لێ نەهێنام تا توشیان کردم.

عمر بن عبدالعزیز ﵀ یەکێک لە کارەکانی نەهێشتنی المکس و ئەم زەکات وەرگرتنە بوو لە خەڵکی بە زۆر، بە یەکێک لە والیەکانی ووت کە ئەو شوێنەی پارەی المکس-ی تێدا کۆ دەکرێتەوە بیڕوخێنن، وە زەکات بە زۆر لە کەس وەرمەگرن ئیللا مەگەر بە ویستی خۆی بیهێنێت، گەر نەشی هێنا ئەوا الله حیسابی لەگەڵ دەکات.

جا ڕەنگە بڵێن چۆن خەڵکی سەرپشک دەکرێ بە ویستی خۆی زەکات بهێنی یان نەیهێنێ لە کاتێکدا أبو بکر ﵁ جەنگا لە دژی زەکات نەدەران ؟!

زەکاتی ماڵ دوو جۆرە: ماڵی ئاشکرا و ماڵی شاراوە

ماڵی ئاشکرا وەک مەڕو ماڵات و خورما و بەروبوومی زراعەتە

ماڵی شاراوە وەک زێڕ و زیو و پارە و سامانی بازرگانیە

جا کاربەدەستی موسڵمانان زەکاتی ماڵی ئاشکرا لە خەڵک وەردەگرێ کەسێک تایبەت دەکات بە وەرگرتنی زەکات لە خەڵکی، هەروەک پێغەمبەر ﷺ و خەلیفەکانی وەریان گرتووە لە خەڵکی، وە ئەگەر نەیدەن ئەوا دەجەنگن لە دژیان هەروەک أبو بکر ﵁ جەنگا.

بەڵام ماڵی شاراوە کە ئەویش هەر زەکاتی لەسەرە، ئەمەیان کار بەدەست لە خەڵکی وەرناگرێ گەر ویستیان خۆیان دەیهێنن بۆی، گەرنەیان هێنا ئەوا بە زۆر لێیان وەرناگرێ، الله حیسابیان لەگەڵ دەکات، جا ئەوەی مسروق و عمر بن عبدالعزیز باسیان کرد زەکاتی ماڵی شاراوەیە نەک ماڵی ئاشکرا.

جا بڕوانن مسروق دەڵێ: ئەم کارە نە پێغەمبەر ﷺ نە أبو بکر نە عمر ﵄ دایان نەهێناوە، جا ئەم کارە هیچ جیاوازی نیە لەگەڵ یاسا دانراوەکان، ئەوەتا خەڵکیان تایبەت کردووە بۆ ئەم کارە، ئەوەی بە دەریادا تێپەڕێ زەکاتی ماڵی شاراوەی لێ وەردەگرن، ئەم کارەش جارێک و دووان ناکرێ، بەڵکو مسروق کە ساڵی 62 یان 63 مردووە باسی ئەم کارە دەکات، عمر بن عبدالعزیز کە لە ساڵی 99 بۆتە خەلیفە بە والیەکانی دەڵێ ئەم کارە ڕابگرن !!! هەروەها المکس بە هەمان شێوە کە کردبوویان بە یاسا دەبێت 10% لە سامانی بازرگانان وەربگرن بە ناحەق.

تەنانەت دوای هەڵگرتنی ئەم باجە لە سەردەمی عمر بن عبدالعزیز، پاشان چەندین خەلیفەی تر ئەم باجەیان لە خەڵک وەرگرتووە.

**ابن خلدون** دەڵێ:

کاتێک معز الدولة دەسەڵاتی گرتە دەست، سەربازەکان داوای ئازووقەیان کرد وەک عادەتی جارانیان بگرە بە زیاتریشەوە بەهۆی ئەوەی کە دەست بەسەر داگرتنی نوێ بوویەوە، شوێنانێکی کەوتە دەست کە پێشتر لە ژێر دەستی نەبوون، **ئەویش ناچار بوو باج دابنێتە سەر خەڵکی و سامانیان لێ وەربگرێ بە ناحەق.**

**[تاریخ ابن خلدون : 523/3]**

ووتم: معز الدولة لە سەدەی چوارەم و پێنجەم ژیاوە.

**سعید بن منصور** دەڵێ:

حدثنا هشيم قال أنبأنا داود عن **الشعبي ووتی:**

هەواڵ بە معاویة گەیشت کە کەسانێک لە عەرەب میرات وەرگرتنیان لە باوکیان بۆتە ڕێگر لە بەردەم هاتنە ناو ئیسلام، **جا معاوية ووتی: ئێمە میرات لە کافران دەگرین و ئەوان میرات لە ئێمە ناگرن.**

**جا مسروق بن الأجدع ووتی: هیچ بڕیار و حوکمێک لە ئیسلام دانەهێنراوە لەمە سەیرتر بێت.**

**[سنن سعید بن منصور : ژمارە 145]**

ووتم: واتا زانیویانە گەر موسڵمان بن ئەوا ناتوانن میرات لە باوکە کافرەکانیان وەربگرن، چونکە لە فەرمووده هاتووە (موسڵمان میرات لە کافر ناگرێت و کافریش میرات لە موسڵمان ناگرێت)، جا بۆیە نەهاتوونەتە ناو ئیسلام، کاتێک معاویة ئەمە دەبیستێ دەڵێ: ئێمە میرات لە کافران دەگرین و ئەوان میرات لە ئێمە ناگرن، واتا پێچەوانەی فەرموودەکە بڕیار دەردەکات تاکو ئەم خەڵکە بێنە ناو ئیسلام.

سعيد بن منصور دەڵێ:

حدثنا هشيم قال أخبرنا مجالد قال حدثنا **الشعبي ووتی:**

پیاوێک هاتە لای معاویة، ووتی: ئایا ئیسلام زیانم لێ دەدات یان سودم پێدەگەیەنێ؟ معاویة ووتی: سودت پێ دەگەیەنێ، بەڵام بۆچی ئەم پرسیارە دەکەیت ؟ پیاوەکە ووتی: باوکم نەصرانی بوو، جا باوکم مرد لەسەر دینی نەصرانی، منیش موسڵمان بووم، براکانم کە نەصرانی بوون ووتیان: ئێمە لە پێشترین لە تۆ کە میراتی باوکمان وەربگرین، معاویة ووتی: براکانت بهێنە بۆم، جا ئەویش براکانی هێنا، **معاویة ووتی: ئێوە و براکەتان لە میراتی باوکتان یەکسانن، جا معاویة نامەی نوسی بۆ زیاد: با موسڵمان میرات بگرێ لە کافر، وە کافر میرات نەگرێ لە موسڵمان، جا کاتێک نامەکەی معاویة گەیشت بە زیاد، ئەویش ناردی بۆ شریح، فرمانی پێکرد کە موسڵمان میرات بگرێ لە کافر، وە کافر میرات نەگرێ لە موسڵمان، جا شریح پێش ئەمە میراتی موسڵمانی نەدەدا بە کافر، وە میراتی کافری نەدەدا بە موسڵمان، جا کاتێک زیاد فرمانی پێکرد بەم ووتەیە، دوای ئەمە شریح کاتێک حوکمی پێدەکرد دەیووت: ئەمە بڕیاری ئەمیری ئیماندارانە.**

[سنن سعيد بن منصور : ژمارە 146]

**سعيد بن منصور** دەڵێ:

حدثنا هشيم قال أخبرنا إسماعيل بن أبي خالد عن **الشعبي ووتی:**

**کاتێک معاوية بڕیاری دەرکرد دەربارەی ئەم بابەتە، عبدالله بن معقل ووتی: لە ئیسلامدا هیچ بڕیار و حوکمێک دانەهێنراوە دوای بڕیار و حوکمی هاوەڵانی پێغەمبەری الله ﷺ سەیرتر بێت بەلامەوە لە بڕیارەکەی معاوية. ئێمە میرات دەگرین لە کافران، ئەوان میرات ناگرن لێمان! هەروەک چۆن ژن هێنانی ئێمە لە ئەوان حەلالە و ژن هێنانی ئەوان لە ئێمە حەلال نیە.**

[سنن سعيد بن منصور : ژمارە 147]

ووتم: معاوية رضي الله عنه بڕیاری دەرکرد کە موسڵمان میرات لە کافر دەگرێت و کافر میرات لە موسڵمان ناگرێت، وە ئەم بڕیارەی بۆ قازییەکان نارد کە حوکمی پێ بکەن، بەشی یەکەمی بڕیارەکەش کە دەڵێ: (موسڵمان میرات دەگرێت لە کافر) پێچەوانەی فەرموودەی صەحیحە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لا يرث المسلم الكافر، ولا يرث الكافر المسلم) واتا: موسڵمان میرات ناگرێت لە کافر، وە کافریش میرات ناگرێ لە موسڵمان، البخاري و مسلم و جگە لەوانیش ڕیوایەتیان کردووە.

ئەمەش بڕیارە نێردراوە بۆ قازییەکان کە حوکمی پێ بکەن و لەسەری بڕۆن، وەک یاسایەکی دانراو وایە، جارێک و دووانیش جێبەجێ ناکرێ بەڵکو بەردەوام لەسەری دەڕۆن، معاوية ئاگاداری فەرموودەکەشە نەک ئەوەی ئاگاداری نەبێت بە ئیجتیهاد ئەم حوکمە بدات، چونکە لە ئەثەری پیاوە نەصرانیەکە دیارە باسی ئەم فەرموودەیە کراوە ئینجا دواتر معاوية حوکمێکی تری داناوە لە جێگای حوکمی فەرموودەکە، شریح کە قازی بووە هەر جارێک حوکمی

پێکردبوایە دەیووت: ئەمە بڕیاری ئەمیری ئیماندارانە، واتا لەسەر ئەم بڕیارە ڕۆیشتووە بەڵام تەکفیریشی نەکردووە بڵێ تۆ یاسایەکی دانراوت داناوە پێچەوانەی شەرعی الله، بگرە لای زۆرێک لە زیادەڕەوەکان ئەم کارەی معاوية گۆڕینی شەرعی الله-یە و کافر بوونی گومانی تێدا نیە !!!

**أبو حمزة المختار بن عوف السلمي** (لە ووتارەکەیدا بۆ خەڵکی مەککە) دەڵێ:
بەنی ئومەییە گروپێکی گومڕان، دەستدرێژیان وەک دەستدرێژی زاڵمەکانە، لەسەر گومان بڕیار دەدەن و **بە ئارەزوو حوکم دەکەن**، وە بەهۆی تورە بوون خەڵک دەکوژن، وە بە تکای خەڵکی حدودەکان جێبەجێ ناکەن، **وە زەکات وەردەگرن لە کەسانێک کە ئەهلی زەکات نین، وە زەکات دەدەن بە کەسانێک کە ئەهلی زەکات وەرگرتن نین**، الله ئەو هەشت جۆرەی ڕوون کردۆتەوە کە زەکات وەردەگرن، **جا بەنی ئومەییە جۆری نۆیەمیان هێنا کە هیچ حەقێکی زەکات وەرگرتنی نیە، کەچی هەموو زەکاتەکانی وەرگرت، جا بەنی ئومەییە گروپێکن حوکم دەکەن بە غەیری ئەوەی الله دایبەزاندووە.**
**[أنساب الأشراف للبلاذري : 292/9]**

ووتم: أبو حمزة خەواریجە، بەڵام لێرەدا ئەوەی گرنگە بەلامانەوە عەقیدەکەی نیە بەڵکو نەقل کردنیەتی بۆ واقعی سەردەمەکەی خۆی، کە بەنی ئومەییە کۆمەڵێک بڕیاریان دەرکردووە و لەسەری دەڕۆن کە پێچەوانەی حوکمی الله-یە، ئەمەش هەمان ئەو شتەیە کە ئەمڕۆ پێی دەووترێ یاسای دانراو، شتێک نیە جارێک و دووان جێبەجێ بکرێ بەڵکو لە ووتەکەی دیارە وەک یاسایەکی دانراو پەیڕەو دەکرێ.
جا ئایا کەس تەکفیری کردن بەم کارە جگە لە خەواریجەکان ؟

# (یاسق)ی جەنگیز خان

یەکێکی تر لە گومانی زیادەڕەوەکان ئەو کتێبەیە کە جەنگیز خانی پاشای مەغۆل نوسی و حوکمی مەغۆلی پێدەکرد، کە پێکهاتبوو لە حوکمەکانی تەورات و ئینجیل و قورئان و ئارەزووەکانی خۆی، ناوی لێنا (یاسة) یان (یاسا) یان (یاسق) یان (یساق) یان (یسق) کە دروسترینیان ناوی یەکەمە، بەڵام لەم سەردەمەدا (یاسق) زیاتر بەکاردێت بۆی، هەموو ئەم ووشانە بە یەک مانا دێن کە لە بنەڕەتدا ووشەیەکی مەغۆلیە واتا: یاسا و ڕێسا، جا دوای مردنیشی مەغۆل حوکمیان بەم کتێبە کرد، زۆرێک لە زانایان لەو سەردەمەدا فەتوای تەکفیر کردنی ئەو کەسەیاندا کە حوکمی پێدەکات، جا زیادەڕەوەکان دەڵێن: کتێبێک یاساکانی لە سێ کتێبی ئاسمانی و ئارەزووی مرۆڤ وەرگیرا بێت حوکم کردن پێی کوفر بێت، چ جای کتێبێک تەواوی یاساکانی یان زۆربەی بەپێی ئارەزووی مرۆڤ دابنرێن ؟! جا ئەمە لە پێشترە کوفر بێت.

سەرەتا دەبێ بزانین (یاسق) چ یاسایەکی تێدا بووە و بە چ مەبەستێک نوسراوە لەلایەن دانراوەکەی کە جەنگیز خانە، وە چۆن سەیر کراوە لەلایەن مەغۆلەکان، ئینجا حوکمی لەسەر بدەین و شتانی تری لەسەر قیاس بکەین.

**المقريزي** دەڵێ:

سیاسەت دوو جۆرە:

سیاسەتی دادپەروەرانە: حەق دەسەندرێتەوە لە زاڵمی فاجر، ئەمەش لە حوکمە شەرعیەکانە ئەوەی بیزانێ دەیزانێ، وە ئەوەی نەیزانێ نایزانێ، وە زانایان دەربارەی سیاسەتی شەرعی چەندین کتێبیان داناوە.

سیاسەتی ستەمکارانە: شەریعەت حەڕامی کردووە.

وە ئەوەی خەڵکی سەردەمەکەمان دەیڵێن هیچ کام لەمانە نیە، بەڵکو ووشەیەکی مەغۆلیە ئەصلەکەی بریتیە لە (یاسة)، جا خەڵکی مصر گۆڕیان و پیتی (س)یان لە سەرەتای ووشەکە زیاد کرد، ووتیان: (السیاسة)، وە (ئەلیف و لام)یان خستە سەری، جا ئەوانەی ئەمەیان نەدەزانی پێیان وابوو ووشەیەکی عەرەبیە، بەڵام کارەکە بەم جۆرەیە کە پێم ووتی.

وە ئێستا گوێ بگرە کە ئەم ووشەیە چۆن دروست بوو تا لە مصر و الشام بڵاو بوویەوە، جەنگیز خان هەڵسوڕێنەری دەوڵەتی مەغۆل لە وولاتانی ڕۆژهەڵاتدا کاتێک سەرکەوت بەسەر پاشا أونك خان و بووە خاوەنی دەوڵەت، ڕێسا و سزای دانا و لە کتێبی (یاسة) نوسیەوە، وە هەندێک لە خەڵکی پێی دەڵێن: (یسق)، وە ئەصلی ناوەکەی بریتیە لە (یاسة).

جا کاتێک دانانی کتێبەکەی تەواو کرد، بە نەخش کتێبەکەی نوسیەوە لەسەر پارچەی ستیل، **وە کردی بە شەریعەت بۆ قەومەکەی، قەومەکەشی لە دوای جەنگیز خان پێیەوە پابەند بوون تا ئەو کاتەی الله کۆتایی پێ هێنان.**

جەنگیز خان دینداری بە هیچ دینێکی خەڵکی سەر زەوی نەدەکرد، هەروەک ئەمە دەزانی گەر ئاگاداری هەواڵی بوو بیت، **جا (یاسة) بووە حوکمێکی ڕۆیشتوو و جێبەجێ کراو لە دوای جەنگیز خان مایەوە، قەومەکەی لە هیچ حوکمێکی دەرنەدەچوون.**

وە بەندەی صالح و بانگەوازکەر بۆ لای الله تعالی أبو هاشم أحمد بن البرهان رَحِمَهُ ٱللَّهُ پێی ڕاگەیاندم کە نوسخەیەکی (یاسة)ی دیوە لەناو سندوقی کتێبە هەڵگیراوەکانی قوتابخانەی المستنصرية لە بەغداد.

وە بە شێک لەو شتانەی کە جەنگیز خان دایبنابوون لە کتێبی (یاسة) بریتین بوو لە:
ئەوەی زینا بکات دەکوژرێ، جیاوازی نەکردبوو لەنێوان خێزاندار و سەڵت.
ئەوەی نێربازی بکات دەکوژرێ.
ئەوەی بە ئەنقەست درۆ بکات، یان سیحر بکات، یان جاسوسی لەسەر کەسێک بکات، یان بچێتە نێوان دوو کەس لەکاتی ناکۆکیان، وە یارمەتی یەکێکیان بدات لە دژی ئەوی تریان دەکوژرێ.
ئەوەی میز لەناو ئاودا بکات، یان میز بەسەر خۆڵەمێشی ئاگردا بکات دەکوژرێ.
ئەوەی کاڵایەکی پێ بدرێ جا زەرەری تێدا بکات ئەوا دوای سێیەم ڕۆژ دەکوژرێ.
ئەوەی خواردن بدات بە دیلی کەسانێک یان جلی پێ بدات بەبێ ئیزنی ئەوان دەکوژرێ.
ئەوەی کۆیلەیەکی ڕاکردوو ببینێت، یان دیلێکی ڕاکردوو، ئەویش نەیگەڕێنێتەوە دەستی خاوەنەکەی، ئەوا دەکوژرێ.
ئاژەڵ هەر چوار پەلی دەبەسرێتەوە و سکی لەت دەکرێ و دڵی دەمژرێ تاکو دەمرێت، پاشان گۆشتەکەی دەخورێ.
ئەوەی ئاژەڵێک سەربڕێ وەک سەربڕینی موسڵمانان، ئەوا کەسەکە سەردەبڕدرێ،
ئەوەی بارەکەی یان کەوانەکەی یان شتێک لە کەل و پەلەکانی لێ بکەوێت ئەو کەسە هێرش ببات یان پاشەکشە بکات لە کاتی جەنگدا، وە کەسێکی لە دوا بێت، ئەوا دەبێت ئەم کەسەی دواوە دابەزێ و ئەو کەل و پەلانە بداتە دەستی هاوڕێکەی کە لێی کەوتووە، گەر دانەبەزێت و نەیداتە دەستی ئەوا دەکوژرێ، ... (پاشان دەڵێ) **وە کردی بە مەرج هەموو دینەکان بە گەورە دابنرێن بەبێ دەمارگیری بۆ هیچ**

**دینێک بەرامبەر دینێکی تر، وە هەموو ئەمانەی بە نزیک بوونەوە لە الله تعالی دادەنا**، ... (پاشان دەڵێ) هەر یەکێک بەلای کەسانێکدا تێپەڕێ کە نان دەخۆن، ئەوا بۆی هەیە دابەزێت و لەگەڵیان نان بخوات بەبێ ئەوەی ئیزنیان لێوەر بگرێت، وە ئەوانیش بۆیان نیە ڕێگری لێ بکەن.

وە پابەندی کردن کە هیچ یەکێک لەوان دەستی نەخاتە ناو ئاوەوە، بەڵکو شتێک بخاتە ناو ئاوەکە و ئاوەکەی پێ دەربهێنێ، وە ڕێگری لێکردن لە شۆردنی جلەکانیان بەڵکو دەبێ بیپۆشن تاکو دەڕزێ، **وە ڕێگری لێکردن بە هیچ شتێک بڵێن پیس، وە ووتی: هەموو شتێک پاکە، جیاوازی نەکرد لەنێوان پاک و پیس**، ... (پاشان دەڵێ)

وە پابەندی کردن لە هەموو سەرە ساڵێکدا تەواوی کچەکانیان نمایش بکەن بۆ سوڵتان تا هەڵیان بژێرێ بۆ خۆی و کوڕەکانی، ... (پاشان دەڵێ) وە حوکمی (یاسة)ی دا بە کوڕەکەی خۆی جقتاي بن جەنگیز خان، **جا کاتێک مرد ئەوانەی دوای خۆی لە کوڕەکانی و شوێنکەوتووانی پابەند بوون بە حوکمی (یاسة) هەروەک پابەند بوونی موسڵمانانی سەرەتای ئیسلام بە حوکمی قورئان، وە کردیان بە دین، لە هیچ یەکێک لەوان نەزانراوە موخالەفەی بکات بە جۆرێک لە جۆرەکان.**

**بڕوانە [الخطط : 3/82-85]**

ووتم: ئەم چاپە و چاپی دار الكتب العلمية پڕیەتی لە هەڵە، تەنها لە نەقل کردنی ئەم ووتەیە کۆمەڵێک هەڵەم دۆزیەوە، لەبەر درێژ بوونە ئاماژەم بە هەڵەکان نەداوە لەلایەن خۆمەوە ڕاستم کردۆتەوە.

سەیری ئەم یاسایانەی کتێبی (یاسق) بکە کە المقریزي باسی کرد:

(دەبێ هەموو دینەکان بە گەورە سەیر بکرێن بەبێ دەمارگیری هەبوون بۆ هیچ دینێک، وە ئەم کارەش بە نزیک بوونەوە لە الله تعالی دادەنرێت) !
ئەمە کوفرێکی ڕوونە لە تیشکی خۆر ڕوونترە پێویست ناکات قسەی لەسەر بکەین.

(هیچ شتێک پیس نیە هەموو شتەکان پاکن، نابێ بە هیچ شتێک بووترێ پیس) !
ئەمە هەڵوەشاندنەوەی سەر لەبەری بابەتی (الطهارة)یە کە یەکەم بابەتە لە هەموو کتێبە فقهیەکاندا، پاک و پیس دوو حوکمی شەرعین حەقی الله تعالی-یە نەک مرۆڤ.

(مەغۆلەکان دوای مردنی جەنگیز خان پابەندی یاسق بوون وەک پابەند بوونی موسڵمانانی سەرەتای ئیسلام بە دینی ئیسلام، وە یاسق-یان کرد بە دین، لە هیچ یەکێکیان لەوان نەزانراوە موخالەفەی بکات) !
جەنگیز خان لای مەغۆلەکان پێغەمبەر و کوڕی الله بووە وەک دواتر دەیهێنین، وە کتێبەکەی کتێبێکی شەرعی بوو نەک تەنها یاسای دانراو بێت دین جیا بکاتەوە لە دەوڵەت، بەڵکو یاساکانی وەک شەرعێک سەیر دەکرا و بە گەورە و پیرۆز لێیان دەڕوانی، هەر بۆیە ژمارەیەک لە زانایان یاسق بە دین و شەریعەتی جەنگیز خان ناو دەبەن، نەک تەنها وەک یاسایەکی دانراوی دوور لە دین بێت.

کەواتە یاسق کتێبێکی دینیە وەک وەحی وایە لای مەغۆلەکان، ئەوەی یاساکانی جێبەجێ بکات نزیک دەبێتەوە لە الله، چونکە وەک ئەوە وایە حوکمی الله-ی جێبەجێ کردبێت، وەک ابن تيمية باسی دەکات کاتێک نوێنەری جەنگیز خان هاتە لامان ووتاری بۆ داین، ووتی: محمد و جەنگیز خان دوو گەورەترین پێغەمبەری الله-ن !

جا کتێبێک بەم جۆرە بێت کەس گومانی لە کافری دانەرەکەی و کەسانی حوکم بەرەوە بۆی هەیە کە وەک وەحی سەیری کتێبەکە بکەن و بە پیرۆز و گەورەی بزانن ؟!

**ابن تيمية** دەڵێ:

**بیروباوەڕی ئەم مەغۆلانە دەربارەی جەنگیز خان بیروباوەڕێکی گەورەیە، بڕوایان وایە جەنگیز خان کوڕی الله-یە هاوشێوەی بیروباوەڕی نەصارا دەربارەی المسيح**، وە دەڵێن خۆر دایکی جەنگیزخانی دوو گیان کردووە، دایکی لەناو خێمەدا بووە خۆریش لە دەرچەی سەرەوەی خێمەکە هاتۆتە خوارەوە و چۆنە ناو لەشیەوە تا دوو گیان بووە، وە مەعلومە لای هەموو خاوەن دینێک کە ئەمە درۆیە، وە ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە جەنگیز خان منداڵی زینایە، دایکی زینای کردووە و شاردوویەتیەوە و بانگەشەی ئەم درۆیەی کردووە تاکو تاوانی زینا لەسەر خۆی لابەرێت، **لەگەڵ ئەوەشدا مەغۆلەکان جەنگیزخان بە گەورەترین پێغەمبەری الله دادەنێن لە بە گەورە دانانیان بۆ ئەو ڕێبازەی کە بۆی داناون و دایڕشتووە بە گومان و ئارەزووی خۆی، تەنانەت دەربارەی ئەو سامانەی کە لەلایان هەیە دەڵێن: ئەمە رزقی جەنگیزخانە، وە سوپاسی جەنگیزخان دەکەن لەسەر خواردن و خواردنەوەیان، وە کوشتنی هەر کەسێک بە حەلال دەزانن کە دژایەتی ئەو ڕێبازە بکات کە ئەم کافری مەلعونی دژایەتیکەری الله و پێغەمبەرانی و بەندە ئیماندارەکانی بۆی داناون.**

**[مجموع الفتاوى : 28/521-522]**

ووتم: جوان لە حاڵی یاسق و جەنگیز خان و مەغۆل بڕوانە، تاکو شتانێکی قیاس نەکەیتە سەر کە زۆر دوورن لێی.

**ابن تيمية** (دەربارەی جەنگیز خان) دەڵێ:

ئەم کافرە سنوری بەزاند و تەکەبوری کرد لە زەویدا، ئەهلی هەموو دینەکان دەچەوسێنێتەوە لە موسڵمانان و یەهود و نەصارا و هەر کەسێک کە موخالەفەی بکات لە موشریکەکان بە کوشتنی پیاوەکانیان و بە کەنیزەک گرتنی ژنەکانیان و بردنی ماڵ و سامانەکانیان و لەناو بردنی کشتوکاڵ و ئاژەڵەکان، اللە-ش فەسادی خۆش ناوێت، وە جەنگیز خان خەڵکی هەڵدەگەڕێنێتەوە لەوەی کە لە سەرینە لە سوننەتی پێغەمبەران **بۆ چوونە ناو ئەو ڕێبازە جاهیلیە و شەریعەتە کوفریەی خۆی کە دایهێناوە.**

**[مجموع الفتاوى : 523/28]**

ووتم: جەنگیز خان شەریعەتێکی کوفری داناوە، گومان لەوە دانیە گەر یاسای دانراو کوفری تێدا بێت ئەوا حاکم تەنها بە دانانی یاساکە کافر دەبێت، حوکم بەرەوەش بە حوکم بردنەوەی بۆ یاسا کوفریەکە کافر دەبێت، چ جای ئەوەی شەرعێک دابنرێت لەلایەن طاغوتێکی وەک جەنگیز خان بەناوی دینەوە، وە تەعزیم بکرێت سەرەڕای هەبوونی کۆمەڵێک کوفر تێیدا ؟

**المقريزي** (دەربارەی الناصر محمد بن قلاوون و أمیر أیتمش) دەڵێ:

هەردووکیان زمانی تورکی قیجانیان دەزانی، وە دەگەڕانەوە بۆ لای ئەم دووانە دەربارەی **(الياسة) کە شەریعەتی جەنگیز خانە.**

**[الخطط : 453/2]**

**الذهبي** (دەربارەی جەنگیز خان) دەڵێ:

هۆزەکانی مەغۆل بۆی ملکەچ بوون، ئەویش یاسة-ی بۆ دانان، کە دەستیان پێوە دەگرت و هەرگیز موخالەفەیان نەدەکرد. **وە عیبادەتیان دەکرد بە گوێڕایەڵی کردنی و بە گەورە دانانی.**

**[سير أعلام النبلاء : 228/22]**

ووتم: واتا یاسق کتێبێکی دینی پیرۆزە لای مەغۆلەکان، بە گەورە دانانی ئەم کتێبە بە عیبادەت دەزانن ! ئایا ئەمە قیاس دەکرێتە سەر یاسایەکی دانراو کە خاوەنەکەی موسڵمانە و هیچ کوفرێک لە یاساکانیدا نیە و دان بە تاوانباری خۆی دادەنێت و دەڵێ حوکمی الله باشترینە ؟!

**السبكي الصغير** (دەربارەی جەنگیز خان) دەڵێ:

**مەغۆلەکان کردیان بە پاشا و گوێڕایەڵیان کرد وەک گوێڕایەڵی کردنی بەندە موخلیصەکان بۆ رب العالمين،** ... (پاشان دەڵێ) **وە شەرعێک و دینێکی بۆ داهێنان لەعنەتی الله-ی لێبێ ناوی لێنا (الياسا). مەغۆلەکان حوکم ناکەن تەنها بەو نەبێت.**

**[طبقات الشافعية الكبرى : 330/1]**

ووتم: بڕوانە ئەم تەعزیم کردنەی مەغۆل بۆ جەنگیز خان و کتێبەکەی، وە ناوبردنی کتێبەکەی بە شەرع و بە دین !

جا کاتێک حاکم ئەمە حاڵی بێت و کتێبەکەی بەم جۆرە بێت و خەڵکەکەش بەم جۆرە تەعزیمی بکەن، ئایا هیچ موسڵمانێک گومانی لە کافر بوونیان هەیە ؟

بەڵام دانانی یاسا بەبێ بوونی ئەم کوفرانەی کە باسکران قیاس بکرێتە سەر یاسقی جەنگیز خان ئەوا بێ ئاگاییە لە حاڵی جەنگیز خان و کتێبەکەی و مەغۆل، کەسێکیش شارەزایی نەبوو دەربارەی کەسێک یان شتێک ئەوا بۆی نیە ئەم شتە قیاس بکاتە سەر هیچ شتێکی تر.

**القلقشندي** (دەربارەی عەقیدەی جەنگیز خان و شوێنکەوتووانی) دەڵێ:

علاء الدين بن عطاء ملك الجويني دەڵێ: ئەوەی دیارە لە کۆی مەزهەبەکانیان دان پێدانانە بە تاک و تەنهایی الله تعالى، وە الله ئاسمانەکان و زەوی دروست کردووە، وە دەژێنێ و دەمرێنێ، وە دەوڵەمەند دەکات و هەژار دەکات، وە دەبەخشێ و دەگرێتەوە، وە توانای بەسەر هەموو شتێکدا هەیە، وە هەیانە لەسەر دینی یەهودییە، وە هەیانە لەسەر دینی نەصرانیە، وە هەیانە هەموو دینەکانی وەلا ناوە، وە هەیانە بە بت پەرستی لە الله نزیک دەبێتەوە.

**وە الجويني دەڵێ: عادەتی نەوەکانی جەنگیز خان وایە کە هەرکەسێک لەوان بڕوای بە مەزهەبێک هەبێت کەس سەرزەنشتی ناکات، وە ئەوەی جەنگیز خان لەسەری بوو لە دینداری کردن نەوەکانی لە دوای خۆی لەسەری ڕۆیشتن، ئەویش ڕۆیشتن بوو لەسەر مەنهەجی (یاسة) کە جەنگیز خان دایینابوو**، کۆمەڵێک یاسا بوو بە عەقڵ و هۆشی خۆی داینابوو، حوکم و حدودەکانی تێدا دانابوو، لەوانەیە هەندێکی کەمی موافقی شەریعەتی محمدی بێت، وە زۆربەی پێچەوانەیەتی، ناوی لێنا (الياسة الكبرى) نوسیەوە و فرمانی کرد لە خەزێنەکەی دابنرێت نەوەکانی لەیەکتری وەربگرن و منداڵەکانی خێزانەکەی فێر بکرێن، ... (دوای هێنانی چەند یاسایەکی ناو کتێبەکە کە پێشتر باسمان کردووە، پاشان دەڵێ) **وە عادەتیان لە ڕێز**

**گرتن، ڕێبازی جەنگیز خان بەو جۆرە بوو کە سەرکردەکانی هەموو دینێک بە گەورە سەیر بکرێن، وە بە گەورە سەیرکردنیان بە نزیک بوونەوە لە الله تعالی دابنرێت.**

بڕوانە [صبح الأعشی : 4/314-315]

ووتم: بڕوانە ئەم ووتەیە: (دینداری کردنی مەغۆل بریتی بوو لە ڕۆیشتن لەسەر مەنهەجی یاسقی جەنگیز خان) !

کەواتە یاسق دینە جەنگیز خان دایناوە مەغۆلیش لەسەری دەڕۆن، یاسایەک نیە لە دەرەوەی شەرع بڕیاری لەسەر درابێت و خۆی بە تاوانبار بزانێت و حوکمی الله-ی پێ باشتر بێت.

کە دەڵێ: (ڕێبازی جەنگیز خان بەو جۆرە بوو کە سەرکردەکانی هەموو دینێک بە گەورە سەیر بکرێن، وە بە گەورە سەیرکردنیان بە نزیک بوونەوە لە الله تعالی دابنرێت).

ئەم یاسایەش هەر لەناو کتێبی (یاسة) هەیە، بە بەڵگەی ئەوەی کە المقریزي لەمیانەی نەقل کردنی هەندێک لە یاساکانی ناو کتێبی (یاسة) ئەمەی نەقل کرد، کاتێک ووتی: (وە کردی بە مەرج هەموو دینەکان بە گەورە دابنرێن بەبێ دەمارگیری بۆ هیچ دینێک بەرامبەر دینێکی تر، وە هەموو ئەم یاسایانەی بە نزیک بوونەوە لە الله تعالی دادەنا).

الجویني کە القلقشندي هەندێک بەشی کتێبی (یاسة)ی لێ نەقل دەکات زانا ئەشعەریەکە نیە، یەکێکی ترە لە سەردەمی هۆلاکۆ لە بەغداد ژیاوە، وەزیر و مێژوونوس بووە، جەنگیز خانیش باپیری هۆلاکۆ بووە، الجویني کەسێکی نزیک بووە لە هۆلاکۆ، لە سەردەمی هۆلاکۆدا کراوە بە حاکمی عیراق، بۆیە نەقل کردنی کتێبەکە لەلایەن ئەو، وە باسکردنی حاڵی مەغۆلەکان دەربارەی (یاسة) زۆر گرنگ و بە نرخە، چونکە خۆی لەناویاندا ژیاوە و سەردەمەکەی نزیکە لە جەنگیز خان، کاتێک جەنگیز خان مردووە الجویني تەمەنی یەک ساڵ بووە.

**أحمد رضا العاملي** دەڵێ:

**الياسا: کتێبی شەریعە بوو**، جەنگیز خان داینابوو بۆ دەوڵەتەکەی پاشان بۆ قەومەکەی لەدوای خۆی.

**[معجم متن اللغة : 842/5]**

ووتم: أحمد رضا العاملي سەردەمەکەی هێندە کۆن نیە ساڵی 1953 مردووە، ناوبردنی کتێبەکەی جەنگیز خان بە کتێبی (شەریعە) تەئکید دەکاتەوە لەسەر ئەوەی کە ئەم کتێبە وەکو دین نوسراوە نەک وەک یاسای دانراوی دوور لە دین، چونکە لەم سەردەمانەی دوایی زیاتر ووشەی (قانون) بەکاردێت بۆ ئەم بابەتانە، بە پێچەوانەی ووشەی (شەریعە) کە بۆتە ووشەیەکی تەواو دینی.

**ابن تيمية** دەڵێ:

ئەو شتانەی کە البندق هاوێژەران دایان هێناوە لە پەیمان، کە پێی دەڵێن: پەیمانی البندق، لەو بیدعانەیە کە ئەصلی نیە لە شەریعەتدا، بە تایبەتی ئەوەی لێیانەوە باس دەکرێ کە سوێند دەخۆن بە الله بە درۆ، وە سوێند دەخۆن بە پەیمانی البندق بە ڕاستگۆیی، ئەمە کاری کەسێک نیە کە بڕوای بە الله و ڕۆژی دوایی هەبێت، بە تایبەتی کاتێک حاکمەکەیان حوکم دەکات کە حاکمانی جاهیلین حوکم بە غەیری ئەوە دەکەن کە الله دایبەزاندووە، گەر سوێند بخوات بە الله بە درۆ ئەوا هەڕەشەی لێ ناکەن، وە ئەگەر سوێند بخوات بە البندق بە درۆ هەڕەشەی لێ دەکەن، ئەمەش حوکمی کەسێکە کە بڕوای بە الله و پێغەمبەرەکەی و ڕۆژی دوایی نیە، **وە بە هەمان شێوە ئەو یاسایانەی کە دایانناوە لە پلەی شەریعەت دایە**، گەورەکانیان تێیدا

پێش دەخەن و پرسیاریان لێ دەکەن و فەتوایان لێوەر دەگرن، وە حوکم دەکەن بە غەیری ئەوەی الله دایبەزاندووە، بەڵکو حوکم بە جاهیلیەتی حاکمەکەیە، **لە شێوەی یاسقی مەغۆلەکان و عادەتی پێشینی دەشتەکیەکانە**، وە خراپتریشە لەمە، الله تعالی فەرموویەتی: ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَٰفِرُونَ﴾ وە حاکمەکانیان حوکم دەکەن بە جەهل و بە غەیری ئەوەی الله دایبەزاندووە، ئەو کەسە بەرز دەکەنەوە کە الله و پێغەمبەرەکەی فرمانیان نەکردووە بە بەرز کردنەوەی، وە ئەو کەسە دادەبەزێنن کە الله و پێغەمبەرەکەی فرمانیان نەکردووە بە نزم کردنەوەی، **وە ئەو کەسە دەکەوێنن و بە تاوانباری دادەنێن کە موخالەفەی هەندێک لە یاسا بیدعیەکانیان بکات.**

**[جامع المسائل : المجموعة السابعة / لاپەرە 303-304]**

ووتم: (البندق) تۆپێکی خڕی بچووکە قەبارەکەی بە قەدەر (بُندُق) دەبێت کە جۆرێکە لە چەرەزات هەر بۆیەش بەمە ناونراوە، لە قوڕ یان لە ئاسن دروست دەکرێ بە کەوان دەهاوێژرێت بۆ ڕاو کردن بەکاردەهات، لە سەردەمی عەباسیەکان بە شێوەیەکی بەربڵاو ئەم کۆمەڵەیە سەریان هەڵدا، کە وەک یارییەک لەنێوان خۆیاندا ئەنجامیان دەدا یاسای تایبەتیان بۆ دانا بوو هەروەک ئەمڕۆ تەواوی یارییەکان یاسای تایبەتی خۆیان هەیە، بەڵام یاساکانی البندق هێندە گەورە و پیرۆز کرا تا وای لێهات لە شەرعی الله بە گەورەتر سەیر بکرێت هەروەک ابن تیمیة باسیکرد.

لە سەدەکانی دواتر کە باڕوت پەیدا بوو چەکە نوێیەکانی لێ دروستکرا یەکێک لەوان تفەنگ بوو، کە ئەمڕۆ لە زمانی عەرەبیدا پێی دەووترێ: (البندقية) کە هەر لەم البندق-ە کۆنە وەرگیراوە.

بڕوانە ووتی: (ئەو یاسایانەی کە البندق هاوێژەران دایانناوە لە پلەی شەریعەت دایە، وەک

یاسقی مەغۆلەکان و عادەتی دەشتەکیەکانە) واتا: یاسقی جەنگیزخان وەک دین سەیرکراوە، عادەتی دەشتەکیەکانیش بە هەمان شێوە، هەر بۆیەش زانایانی نەجد حوکم کردن بە عادەتی دەشتەکیەکان و حوکم بردنەوە بۆی بە کوفری گەورە دادەنێن وەک لە بەشی دووەم باسی دەکەین.

جا ڕەنگە بووترێ ابن تيمية باسی عادەتی دەشتەکیەکانی سەردەمی خۆی دەکات، چۆن دایدەبەزێنیتە سەر دەشتەکیەکانی نەجد ؟ دەڵێم: لە ووتەی زانا نەجدیەکان بە هەمان شێوە باسکراوە کە دەشتەکیەکان عادەتەکانیان وەک دین و شەرع سەیر دەکەن.

**ابن كثير** دەڵێ:

الجويني باسی کردووە کە یەکێک لە عابیدەکانی مەغۆل بەسەر چیا دەکەوت لە سەرمایەکی زۆر بەتین بۆ عیبادەت کردن، جا بیستی یەکێک پێی دەڵێ: **ئێمە جەنگیز خان و نەوەکانیمان کرد بە خاوەنی ڕووی زەوی.**

**الجويني دەڵێ: شێخەکانی مەغۆل باوەڕیان بەم قسەیە دەکرد و بەبێ کێشمەکێشم وەریان دەگرت.**

**[البداية والنهاية : 162/17]**

ووتم: سەیری ئەم باوەڕ هەبوونەی مەغۆل بکە بە جەنگیزخان، جا ناکرێ بەبێ ئاگاداربوون لە بیروباوەڕی مەغۆل دەربارەی جەنگیز خان و کتێبەکەی شتانی تری قیاس بکرێتە سەر، ئەگەرچی سەرکردەکانی ئەمڕۆ کافریش بن و دەستوری ووڵاتان پڕی کوفر بێت هاوشێوەی یاسق بەڵام زانینی تەئصیلی ئەم بابەتە لەسەر مەنهەجی ئەهلی سوننە کاریگەری و گۆڕانکاری زۆر دەبێت بەسەر موسڵمانانەوە، هەم لە مامەڵە کردنیاندا وە هەم لە حوکمدانیاندا.

# پوختەی ووتە
# دەربارەی حوکم کردن بە غەیری شەرعی الله

لە کۆتایی ئەم بەشەدا گفتوگۆیەکی کورت لەگەڵ هەموو ئەم تەئصیلاتانە دەکەین کە دەربارەی ئەم بابەتە ووتراوە، وە بەراوردی دەکەین بە مەنهەجی ئەهلی سوننە و بە پێی ئەم مەنهەجە حوکمی لەسەر دەدەین.

تەئصیلێکیان دەڵێ: هەموو حوکم نەکردنێک بە قورئان کوفری گەورەیە، تەنانەت ئەوەی تاوانێکی بچووکیش ئەنجام بدات کافرە.
ئەم تەئصیلە نازانم چ گروپێک خاوەنیەتی، بەڵام هەندێک لە زانایان بەشێک لە خەواریج و موعتەزیلەیان مولزەم کردووە بەم حوکمە، ئەمەش نیشانەی ئەوەیە کە ووتەی صەریحی هیچ گروپێک نیە بەڵام لازمی مەزهەبەکەیانە، واتا ووتەکەیان سەر بۆ ئەم ئەنجامە دەکێشێت، جا ڕەنگە ئەوانەی ئەم کتێبە دەخوێننەوە بڵێن ئێمە بەرین لەم ووتەیە ئەمە ووتەی خەواریجە، بەڵام بێ ئاگان کە ئەمە لازمی ووتەکەیانە، کە دەڵێن ئەوەی یاسایەک دابنێت کە پێچەوانەی شەرع بێت جا بەردەوام لەسەری بڕوات نەک جارێک و دووان ئەوا کوفری گەورەی کردووە، ئەو موسڵمانەش داخیلی ووتەکەتان دەبێت کە بە درێژایی تەمەنی عەرەق دەخواتەوە و زینا دەکات و نیازی تەوبە کردنی نیە هەر بە خەیاڵیشی دانایەت، یاسا دانەرەکە فرمانی پێکراوە دەستی دز ببڕێت کەچی دەڵێ بەندی دەکەم، ئەم کەسەش فرمانی پێکراوە داوێن پاک بێت و عەرەق نەخواتەوە کەچی هەردووکیان ئەنجام دەدات بە بەردەوامی تاکو دەمرێت، هەردووکیان حوکمیان کرد بە پێچەوانەی شەرع، هەر بۆیە ئیمام أحمد کاتێک الشالنجي پرسیاری لێدەکات دەربارەی ئەو کەسەی کە سورە لەسەر ئەنجامدانی تاوانە گەورەکان بەوپەڕی تواناوە ئەنجامی دەدات حوکمی چیە ؟ ئیمام أحمد ووتی: ئەمە وەکو ووتەکەی ابن عباس-ە دەربارەی ئایەتی: ﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾

واتا: کفر دون کفر، بڕوانە ئەو کەسەی سورە لەسەر ئەنجامدانی تاوانە گەورەکان یەکسانی دەکات بەو کەسەی کە حوکم ناکات بە قورئان، کە ئەمە لەلای ئێوە دوو شتی جیاوازە، ئەوەی تاوان ئەنجام دەدات حوکمی نەکردووە بە قورئان و تاوانبارە، بەڵام ئەو حاکمەی حوکم ناکات بە قورئان کافرە ! کەچی ئیمام أحمد هەردووکیانی وەک یەک سەیرکرد، بەڵێ ڕاستە حاکم حوکمەکەی کەسانی تریش دەگرێتەوە تەنها پەیوەست نیە بەخۆی، لەم ڕووەدا تاوانەکەی گەورەترە بە پێچەوانەی ئەو کەسەی کە تاوانەکەی تەنها بۆ خۆیەتی، بەڵام تەکفیر کردنی یەکێکیان و تاوانبار کردنی ئەوی تریان شتێکی بێ بەڵگەیە، چونکە دەکرێ موسڵمانەکەش سەرەڕای عەرەق خواردنەوە و زینا کردنی هەڵسێ بە کردنەوەی کۆمەڵێک باڕ و یانەی شەوانە، ئەوکات دەبێتە کافر کە تاوانەکەی تەنها بۆخۆی نیە و خەڵکی تریش توش دەکات ؟!

گەر دەڵێن ئاخر ئەمە خەڵکی سزا نادات گەر نەچن بۆ باڕەکەی، بەڵام حاکمەکە ئەوەی گوێڕایەڵی نەکات لە حوکمەکانی ئەوا سزای دەدات، دەڵێین: ئەی ئەو باوکەی کە عەرەق خۆرە بە کوڕەکەی دەڵێ بڕۆ عەرەقم بۆ بکڕە گەر بۆمی نەکڕیت توشی لێدان دەبیت، باوکەکە تاوان دەکات و تاوانەکە دەسەپێنێ بەسەر کوڕەکەی، وە ئەگەر جێبەجێی نەکات سزای دەدات، ئایا بەم کارە کافر دەبێت ؟ گەر دەڵێن ئاخر حاکمەکە ئەمەی کردۆتە یاسا و لەسەری دەڕوات، دەڵێین: ئەی ئەو پیاوە عەرەق خۆرەی کە بەردەوامە لەسەر عەرەق خواردن تا دەمرێت تەرکی ناکات بۆ کافر نیە ؟ ئەی گەر هاتوو لەسەر پارچە کاغەزێک نوسی من تا دەمرم عەرەق دەخۆمەوە، ئەوکات دەبێتە کافر ؟ هۆکاری تەکفیر کردنی تەنها نوسینەوەی تاوانەکەیە؟! گەر بەردەوام تاوان بکات کافر نیە، بەڵام گەر لەسەر کاغەزێک نوسی من بەردەوام تاوان دەکەم ئەوکات دەبێتە کافر ؟! ئەمە چ مەزهەبێکە کە هۆکاری تەکفیر کردن لەسەر نوسین بوەستێ، حاکم حوکم نەکات بە قورئان کافر نیە بەڵام گەر لەسەر کاغەزێک نوسی حوکم ناکەم بە قورئان ئەوکات کافرە چونکە بۆتە یاسا !!! ئەی معاوية ﵁ کاتێک بۆ قازیەکانی نوسی با موسڵمان میرات بگرێ لە کافر، بەمە کافر بوو کە کردی بە یاسا و

قازیەکانی پێ پابەند کرد ؟! ئەی تەفسیرەکەی عبدالرحمن بن زید بن أسلم کە ووتی: ئەوەی نوسراوێک لەلایەن خۆیەوە بنوسێت، واز لە حوکمی قورئان بهێنێت و حوکم بە نوسراوەکەی خۆی بکات، وە نوسراوەکەی خۆی بداتە پاڵ الله ئەوکات کافرە، هیچ ووتەیەک هەیە لەمە ڕوونتر کە یاسای دانراو نابێتە کوفر ئیللا مەگەر بیداتە پاڵ شەرع، لەگەڵ باقی مەرجەکانی تریش کە پێشتر باسمان کرد وەک بە باشتر دانانی یاساکەی خۆی یان یەکسان کردنی لەگەڵ حوکمی الله، یان حەلال کردنی، یان سوکایەتی و گاڵتە کردن و ئینکار کردنی حوکمی الله، گەر دەڵێن گەر جارێک و دووان حوکم نەکات بە قورئان ئەوا کوفری بچووکە بەڵام بیکات بە یاسا و هەمیشە لەسەری بڕوات ئەوا کوفری گەورەیە، کە بەداخەوە ئەم تەئصیلە بۆتە باوترین تەئصیلی ئەم بابەتە کە زۆرینەی خەڵکی دووبارەی دەکەنەوە، کە بەلای منە ئەمە لاوازترینیەتی چونکە هیچ شتێک نیە لە عەقیدەی ئەهلی سوننەدا جارێک و دووان ئەنجامی بدەیت تاوان بێت، بەڵام دە جار و بیست جار ئەنجامی بدەیت ببێتە کوفر، گەر لە ئەصلدا تاوانە کە جاری یەکەم ئەنجامی دەدات ئەی چۆن دواتر بە زۆر ئەنجامدانی دەبێتە کوفر ؟! ئەم ووتەیە مولزەمتان دەکات کە کەسی سوور بوو لەسەر تاوان تەکفیر بکەن چونکە زۆری ئەنجام داوە، گەر دەڵێن لە ئەصلدا کوفرە، دەڵێین لە چ دینێک و مەزهەبێک کوفرێک هەیە جارێک و دووان ئەنجامی بدەیت کافر نابیت بەڵام زۆر ئەنجامی بدەیت کافر دەبیت ؟! ئایا جاری یەکەم و دووەم بەخشراوە لە کوفرەکە ؟! پاشان ئەم ژمارەیە چەندە بە دیاریکراوی کە حاکمی پێ تەکفیر دەکرێت ؟ بیست جار حوکم نەکات بە قورئان ؟ یان پەنجا ؟ یان سەد ؟ یان هەزار ؟ چەند جار حوکم نەکات بە قورئان دەووترێ ژمارەکە زۆر بوو تەکفیری بکەن ؟ کەسێک تەرخان دەکەن بۆ ئەوەی بیژمێرێت کە حاکم چەند جار حوکمی نەکردووە بە قورئان گەر گەیشت بە ژمارە ئەوەندە ئەوکات کافرە ؟! ئەمە چ دینێکە کە نە سەلەف باسی کردووە نە خەلەف ؟! ئێستا هەست بە هەڵەکانی ئەم تەئصیلەی شێخ محمد بن إبراهیم آل الشیخ دەکەن کە دایهێناوە ؟ ئەگەرچی شێخ ڕۆڵێکی کاریگەری هەبووە لە حوکم کردن بە شەرع و واز هێنان لە هەموو یاسایەک کە پێچەوانەی شەرعە، بەڵام تەئصیلەکەی پێچەوانەی

مەزهەبی ئەهلی سوننەیە، تەنانەت یەک زاناتان بینی لە هاوەڵانەوە تاکو خەلەف باسی ژمارە بکەن، بڵێن گەر ژمارەیەکی کەم بوو تاوانە بەڵام گەر ژمارەیەکی زۆر بوو کوفرە ؟ کەسیان هیچ بەند و مەرجێک باس ناکەن، بە ڕەهایی دەڵێن ئەوەی حوکم نەکات بە قورئان زاڵم و فاسق و تاوانبارە، گەر ئینکاری لێ بکات کافرە، گەر ئەمە عەقیدەی سەلەف بوایە ئەوا ئاماژەیان بەم مەرجە دەکرد، مەحاڵە هەموویان ئەمە عەقیدەیان بێت کەچی کەسیان باسی نەکەن، گەر دەڵێن یاسایەکی گشتی دابنێت بۆ تەواوی بابەتەکان و بیکات بە حوکمێکی گشتی ئەوکات کوفری گەورەیە، هەروەک ئێستا بوونی هەیە بۆ هەموو بابەتێک یاسایان داناوە و هەموو بابەتەکان بە پێی یاسا بەڕێوە دەچن، دەڵێین: عبدالعزيز الكناني کە زانایەکی سەلەفە باسی ئەمەی کردووە کاتێک ووتی: گەر حوکم بکات بە تەوحید و واز بهێنێت لە شیرک، بەڵام لە تەواوی شەرائیعەکانی تردا حوکم نەکات بە قورئان ئەوا کافر نیە، وە ئەگەر حوکم نەکات بە تەوحید و واز هێنان لە شیرک ئەوا کافرە، وە مقاتل بن حيان ووتی: گەر یەهود کار بە هەموو حوکمەکانی الله بکەن ئەوا هەر کافرن چونکە باوەڕیان بە پێغەمبەر نیە، واتا بابەتەکە ژمارە نیە، بابەتەکە تەوحید و شیرکە، گەر حاکمەکە تەوحیدی هەبێت و شیرکی نەبێت ئەوا لە هەموو بابەتەکانی تر کە پەیوەست نین بە تەوحیدەوە حوکمیش نەکات بە شەرع هەر کافر نابێت، وەک ئەو موسڵمانەی کە تەوحیدی هەیە و شیرکی نیە هەرچی تاوان هەیە ئەنجامی بدات کافر نابێت، کە باسی تاوانیش دەکەین مەبەستمان ئەو تاوانانە نیە کە بە شیرک دانراون وەک نوێژ نەکردن، ئەم بەندەش بۆیە باس دەکەم تاکو لەگەڵ ووتەی مورجیئە تێکەڵ نەبێت، وە ئەگەر حاکمەکە تەوحیدی هەبێت و شیرکی نەبێت بەڵام یەک حوکمی کوفری دەربکات ئەوا پێی کافر دەبێت، هەروەک ئەو موسڵمانەی کە تەوحیدی هەیە و بەریە لە شیرک بەڵام بە ئەنجامدانی یەک کوفر کافر دەبێت، لە کۆتاییدا باسی قاعیدەیەک دەکەم کە زانینی ئەم قاعیدەیە تەواوی کێشە و شوبهەکانی ئەم بابەتەت بۆ چارەسەر دەکات، ئەویش ئەمەیە: بیکە بە قاعیدە کە (حوکم نەکردن بە قورئان لە ئەصلدا تاوانە).

ئەمە مانای چیە ؟ واتا: هەروەک چۆن تۆ تاوانێک ئەنجام دەدەیت حوکمت نەکردووە بە قورئان چونکە لە قورئاندا فرمانت پێکراوە تاوان ئەنجام نەدەیت، بە هەمان شێوە حاکمیش کە حوکم ناکات بە قورئان وەک تۆ تاوانبارە، بەڵێ تاوانەکەی ئەو گەورەترە کاتێک بە غەیری شەرع حوکم دەکات لەنێوان خەڵکی بۆیەش بە کوفری بچووک ناوبراوە، بەڵام لە ئەصلدا کاری هەردووکتان حوکم نەکردنە بە قورئان و تاوانە، بۆیە ئەمە لە خەیاڵت ببە دەرەوە کە سەرپێچی تۆ بۆ قورئان جیاواز بێت لە سەرپێچی کردنی حاکم بۆ قورئان، جا کە ئەمەت زانی و دانت پێی دانا ئەوا ئەوکات هەموو بابەتێکی حوکم نەکردن بە قورئان پەیوەست دەکەیتەوە بە تاوانەکانی خۆت، بە چ مەرجێک تۆ بە تاوان کردن کافر دەبیت، حاکمیش کە حوکم ناکات بە قورئان بە هەمان ئەو مەرجانە کافر دەبێت، هەموو ئەو مەرجانەش کە ئەهلی سوننە باسیان کردووە بۆ تەکفیر کردنی حاکم هەمان ئەو مەرجانەن کە بۆ تاوانبار باسی دەکەن، نەک بۆ کەسێک کە کوفری ئەنجام داوە.

جا بە پێی هەموو ئەم ووتانەی هێنامان لەم بەشەدا گەیشتین بەو ئەنجامەی کە تەئصیلی ئەهلی سوننە لە بابەتی حوکم نەکردن بە شەرعی الله بەم جۆرەیە:

**یەکەم:** حوکم کردن بە غەیری شەرعی الله لە ئەصلدا کوفری بچووکە.

**دووەم:** گەر گاڵتە بکات بە حوکمی الله بکات یان سوکایەتی پێ بکات یان بە دواکەوتوویی و توندوتیژی و نەگونجان لەگەڵ سەردەم وەصفی بکات ئەوا دەبێتە کوفری گەورە.

**سێیەم:** گەر حوکمی خۆی لە حوکمی الله بە باشتر بزانێت یان بڵێ هەردووکی وەک یەک باشن، یان ئەوەی منیش باشە و تاوان نیە، واتا حوکم کردن بە غەیری شەرعی الله بە باشتر بزانێت یان بە حەلالی بزانێت ئەوا دەبێتە کوفری گەورە.

**چوارەم:** گەر ئینکاری لە حوکمی الله بکات وەک ئینکاری کردنی یەهود لە حوکمی رەجم و شاردنەوەی ئەوا دەبێتە کوفری گەورە.

**پێنجەم:** گەر حوکمەکەی خۆی بداتە پاڵ الله، وەک یەهود کاتێک ووتیان قامچی لێدان و ڕوو ڕەش کردن لە تەوراتدا هاتووە، کەچی ئەمە حوکمی خۆیان بوو دایانە پاڵ الله، ئەمەش پێی دەووترێ حەلال کردن و حەرام کردن کاتێک حوکمەکانی خۆی دەداتە پاڵ الله، بەناوی دینەوە ئەنجامی دەدات.

**شەشەم:** گەر خودی حوکمەکە کوفری گەورەی تێدا بێت ئەوا پێی کافر دەبێت ئەگەرچی بڵێ حوکمی الله باشترە و حوکمی من خراپە و تاوانە و شایستەی سزام.

**حەوتەم:** هەموو جۆرە تەعزیم کردن و پیرۆز کردنی ئەو یاسایانەی کە پێچەوانەی شەرعن کوفری گەورەن وەک ووتنی یاسا سەروەرە، یاسا لە سەرووی هەموومانەوەیە، یان ناوبردنی ئەو یاسایانەی کە پێچەوانەی شەرعن بە عەدل و حەق و دادپەروەری و یەکسانی.

دەزانم ئێستا دەووترێ بەم ووتانەی هێنات لەم بەشەدا عەقیدەی مەدخەلیت بەهێز کرد و زاڵت کردن بەسەر ماندا، لە سەردەمێکدا کە ئەم هەموو طاغوتە هەیە و شەرعی الله نەک هەر حوکمی پێ ناکرێت بەڵکو بە تاوان دادەنرێت ئەوەی داوای بکات پێی دەڵێن تیرۆرست، کەچی تۆش خەریکی بەم جۆرە لەسەر بابەتەکە دەنوسی، ووتەکانت لەڕووی تەئصیلەوە جیاوازییەکی ئەوتۆی نیە لەگەڵ ووتەی مەدخەلیەکان.

لە وەڵامدا دەڵێم: ڕوونکردنەوەی عەقیدەی ئەهلی سوننە هیچ کاتێک پشتگیری و پشتیوانی نیە بۆ مورجیئە و جەهمی هەروەک چۆن پشتگیری نیە بۆ خەواریج و زیادەڕەوەکان، جا لە بابەتی کوفر و ئیماندا هەر کاتێک کە عەقیدەی ئەهلی سوننە باس دەکرێت ئەوا ڕەددە بۆ خەواریج و مورجیئە بەیەکەوە، خودی ئەم ووتانەی هێنامان کە زۆرینەی ووتەی سەلەف بوو مەحاڵە بین بە پشتگیری و پشتیوانی بۆ مورجیئە، هەروەک چۆن لە بابەتی قەدەر کاتێک سەلەف ڕەددی جەبریەکان دەدەنەوە ووتەکانیان نابێتە پشتگیری بۆ قەدەریەکان، جا لێرەدا ئێوە شایستەی لۆمە کردنن کە نموونەیەکی هێندە ناشرینتان نیشانی خەڵک داوە لەم

بابەتەدا، واتان کردووە مەدخەلیەکان زۆر بە ئاسانی پێمان بڵێن خەواریج، چونکە سەیر دەکەن ووتەکانی خۆیان لەڕووی تەئصیلەوە ووتەی سەلەف و ئەهلی سوننەیە، ووتەی ئەم هەموو زانایەی ئەهلی سوننەت بۆ نەقل دەکەن یەک بە دوای یەک لە هەموو سەردەمەکان دەڵێن حوکم نەکردن بە قورئان کوفری بچووکە نەک گەورە، ئێوەش هەمووی ڕەت دەکەنەوە لەسەر ووتەی چەند کەسێکی سەردەمەکەتان، ئینجا دێن تەئصیلێک دادەڕێژن کە هەمان تەئصیلی خەواریجە، جا ئایا ئێوە شایستەی لۆمە کردنن کە واتان کرد مەدخەلی بە بەڵگە لەڕووی تەئصیلەوە زاڵکەن بەسەرمان بە پشت کردنتان لە مەنهەجی سەلەف، یان من شایستەی لۆمە کردنم کە لەم کتێبەدا بە مەدخەلیەکان دەڵێم: مەنهەجی ئێمە مەنهەجی سەلەفە کە حوکم نەکردن بە قورئان بە مەرج بە کوفری دەزانین، بەڵام وەک ئێوەی جەهمی ئەم ووتانەی سەلەف لەسەر کەسانێک دانابەزێنین کە پڕاوپڕن لە کوفر، یاسا و دەستور و بەرنامەکانیان لەسەر کوفر بنیات نراوە ؟!

جا ئەوانەی لە تەئصیلی ئەم بابەتە لە خەواریج نزیکن دڵیان بەم ووتانە تەنگ دەبێت بەڵام ئەمە مەنهەجی ئەهلی سوننەیە و شەرم لە کەس ناکەین لە ڕوونکردنەوە و بڵاو کردنەوەی، گرنگیش بەوە نادەین کێ قبوڵیەتی و کێ ڕەتی دەکاتەوە، وە هەموو ئەم خاڵانەی کە باسمان کرد لەم حکومەتانەی ئەم سەردەمەدا هەیە و پێی تەکفیر دەکرێن، نەک وابزانن گەر دانمان نا بەم خاڵانە ئەوا ناتوانین ئەم حکومەتانە تەکفیر بکەین.

خاڵی یەکەم ووتمان: لە ئەصلدا کوفری بچووکە، ئەم حکومەتانەی ئەمڕۆ عەلمانی و دیموکراسی و دژە دینن، بەبێ ڕۆچوون لە بابەتی حوکم هەر لە بنەڕەتەوە کافرن جا حوکم نەکردن بە شەرع کوفری گەورە بێت یان بچووک.

خاڵی دووەم کە ووتمان: گەر سوکایەتی و گاڵتە بە شەرعی الله بکات و بە توندوتیژ و نەگونجان لەگەڵ سەردەم وەصفی بکات، ئەوا ئەم خاڵە لە هەموو حکومەتێکدا بوونی هەیە

نەک هەر ئەوەندە بەڵکو ئەوەی داوای شەرعی اللە بکات بە تاوانبار و کۆنە پەرست و تیرۆرستی ناو دەبەن.

خاڵی سێیەم کە ووتمان: گەر حوکمی خۆی لە حوکمی اللە بە باشتر بزانێت یان بڵێ وەک حوکمی اللە باشە، ئەم حکومەتانەی ئەمڕۆ گەورەترین شانازی بە حوکمی خۆیان و دەستورەکانیان دەکەن، دەستور لەلایان لە قورئان پیرۆزترە، ئەوپەڕی شانازی بە دیموکراسی خۆیان دەکەن، نەک حوکمی خۆیان لە حوکمی اللە بە باشتر دەزانن بەڵکو خراپترین و قێزەونترین حوکم بە حوکمی اللە دەزانن، بۆیە لەهەر جێگایەک هەوڵ بدرێ شەرعی اللە جێبەجێ بکرێت هەموو دەوڵەتە ناکۆکەکان یەک دەگرن بۆ لەناو بردنی، بەڵام غەیری شەرعی اللە هەر بەرنامەیەکی تر پەیڕەو بکەیت لە شیوعیەت و سۆشیالیست و لیبڕال و هەموو بەرنامە کوفریە دانراوەکانی تر ئەوا بە ئازادانە دەتوانیت ووڵاتەکەتی پێ بەڕێوە ببەیت، یان حزب دابمەزرێنی لەسەر ئەم بەرنامەیە و بارەگا بکەیتەوە و بەشداری حکومەت و پەرلەمان بکەیت.

خاڵی چوارەم کە ووتمان: ئینکاری حوکمی اللە نەکات، تاکو دەگات بەم حکومەتانە تەنانەت زۆرێک لە مەلا و ئەو خەڵکەی خۆیان داوەتە پاڵ ئیسلام ئینکاری کۆمەڵێک حوکمی ئیسلام دەکەن، وەک: ڕەجم کردن، کەنیزەک بە هەموو حوکمەکانیەوە، بانگ کردنی کافران بۆ ئیسلام و شەڕکردن لەگەڵیان گەر قبوڵیان نەکرد، جیهاد بە هەموو حوکمەکانیەوە، جزیە وەرگرتن، ناو بردنی ئەهلی ئایینەکانی تر جگە لە ئیسلام بە کافر، زۆرەها حوکمی تر کە هەم بە ئاشکرا سوکایەتی پێ دەکەن و بە کۆنە پەرستی و وەحشیگەری ناو دەبەن، وە هەم ئینکاری لێ دەکەن و دەڵێن ئایینی ئیسلام بەرییە لەم کارە قێزەونانە، ئەتەواوی ووڵاتەکانیش کە ئەندامن لە UN هەر حوکمێک لەگەڵ جاڕنامەی مافی مرۆڤی نەتەوە یەکگرتووەکان یەک نەگرێتەوە ئەوا ڕەتی دەکەنەوە و بە دژی مافی مرۆڤی ناو دەبەن ئەگەرچی حوکمی اللە-ش بێت.

خاڵی پێنجەم کە ووتمان: گەر حوکمەکەی خۆی بداتە پاڵ الله، لەم سەردەمەدا هەموو حوکمەکانی خۆیان نادەنە پاڵ الله بڵێن ئەمە حوکمی ئیسلامە، بەڵام هەندێک کوفر هەیە دەیدەنە پاڵ شەرعی الله، وەک پێکەوە ژیانی ئایینەکان و ئازادی بیروباوەڕ و ئایین کە هەمیشە ئەم کوفرە دەدەنە پاڵ شەرعی الله گوایە ئایینی ئیسلام بۆ چەسپاندنی ئەم جۆرە شتانە هاتووە، لەهەر شوێنێک کافرێک خوێنی بڕژێ خێرا دەست دەکەن بە بڵاوکردنەوەی بەیاننامە و ئیدانەی دەکەن و دەڵێن ئایینی ئیسلام لێی بەرییە ئیسلام ئایینی پێکەوە ژیانی ئایینەکان و ئازادی بیروباوەڕە، واتا تەنها واز ناهێنن بە کوفرەکە بەڵکو دەیدەنە پاڵ شەرعی الله.

خاڵی شەشەم کە ووتمان: گەر حوکمەکە کوفری گەورەی تێدا بێت ئەوا پێی کافر دەبێت، کە سەلەف دەڵێن (کفر دون کفر) مەبەستیان ئەوە نیە حوکم بە کوفری گەورەش بکرێت هەر (کفر دون کفر) بێت، واتا حاکم کاتێک حوکم بە کوفری گەورە دەکات یان کوفرێکی گەورە دەکات بە یاسا ئەوا کافرە و خیلافی تێدا نیە، کەچی بەشێک لە مەدخەلیەکان کاتێک یاسایەکی کوفری نیشان دەدەیت لە دەستوری وولاتێک، لە وەڵامدا دەڵێن: حوکم نەکردن بە قورئان (کفر دون کفر)ە !!!

ووتەکەی ئەوان واتای وایە گەر کوفرێکی گەورە کە ئەنجامدەرەکەی پێی کافر دەبێت، بەڵام گەر ئەم کوفرە بکات بە یاسا و جێبەجێی بکات ئەوکات دەبێتە (کفر دون کفر) !!!

کوفری گەورە گەر ئەنجامدەرەکەی پێی کافر بێت ئەوا کە دەکرێت بە یاسا دەبێتە کوفرێکی گەورەتر و ئەوپەڕی دژایەتی کردنی دینە، بۆیە حوکم کردن بە کوفری گەورە مەرجی حەلال کردن و ئینکاری کردنی حوکمی الله و سوکایەتی بە حوکمی الله و هیچ مەرجێکی تری بۆ باس ناکرێت، هەر بە تەنها خۆی بەسە بۆ دەرچوون لە دین، وە دەستوری وولاتانی ئەم سەردەمەش پڕیەتی لە کوفری گەورە، بۆ نموونە: لە دەستوری هەرێمی کوردستان لە ماددەی شەشەم لە خاڵی دووەم هاتووە: (نابێت هیچ یاسایەک دەربچێت پێچەوانەی بنەماکانی

دیموکراسی بێت) !!! دیموکراسیەت کە جۆرەها کوفر لە ژێر باڵیدا کۆبۆتەوە نەک بۆت نیە بڵێی دیموکراسی کوفرە، بەڵکو بۆت نیە هیچ یاسایەک دەر بکەیت کە دژی بنەماکانی دیموکراسی بێت !!!

خاڵی حەوتەم کە ووتمان: تەعزیم کردن و پیرۆز ڕاگرتنی یاساکانیان کە دژی دینە، لەبڕی ئەوەی خۆیان بە تاوانبار بزانن و لۆمەی خۆیان بکەن ئەوا ئەوپەڕی شانازی بە یاسا و دەستورەکانیان دەکەن و بە تاجی سەریانی دەزانن، هەرکەسێکیش قبوڵی نەبێت یان پێشێڵی بکات بە تاوانباری دەزانن، بە جۆرێک ئازادی کافر بیت بە الله، بەڵام بۆت نیە لەم یاسایانە دەربچیت چونکە سەروەرە و لە سەرووی هەموومانەوەیە. سەلەف لە حوکم نەکردن بە قورئان باسی مەرجی دان پێدانان دەکەن، واتا ئەو کەسەی حوکم بە غەیری قورئان دەکات دەبێت دان بەوە بنێت کە تاوانبارە و شایستەی سزایە، وە حوکمەکەی ئەو پوچ و بەتاڵە، حوکمی الله باشترینە، بەڵام ئارەزوو وای لێکردووە حوکم بە قورئان نەکات، کەچی هەموو ووڵاتانی ئەم سەردەمە ناو لەو شوێنە دەنێن (دادگا) کە تێیدا حوکم بە غەیری قورئان دەکرێت و گەڕانەوە بۆ یاسا دانراوەکانی مرۆڤە، کەسێک کە یاساکەی خۆی بە عەدل و حەق ناوبرد، ئیتر کوا دان پێدانان بە تاوانباری و لۆمە کردنی نەفس و بەرز سەیر کردنی حوکمی الله ؟ لە هیچ ووڵاتێک هەیە وەزارەتی داد (عەدل) بوونی نەبێت ؟ سەیری ناوی وەزارەتەکە و کارەکانی بکە کە لەسەر چ بنەمایەک دەڕوات و مەبەست لە عەدل چیە ؟ مەبەست پێی شەرعی الله-یە یان مەبەست پێی یاسا دانراوەکانی خۆیانە ؟ ئەمەش کوفرێکی بەواحە کە لەبڕی هەست کردن بە تاوانباری زۆر بە گەورە سەیری یاساکانیان دەکەن و بە حەق و عەدلی دەزانن.

جگە لەم خاڵانەش چەندە کوفری تر کە ئەگەر بێتو هەمووی باس بکەین ئەوا پێویستیمان بە کتێبێکی ترە، جا کە ئەم هەموو هۆکارە هەبوو بۆ تەکفیر کردنی حکومەتەکان

ئیتر چ پێویست دەکات پشت بکەین لە مەنهەجی سەلەف و ووتەیەک ڕەت بکەینەوە کە تەواوی سەلەف و خەلەف لەسەری کۆک بوونە و کەسیان ڕەتی نەکردۆتەوە ؟! ئایا بەم شێوازە گفتوگۆ لەگەڵ مەدخەلیەکان بکرێ دەمکوت کەرە بۆیان، یان بە شێوازی ئێوە کە ووتەی هەموو سەلەف و خەلەف ڕەت دەکەنەوە، شوێنی تەئصیلاتی خەواریج دەکەون ؟!

# حوکم بردنەوە بۆ جگە لە شەرعی الله

ئەم بابەتە بەرهەمی بابەتی پێشووە، چونکە لە هەر شوێنێکدا کە حوکم بە شەرعی الله نەکرا ئەوا بابەتی حوکم بردنەوە بۆ غەیری شەرعی الله دێتە کایەوە، جا هەروەک چۆن لە بەشی یەکەمدا باسی حوکمی ئەو کەسەمان کرد کە حوکم ناکات بە شەرعی الله لە چ حاڵەتێک کافر دەبێت و لە چ حاڵەتێک کافر نابێت، بە هەمان شێوە لەم بەشەدا باسی حوکمی ئەو کەسە دەکەین کە حوکم دەباتەوە بۆ غەیری شەرعی الله، ئایا لە چ حاڵەتێکدا کافر دەبێت و لە چ حاڵەتێکدا کافر نابێت، تەنانەت ئەم بەشەی کتێبەکە پاڵنەری سەرەکی بوو بۆ نوسینی ئەم کتێبەکە، چونکە زیادەڕەوییەکی یەکجار زۆر کراوە لە بابەتی حوکم بردنەوە بۆ لای یاسا دانراوەکان و هاوشێوەکانی، جا گەر بووترێ ئەمڕۆ هیچووڵاتێک نیە ئەثەری کفر دون کفر بیگرێتەوە، بەڵام لە بابەتی حوکم بردنەوە وانیە هەموو موسڵمانێک توشی ئەم بابەتە دەبێت لە ژیانیدا زۆر تا کەم، بگرە کەسانێک هەن ڕۆژانە حوکم دەبەنەوە بۆ لای یاسا دانراوەکانی خۆیان کەچی هەستیشی پێ ناکەن، کە کاتێکیش قسە لەسەر ئەم بابەتە دەکەن دەڵێن: حوکم بردنەوە بۆ غەیری شەرعی الله کوفرە و پێی کافر دەبیت، ئاوا بە ڕەهایی قسەی تێدا دەکەن، کەچی گەر بێتو لە ژیانی خۆیان وورد بنەوە ئەوا دەزانن ڕۆژانە حوکم دەکەن بە غەیری شەرعی الله و حوکم دەبەنەوە بۆ غەیری شەرعی الله.

هەروەک چۆن لە بەشی یەکەمدا ئایەتەکانی (٤٤ و ٤٥ و ٤٧)ی سورەتی المائدة کرۆکی بابەتەکە بوون، ئەوا لەم بەشەشدا ئایەتەکانی (٦٠ تا ٦٥)ی سورەتی النساء کرۆکی بابەتەکەن، بە تایبەتی هەردوو ئایەتی (٦٠ و ٦٥) کە کراونەتە بەڵگە بۆ تەکفیر کردنی ئەو کەسەی حوکم دەباتەوە بۆ غەیری شەرعی الله بە ڕەهایی بەبێ ڕەچاو کردنی هیچ مەرجێک، هەروەک چۆن لە بەشی یەکەمدا باسمان کرد کە حوکم کردن بە غەیری شەرعی الله بە کوفر دەزانن بە ڕەهایی بەبێ ڕەچاو کردنی هیچ مەرجێک.

قال الله تعالى:

﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُمْ ءَامَنُواْ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ يُرِيدُونَ أَن يَتَحَاكَمُوٓاْ
إِلَى ٱلطَّٰغُوتِ وَقَدْ أُمِرُوٓاْ أَن يَكْفُرُواْ بِهِۦ وَيُرِيدُ ٱلشَّيْطَٰنُ أَن يُضِلَّهُمْ ضَلَٰلًۢا بَعِيدًا﴿٦٠﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ
تَعَالَوْاْ إِلَىٰ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ وَإِلَى ٱلرَّسُولِ رَأَيْتَ ٱلْمُنَٰفِقِينَ يَصُدُّونَ عَنكَ صُدُودًا﴿٦١﴾ فَكَيْفَ إِذَآ أَصَٰبَتْهُم
مُّصِيبَةُۢ بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ ثُمَّ جَآءُوكَ يَحْلِفُونَ بِٱللَّهِ إِنْ أَرَدْنَآ إِلَّآ إِحْسَٰنًا وَتَوْفِيقًا﴿٦٢﴾ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ
يَعْلَمُ ٱللَّهُ مَا فِي قُلُوبِهِمْ فَأَعْرِضْ عَنْهُمْ وَعِظْهُمْ وَقُل لَّهُمْ فِيٓ أَنفُسِهِمْ قَوْلًۢا بَلِيغًا﴿٦٣﴾ وَمَآ أَرْسَلْنَا مِن
رَّسُولٍ إِلَّا لِيُطَاعَ بِإِذْنِ ٱللَّهِۚ وَلَوْ أَنَّهُمْ إِذ ظَّلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمْ جَآءُوكَ فَٱسْتَغْفَرُواْ ٱللَّهَ وَٱسْتَغْفَرَ لَهُمُ ٱلرَّسُولُ
لَوَجَدُواْ ٱللَّهَ تَوَّابًا رَّحِيمًا﴿٦٤﴾ فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُواْ فِيٓ
أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُواْ تَسْلِيمًا﴿٦٥﴾﴾ **[النساء: ٦٠-٦٥]**

## هۆکاری دابەزینی ئایەتەکانی سورەتی النساء:

سێ هۆکار باس دەکرێن لەلایەن زانایانی تەفسیرەوە بۆ دابەزینی ئایەتەکانی (٦٠ تا ٦٥)ی سورەتی النساء:

یەکەم: حوکم بردنەوەی مونافیقێک و یەهودییەک بۆ لای کعب بن الأشرف-ی طاغوت یان بۆ لای أبو بردة الأسلمي کاهین، بووە هۆی دابەزینی ئایەتەکانی (٦٠ تا ٦٥).

دووەم: حوکم بردنەوەی مونافیق و یەهودییەکە بۆ لای پێغەمبەرﷺ، جا مونافیقەکە ڕازی نەبوو بە حوکمی پێغەمبەر، حوکمی بردەوە بۆ لای أبو بکر الصدیق، مونافیقەکە بە حوکمی ئەویش ڕازی نەبوو، حوکمی بردەوە بۆ لای عمر بن الخطاب، ئیمامی عمر بە شمشێر لە ملی مونافیقەکەیدا و کوشتی، جا ئایەتەکانی (٦١ تا ٦٥) بەهۆی ئەم ڕووداوە دابەزی.

سێیەم: حوکم بردنەوەی الزبیر بن العوام و هاوەڵێکی تر بۆ لای پێغەمبەرﷺ جا تانەدانی هاوەڵەکەی تر لە حوکمی پێغەمبەر بووە هۆی دابەزینی ئایەتی (٦٥).

وە دروسترینیان هۆکاری یەکەمە، چونکە ڕیوایەتی زیاتر دەربارەی هاتووە، وە زۆرێک لە زانایانی تەفسیر تەرجیحیان کردووە، وە سیاقی هەر شەش ئایەتەکەش لەگەڵی دەگونجێ بە تایبەتی ئایەتی (٦٠) بە یەکدەنگی زانایان دەربارەی ڕووداوی یەکەم دابەزیوە، بە پێچەوانەی هۆکاری دووەم و سێیەم، کە ئایەتی (٦٠) لەگەڵ ڕووداوی دووەم و سێیەم ناگونجێت چونکە باسی حوکم بردنەوە بۆ لای طاغوتی تێدایە، طاغوتیش بوونی نیە لە ڕووداوی دووەم و سێیەم، تەنها لە ڕووداوی یەکەم بوونی نیە، تەنانەت ڕووداوی سێیەم هیچ ئایەتێک لەگەڵی ناگونجێت تەنها ئایەتی (٦٥) نەبێت، ئەمەش وادەکات ئەم ئایەتە دابڕێت لە ئایەتەکانی پێش خۆی، بە جۆرێک کە ئایەتی (٦٠ تا ٦٤) دەربارەی ڕووداوێک بووە، وە ئایەتی (٦٥) دەربارەی ڕووداوێکی تر بووە، بەڵام سیاقی ئایەتەکان بۆ ئەوە دەچن کە هەر شەش ئایەتەکە دەربارەی ڕووداوی یەکەم دابەزیون، جگە لەمەش الزبیر بن العوام کە خۆی

خاوەنی ڕووداوەکەیە دڵنیا نیە کە ئەم ئایەتە دەربارەی ڕووداوەکەی ئەو دابەزیوە، بەڵکو دەڵێ: پێم وایە دەربارەی ئەم ڕووداوە دابەزی بێت، جا ئەگەر خاوەنی ڕووداوەکە دڵنیا نەبێت و یەکلایی نەکاتەوە ئەوا غەیری ئەو لە پێشترە کە دڵنیا نەبێت و یەکلایی نەکاتەوە.

سەرەڕای هەموو ئەمانەش ئایەتەکان دەربارەی هەر کامێک لەم ڕووداوانە دابەزی بن ئەوا هیچ لە بابەتەکەی ئێمە ناگۆڕێت و هیچ حوکمێکی جیاوازی لەسەر بنیات نانرێ بە جۆرێک کە بووترێ: گەر ڕووداوی یەکەم هۆکاری دابەزین بێت ئەوا حوکم بردنەوە بۆ یاسا دانراوەکان حوکمی ئاوایە، بەڵام گەر ڕووداوی دووەم هۆکاری دابەزین بێت ئەوا حوکمەکەی جۆرێکی تر دەبێت، وە ئەگەر ڕووداوی سێیەم بێت حوکمەکەی جۆرێکی تر دەبێت، هەر کامێک لەمانە بێت حوکمدان لەسەر بابەتە ناگۆڕێت، بەڵام کە زانیمان هۆکاری دروستی دابەزینی ئایەتەکان کامەیە ئەوا زیاتر تیشک دەخەینە سەر ئەو ڕووداوە و قسەی لەسەر دەکەین.

**الطبري** دەڵێ:

حدثني محمد بن سعد قال حدثني أبي قال حدثني عمي قال حدثني أبي عن أبيه عن **ابن عباس:** دەربارەی فەرمایشتی الله: ﴿يُرِيدُونَ أَن يَتَحَاكَمُوٓاْ إِلَى ٱلطَّٰغُوتِ وَقَدۡ أُمِرُوٓاْ أَن يَكۡفُرُواْ بِهِۦ﴾ ووتی: طاغوت: پیاوێک بوو لە یەهود پێی دەووترا: کعب بن الأشرف، گەر بانگ کرابوان بۆ ئەوەی الله دایبەزاندووە و بۆ لای پێغەمبەر تا حوکم بکات لەنێوانیان، دەیانووت: بەڵکو دەتان بەرینەوە بۆ لای کعب ئەو حوکم بکات لەنێوانمان، جا ئەمەیە فەرمایشتی الله: ﴿يُرِيدُونَ أَن يَتَحَاكَمُوٓاْ إِلَى ٱلطَّٰغُوتِ﴾ تا کۆتایی ئایەتەکە.

[تفسير الطبري : 193/7]

**الطبري** دەڵێ:

حدثني محمد بن المثنى قال حدثنا عبدالوهاب قال حدثنا داود عن **عامر:**

دەربارەی ئەم ئایەتە: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُمْ ءَامَنُواْ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ يُرِيدُونَ أَن يَتَحَاكَمُوٓاْ إِلَى ٱلطَّٰغُوتِ﴾ ووتی: لەنێوان پیاوێک لە یەهود و پیاوێک لە مونافیقەکان ناکۆکی هەبوو، مونافیقەکە داوای دەکرد حوکم بەرنەوە بۆ لای یەهود، چونکە دەیزانی ئەوان بەرتیل وەردەگرن، یەهودییەکەش داوای دەکرد حوکم بەرنەوە بۆ لای موسڵمانان، چونکە دەیزانی ئەوان بەرتیل وەرناگرن، جا ڕێککەوتن کە حوکم

ب

ە

ر

[تفسیر الطبري : 189/7]

ووتم: (عامر) عامر الشعبي-ە.
و

**الطبري** دەڵێ:

حدثني ابن المثنى قال حدثنا عبدالأعلى قال حدثنا داود عن **عامر:**

دەربارەی ئەم ئایەتە: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُمْ ءَامَنُواْ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ﴾ نزیک لە ڕیوایەتی پێشووی باسکرد، وە ئەمەی تێدا زیاد کرد: جا اللە ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُمْ ءَامَنُواْ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ﴾ واتا: مونافیقەکە، ﴿وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ﴾ واتا: یەهودییەکە، ﴿يُرِيدُونَ أَن يَتَحَاكَمُوٓاْ إِلَى ٱلطَّٰغُوتِ﴾ واتا: بۆ لای کاهین، ﴿وَقَدْ

ی



ک

أُمِرُوٓاْ أَن يَكۡفُرُواْ بِهِۦۖ﴾ واتا: مونافیقەکە کە خۆی داوەتە پاڵ ئیسلام الله لە قورئان فرمانی پێکردووە کە کافر بێت بە کاهین، یەهودییەکەش الله لە تەورات فرمانی پێکردووە کە کافر بێت بە کاهین.

[تفسير الطبري : 190/7]

**الطبري** دەڵێ:

حدثنا بشر قال حدثنا يزيد قال حدثنا سعيد عن **قتادة:**

دەربارەی فەرمایشتی الله: ﴿أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ يَزۡعُمُونَ أَنَّهُمۡ ءَامَنُواْ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبۡلِكَ يُرِيدُونَ أَن يَتَحَاكَمُوٓاْ إِلَى ٱلطَّٰغُوتِ وَقَدۡ أُمِرُوٓاْ أَن يَكۡفُرُواْ بِهِۦۖ وَيُرِيدُ ٱلشَّيۡطَٰنُ أَن يُضِلَّهُمۡ ضَلَٰلَۢا بَعِيدٗا﴾ [النساء: ٦٠]، ووتی: بۆمان باسکراوە کە ئەم ئایەتە دەربارەی دوو پیاو دابەزی، پیاوێک لە ئەنصار پێی دەووترا: بشر، وە پیاوێک لە یەهود، ناکۆکی هەبوو لەنێوانیان دەربارەی حەقێک، جا کێشە دروست بوو لەنێوانیان چوون بۆ لای کاهینێک لە مەدینە تا حوکم بکات لەنێوانیان، وازیان لە پێغەمبەرﷺ هێنا نەچوون بۆلای تا حوکم بکات لەنێوانیان، جا الله ئەم کارەی عەیبدار کردن، وە بۆمان باسکراوە یەهودییەکە ئەنصارییەکەی بانگ دەکرد بۆلای پێغەمبەر ﷺ تا حوکم بکات لەنێوانیان، دەیزانی پێغەمبەرﷺ زوڵمی لێ ناکات، ئەنصارییەکە ڕازی نەبوو بچێت بۆ لای پێغەمبەر، خۆی بە موسڵمان دەزانی و یەهودییەکەی بانگ دەکرد بۆلای کاهین، جا الله ئەم ئایەتەی دابەزاند کە دەیبیستن، عەیبداری ئەو کەسەی کرد کە پێی وابوو موسڵمانە، وە عەیبداری یەهودییەکەی کرد کە لە ئەهلی کیتاب بوو، فەرمووی: ﴿أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ يَزۡعُمُونَ أَنَّهُمۡ ءَامَنُواْ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبۡلِكَ

يُرِيدُونَ أَن يَتَحَاكَمُوٓاْ إِلَى ٱلطَّٰغُوتِ وَقَدۡ أُمِرُوٓاْ أَن يَكۡفُرُواْ بِهِۦۖ وَيُرِيدُ ٱلشَّيۡطَٰنُ أَن يُضِلَّهُمۡ ضَلَٰلَۢا بَعِيدٗا﴾.

[تفسير الطبري : 191/7]

ووتم: ئەگەرچی لە هەندێک ڕیوایەت بە موسڵمان یان ئەنصاری ناوی مونافیقەکە دەبرێت بەڵام ئەمە خیلاف دروست ناکات کە مونافیق بووە، چونکە مونافیق لە ڕووکەشدا خۆی بە موسڵمان نیشان دەدات بۆیە دەووترێ موسڵمان، وە مونافیقەکان خەڵکی مەدینە بوون بۆیە پێیان دەووترێ ئەنصاری، دەدرێنە پاڵ موسڵمانەکانی خەڵکی مەدینە.

## ابن أبي حاتم دەڵێ:

حدثنا محمد بن عوف الحمصي حدثنا أبو اليمان حدثنا صفوان -يعني ابن عمرو- عن عكرمة عن **ابن عباس ووتی:** أبو بردة الأسلمي کاهین بوو حوکمی دەکرد لەنێوان یەهودییەکان، جا هەندێک لەو یەهودییانەی کە موسڵمان ببوون چوون بۆ لای أبو بردة، جا الله تعالى ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ يَزۡعُمُونَ أَنَّهُمۡ ءَامَنُواْ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبۡلِكَ﴾ [النساء: ٦٠].

[تفسير ابن أبي حاتم : 331/4-332]

## آدم بن أبي إياس دەڵێ:

حدثنا ورقاء عن ابن أبي نجيح عن **مجاهد ووتی:**

پیاوێک لە مونافیقەکان و پیاوێک لە یەهود ناکۆکیان هەبوو، یەهودیەکە ووتی: با بچین بۆ لای محمد، مونافیقەکە ووتی: با بچین بۆ لای كعب بن الأشرف، جا الله

ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿يُرِيدُونَ أَن يَتَحَاكَمُوٓاْ إِلَى ٱلطَّٰغُوتِ﴾ **[النساء: ٦٠]**، طاغوت: **كعب** بن الأشرف-ە.

**[تفسير مجاهد : لاپەرە 285]**

## ابن أبي حاتم دەڵێ:

حدثنا أحمد بن عثمان بن حكيم الأودي حدثنا أحمد بن مفضل حدثنا أسباط عن **السدي:**
دەربارەی ئایەتی: ﴿وَقَدۡ أُمِرُوٓاْ أَن يَكۡفُرُواْ بِهِۦۖ﴾ **[النساء: ٦٠]**، **ووتی:**
ئەویش أبو بردة الأسلمي كاهینە.

**[تفسير ابن أبي حاتم : 335/4]**

ووتم: واتا فرمانیان پێکراوە کافر بن بە طاغوت، مەبەستیش لە طاغوتەکە لەم ئایەتەدا أبو بردة الأسلمي-ە.

ئەمە هۆکاری یەکەمی دابەزینی ئایەتەکانە، کە مونافیقەکە حوکمی بردەوە بۆ لای طاغوت لە کاتێکدا یەهودییەکە بانگی دەکرد بۆ لای پێغەمبەرﷺ، بەڵام سەلەف خیلافیان لەوەدا هەیە کە ئەم طاغوتەی ناو ئایەتەکە مەبەست پێی کعب بن الأشرف-ە یان أبو بردة الأسلمي، ئەمەش هیچ کاریگەری ناکاتە سەر بابەتەکەی ئێمە.

## عبد بن حميد دەڵێ:

عن عبدالرزاق عن معمر عن الزهري عن عروة ووتی:
الزبیر ناکۆکی هەبوو لەگەڵ پیاوێک لە ئەنصار دەربارەی جۆگەلە ئاوێک لە (الحرة)، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: زبیر باخەکەت ئاو بدە پاشان ئاوەکە بنێرە بۆ دراوسێکەت،

ئەنصاریەکە ووتی: ئەی پێغەمبەری الله چونکە الزبیر کوڕی پورتە ! جا ڕەنگی ڕووخساری پێغەمبەری الله ﷺ گۆڕا، پاشان فەرمووی: زبیر باخەکەت ئاو بدە، پاشان ئاوەکە گلدەرەوە تا دەگەڕێتەوە بۆ الجدر، پاشان بینێرە بۆ دراوسێکەت.

عروة دەڵێ: پێغەمبەری الله ﷺ لەو کاتەدا هەموو حەقەکەی بۆ الزبیر وەرگرتەوە لە حوکمێکی ڕاشکاودا ئەو کاتەی ئەنصاریەکە توڕەی کرد، پێش ئەمە ڕێگایەکی تری لەبەردەم دانان کە بۆ هەردووکیان فراوان بوو.

الزبیر دەڵێ: پێم وانیە ئەم ئایەتە دابەزی بێت تەنها دەربارەی ئەم ڕووداوە نەبێت، ﴿فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤۡمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيۡنَهُمۡ ثُمَّ لَا يَجِدُواْ فِيٓ أَنفُسِهِمۡ حَرَجٗا مِّمَّا قَضَيۡتَ وَيُسَلِّمُواْ تَسۡلِيمٗا﴾ **[النساء: ٦٥].**

معمر دەڵێ: بیستم لە کەسێکی تر جگە لە الزهري دەیووت: سەیری ووتەکەی پێغەمبەر ﷺ کرد (پاشان ئاوەکە گلدەرەوە تا دەگەڕێتەوە بۆ الجدر) گلدانەوەی ئاوەکە تا قاپە ڕەقە بوو.

**[تفسیر عبد بن حمید : ژمارە 339]**

ووتم: (الجدر) لەلای زانایان خیلاف هەیە کە مانای چیە، بەڵام دەڵێن بڕەکەی ئەوەندەیە کە بگات بە قاپە ڕەقە.

تەفسیری عبد بن حمید تا ئێستا بەردەست نیە وەکو دەستنوس تا تەحقیق و چاپ بکرێ، بەڵام لە یەکێک لە دەستنوسەکانی تەفسیری ابن أبي حاتم لە سورەتی آل عمران و النساء لە حاشیەدا تەفسیری عبد بن حمید نوسراوە، محقق-یش ئەوەی لە حاشیەی ئەم دوو سورەتەدا هەیە کۆی کردۆتەوە لە کتێبێکی بچکۆلەدا، بۆیە لە سورەتی المائدة تەفسیری

عبد بن حميد-مان لە (الدر المنثور)ی السيوطي نەقل کرد کە بەشێکی زۆری تەفسیرە وونبوەکانی سەلەفی لەم کتێبەدا کۆکردۆتەوە.

ئەم ڕووداوەی الزبیر هۆکاری دووەمی دابەزینی ئایەتی (٦٥)ە بە تەنها، وە البخاري-ش ئەم ڕیوایەتەی هێناوە لە صەحیحەکەیدا، جا ڕەنگە بڵێن گەر البخاري لە صەحیحەکەی ئەمەی هێناوە ئەی چۆن ڕووداوی یەکەم تەرجیح دەکرێ بەسەر ئەم ڕووداوە ؟

پێشتر باسمان کرد الزبیر-یش دڵنیا نیە دەربارەی ئەم ڕووداوە دابەزیوە یان نا، بۆیە یەکلایی ناکاتەوە، کە البخاري هێناویەتی لە صەحیحەکەی واتا صەحیحە، بەڵام مەرج نیە خاوەنی ووتەکە پێکابێتی، بۆ نموونە: البخاري فەتوایەکی الحسن البصري ڕیوایەت دەکات بە سەنەدێکی صەحیح، دەڵێین: صەحیحە، بەڵام مەرج نیە الحسن لەم فەتوایەدا پێکابێتی.

هەر چەندە دابەزاندنی ئایەتی (٦٥) بەسەر ڕووداوەکەی الزبیر ئەستەم نیە دەکرێ ئەویش بگرێتەوە بەڵام لەگەڵ ڕووداوی یەکەم زیاتر دەگونجێ.

**الطبري** (دەربارەی هۆکاری دابەزینی ئایەتەکە) دەڵێ:

ئەم ووتەیە، مەبەستم ووتەی ئەو کەسەیە کە دەڵێ: ئایەتەکە دەربارەی ئەو دوو کەسە دابەزین کە حوکمیان بردەوە بۆ لای طاغوت، ئەو دوو کەسەی کە الله حاڵی وەصف کردن لە ئایەتی: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُمْ ءَامَنُوا۟ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ﴾ لە پێشترە کە صەواب بێت، چونکە فەرمایشتی الله: ﴿فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ﴾ لە سیاقی چیرۆکی ئەم دوو کەسە دایە کە الله سەرەتا هەواڵیدا بە چیرۆکی ئەوان بە فەرمایشتی: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُمْ ءَامَنُوا۟ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ﴾ هیچ بەڵگەیەک نیە لەسەر پچڕانی چیرۆکەکەیان، جا بەیەک گەیاندنی ئەم ئایەتانە بەیەکتر دەربارەی چیرۆکەکە لە پێشترە، مادام هیچ بەڵگەیەک نەهاتبێ

لەسەر پچڕانی چیڕۆکەکە، ... (پاشان دەڵێ) مەحاڵ نیە ئایەتەکە دابەزی بێت دەربارەی ئەو دوو کەسەی کە حوکمیان بردەوە بۆ لای طاغوت، وە لە ئایەتەکە ڕوونکردنەوەی حوکمی ناکۆکیەکەی نێوان الزبیر و هاوڕێیە ئەنصاریەکەشی تێدا بێت.

بڕوانە [تفسير الطبري : 7/204-205]

**ابن دحیم** دەڵێ:

حدثنا شعيب بن شعيب حدثنا أبو المغيرة حدثنا عتبة بن ضمرة حدثني أبي ووتی:

دوو پیاو ناکۆکیان بردەوە بۆ لای پێغەمبەر ﷺ، پێغەمبەریش حوکمی بۆ ئەوەیاندا کە لەسەر حەق بوو دژی ئەوەیان کە ناحەق بوو، جا ئەوەی کە حوکمی لە دژ درا **ووتی: ڕازی نابم**، هاوەڵەکەی ووتی: چیت دەوێ ؟ ووتی: دەمەوێ بچین بۆ لای أبو بکر الصدیق، جا چوونە لای، ئەوەیان کە حوکمەکە لە بەرژەوەندی ئەو درا بوو ووتی: چووین بۆ لای پێغەمبەر ﷺ حوکمیدا لە بەرژەوەندی من، أبو بکر ووتی: ئێوە لەسەر ئەو حوکمەن کە پێغەمبەر ﷺ داویەتی، **هاوەڵەکەی ڕازی نەبوو**، ووتی: دەچین بۆ لای عمر بن الخطاب، جا چوونە لای، ئەوەیان کە حوکمەکە لە بەرژەوەندی ئەو درا بوو ووتی: ناکۆکیمان بردەوە بۆ لای پێغەمبەر ﷺ، پێغەمبەریش حوکمی لە بەرژەوەندی مندا، **ئەویش ڕازی نەبوو بە حوکمی پێغەمبەر**، پاشان چووین بۆ لای أبو بکر، ووتی: ئێوە لەسەر ئەو حوکمەن کە پێغەمبەر ﷺ داویەتی، **جا ڕازی نەبوو**، عمر پرسیاری لێکرد دەربارەی ئەم ڕووداوە، ئەویش ووتی: ڕووداوەکە ئاوایە، جا عمر چووەماڵەوە و هاتە دەرەوە شمشێری لە دەست بوو هەڵیکێشا بوو، لە ملی ئەوەیانی دا کە ڕازی نەبوو جا کوشتی، ئینجا اللّٰه ئەم ئایەتەی دابەزاند:

﴿فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ﴾ تا کۆتایی ئایەتەکە **[النساء: ٦٥]**.

**[ابن كثير نەقلی كردووە لە تەفسیرەكەی : 2/351-352]**

ووتم: ئەمەش هۆكاری سێیەمی دابەزینی ئایەتی (٦٥)ە، ئەگەرچی هەندێک زانای تەفسیر ئایەتی (٦٢) بە هەمان شێوە پەیوەست دەكەنەوە بەم ڕووداوە، بەڵام ئایەتەكانی تر لەگەڵ ئەم ڕووداوە یەک ناگرێتەوە، وە ئەم ڕووداوە لە ڕووی حوكمەوە دژ بەیەک نیە لەگەڵ ڕووداوی یەكەم، چونكە لەم ڕووداوە مونافیقەكە دەڵێ ڕازی نیم بە حوكمی پێغەمبەر ﷺ، هەر كەسێكیش ئەمە بڵێ ئەوا كافرە و خوێنی حەلالە بۆیە ئیمامی عمر كوشتی.
سەرەڕای ئەمەش ئەم ڕووداوە لە سێ ڕێگاوە ڕیوایەت كراوە كە هەر سێكیان كێشەدارن لە ڕووی سەنەدەوە، یەكێكیان لە ابن عباس ڕیوایەت كراوە لە ڕێگای الكلبي كە درۆزنە، وە یەكێكی تریان لە ڕێگای ابن لهيعة عن أبي الأسود هاتووە بەڵام چوون بۆ لای أبو بكر-ی تێدایە لەلای پێغەمبەر ﷺ ڕاستەوخۆ دەچن بۆ لای عمر، كێشەی ئەم سەنەدەش ابن لهيعة-یە كە زەعیفە هەروەها أبي الأسود بەم ڕووداوە نەگەیشتووە بۆیە مرسل-ە، وە ڕێگای سێیەمیان ئەمەیە كە ابن دحيم لە تەفسیرەكەی ڕیوایەتی كردووە كە ابن كثير لێی نەقل كردووە كە ئەمەیان پاكترین سەنەدە بە بەراورد لەگەڵ دوو سەنەدەكەی تر، هیچ ڕاوییەكی زەعیفی تێدا نیە، بەڵام ئەمەشیان مرسل-ە، ضمرة بن حبيب بەم ڕووداوە نەگەیشتووە، بەڵام ئەوەی زیاتر كێشەیە سەنەد نیە چونكە لە تەفسیردا چاوپۆشی لەم جۆرە سەنەدانە دەكرێ گەر شتی مونكەری تێدا نەبێت و پێچەوانەی ڕیوایەتی صەحیحتر و ناودارتر نەبێت، ئەوەی كێشەیە ئەم ڕووداوە هەم پێچەوانەی ڕیوایەتی ترە كە صەحیحتر و ناودارترە، وە هەم لەگەڵ سیاقی ئایەتەكان یەک ناگرێتەوە، كەواتە ڕووداوەكە بەم جۆرەیە: مونافیقێک و یەهودییەک دەبێتە ناكۆكیان، یەهودییەكە دەڵێ: با حوكم ببەینەوە بۆ لای پێغەمبەر، مونافیقەكەش دەڵێ: نەخێر، با حوكم ببەینەوە بۆ لای فلان طاغوت.

# تەفسیری ئایەتەکانی سورەتی النساء:

**الطبري** لە تەفسیری ئایەتی: ﴿أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ يَزۡعُمُونَ أَنَّهُمۡ ءَامَنُواْ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبۡلِكَ يُرِيدُونَ أَن يَتَحَاكَمُوٓاْ إِلَى ٱلطَّٰغُوتِ وَقَدۡ أُمِرُوٓاْ أَن يَكۡفُرُواْ بِهِۦۖ وَيُرِيدُ ٱلشَّيۡطَٰنُ أَن يُضِلَّهُمۡ ضَلَٰلَۢا بَعِيدٗا﴾ دەڵێ:

الله جل ثناؤە دەفەرمووێ: ئەی محمد بە چاوی دڵت نەتدیوە تا بزانی ئەوانەی کە پێیان وایە باوەڕیان هێناوە بەو کتێبەی کە بۆ تۆ دابەزیوە، وە ئەوانەی کە پێیان وایە باوەڕیان هێناوە بەو کتێبانەی کە پێش هاتنی تۆ دابەزیون، دەیانەوێ لە ناکۆکیەکانیان حوکم بەرنەوە بۆ لای ﴿ٱلطَّٰغُوتِ﴾ **واتا: بۆ لای ئەو کەسەی کە بە گەورەی دەزانن و بە پێی ووتەکانی ئەو مامەڵە دەکەن و ڕازین بە حوکمی ئەو لەبڕی حوکمی الله،** ﴿وَقَدۡ أُمِرُوٓاْ أَن يَكۡفُرُواْ بِهِۦۖ﴾ **الله دەفەرمووێ: فرمانیان پێکراوە کە ئەو شتە بە درۆ بزانن کە ئەو طاغوتەی حوکم دەبەنەوە بۆ لای هێناویەتی بۆیان، جا فرمانی الله-یان واز لێهێنا و شوێنی فرمانی شەیتان کەوتن،** ﴿وَيُرِيدُ ٱلشَّيۡطَٰنُ أَن يُضِلَّهُمۡ ضَلَٰلَۢا بَعِيدٗا﴾ واتا: شەیتان دەیەوێ ئەوانەی حوکم دەبەنەوە بۆ لای طاغوت لایەن بەرێت لەسەر ڕێگای حەق و هیدایەت، ئەم ڕێگایەیان لێ وون بکات وون کردنێکی دوور، جا شەیتان لەم ڕێگایە لایان دەدات لادانێکی زۆر.

وە باسکراوە کە ئەم ئایەتە دابەزی دەربارەی پیاوێک لە مونافیقەکان کە بانگی پیاوێکی کرد لە یەهود ناکۆکی لەنێوانیان هەبوو تا بچن بۆ لای هەندێک لە کاهینەکان بۆ ئەوەی حوکم بکات لەنێوانیان، لە کاتێکدا پێغەمبەری الله ﷺ لەناویاندا بوو.

[تفسير الطبري : 7/188-189]

ووتم: ئەمە حەقیقەتی ناخی مونافیقەکانە کە بە تەعزیم کردنەوە حوکم دەبەنەوە بۆ لای طاغوت نەک بە ناچاری حوکمی بۆ ببەنەوە و بەری بن لێی، بەڵکو بەپێی ووتەکانی طاغوتەکە مامەڵە دەکەن و لە ووتەکانی لا نادەن، ڕازین بە حوکمی ئەو لەبری حوکمی الله، جا هەر کەسێک ئەمە حاڵی بێت ئەوا گومان نیە لە کافر بوونی، بەڵام مونافیقەکان وەک هەمیشە ئەو نیفاقەی لە ناخیاندا هەیە دەیشارنەوە، بە ڕووکەش شتێکی تر نیشان دەدەن.

**الطبري** دەڵێ:

﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمۡ تَعَالَوۡاْ إِلَىٰ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ وَإِلَى ٱلرَّسُولِ رَأَيۡتَ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ يَصُدُّونَ عَنكَ صُدُودٗا﴾ [النساء: ٦١]، الله جل ثناؤە دەفەرمووێ: ئەی محمد بە چاوی دڵت نەتدیوە تا بزانی ئەوانەی کە پێیان وایە باوەڕیان هێناوە بەو کتێبەی کە بۆ تۆ دابەزیوە لە مونافیقەکان، وە ئەوانەی کە پێیان وایە باوەڕیان هێناوە بەو کتێبانەی کە پێش هاتنی تۆ دابەزیون لە ئەهلی کیتاب، دەیانەوێ حوکم بەرنەوە بۆ لای طاغوت، ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمۡ تَعَالَوۡاْ إِلَىٰ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ وَإِلَى ٱلرَّسُولِ﴾ واتا: گەر پێیان بووترێ وەرن بۆلای حوکمی الله کە لە کتێبەکەی دایبەزاندووە، وە بۆ لای پێغەمبەر تا حوکم بکات لەنێوانمان، ﴿رَأَيۡتَ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ يَصُدُّونَ عَنكَ﴾ واتا: مونافیقەکان ئامادە نین بێن بۆ لات تا حوکم بکەیت لەنێوانیان، وە هەروەها ڕێگری دەکەن لە کەسانی تریش کە بێن بۆ لات ﴿صُدُودٗا﴾.

**[تفسير الطبري : 7/195-196]**

**ابن أبي حاتم** دەڵێ:

أخبرنا محمد بن سعد العوفي -فيما كتب إلي- حدثنا أبي حدثنا عمي الحسين حدثني أبي عن أبيه عن **ابن عباس:** دەربارەی ئایەتی: ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمۡ تَعَالَوۡاْ إِلَىٰ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ وَإِلَى ٱلرَّسُولِ رَأَيۡتَ

ٱلْمُنَٰفِقِينَ يَصُدُّونَ عَنكَ صُدُودًا﴾ [النساء: ٦١]، **ووتی:**

گەر بانگ کرابوان بۆ ئەو حوکمەی کە الله دایبەزاندووە، وە بۆ لای پێغەمبەر تاکو حوکم بکات لەنێوانیان، دەیانووت: نەخێر، بەڵکو حوکم دەبەینەوە بۆ لای کعب بن الأشرف، ئەمەیە فەرمایشتی الله ﷻ: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُمْ ءَامَنُوا۟ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ يُرِيدُونَ أَن يَتَحَاكَمُوٓا۟ إِلَى ٱلطَّٰغُوتِ وَقَدْ أُمِرُوٓا۟ أَن يَكْفُرُوا۟ بِهِۦ وَيُرِيدُ ٱلشَّيْطَٰنُ أَن يُضِلَّهُمْ ضَلَٰلًۢا بَعِيدًا﴾ [المائدة: ٦٠].

**[تفسير ابن أبي حاتم : 336/4]**

## يحيى بن سلام دەڵێ:

﴿وَإِذَا دُعُوٓا۟ إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ إِذَا فَرِيقٌ مِّنْهُم مُّعْرِضُونَ﴾ [النور: ٤٨]

پشت هەڵدەکەن لە الله و پێغەمبەرەکەی و کتێبەکەی، واتا مونافیقەکان، ئیمان دەردەخەن و شیرک دەشارنەوە.

**[تفسير يحيى بن سلام : 456/1]**

## ابن کثیر دەڵێ:

فەرمایشتی الله: ﴿وَإِذَا دُعُوٓا۟ إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ إِذَا فَرِيقٌ مِّنْهُم مُّعْرِضُونَ﴾ واتا: گەر داوایان لێبکرێ شوێنی هیدایەت بکەون لەوەی کە الله دایبەزاندووە بەسەر پێغەمبەرەکەی، ئەوا پشتی لێدەکەن و تەکەبور لێدەدەن لە ناخیاندا لەوەی کە شوێنی بکەون، ئەم ئایەتەش وەک فەرمایشتی الله-یە: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُمْ ءَامَنُوا۟ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ يُرِيدُونَ أَن يَتَحَاكَمُوٓا۟ إِلَى ٱلطَّٰغُوتِ وَقَدْ أُمِرُوٓا۟ أَن يَكْفُرُوا۟ بِهِۦ وَيُرِيدُ ٱلشَّيْطَٰنُ أَن يُضِلَّهُمْ ضَلَٰلًۢا بَعِيدًا﴾ ، ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْا۟ إِلَىٰ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ وَإِلَى ٱلرَّسُولِ

رَأَيْتَ ٱلْمُنَٰفِقِينَ يَصُدُّونَ عَنكَ صُدُودًا﴾ **[النساء: ٦٠-٦١].**

**[تفسير ابن كثير : 74/6]**

ئەمەی باسکرا ئاشکرا کردنی حاڵیان بوو لە پەنهان، ئێستاش دێینە سەر باسکردنی حوکمی ڕووکەشیان، وەک زانراوە مونافیق دوو حوکمی هەیە، حوکمی دونیایی کە بە ڕووکەش بە موسڵمان دادەنرێت تا ئەو کاتەی کوفری لێ بەدەر دەکەوێت، حوکمی پەنهانیش کە تەنها الله دەیزانێت کە لە قیامەتدا سزاکەی وەردەگرێت بە چوونە ژێرەوەی ئاگری دۆزەخ، جا الله تعالی لەم ئایەتانەی پێشوودا حاڵی ناخیانی باسکرد کە بە چ مەبەستێک حوکمیان بردەوە بۆ لای طاغوت و نەچوون بۆ لای پێغەمبەر ﷺ حوکم بکات لەنێوانیان، جا با بزانین دوای ئەنجامدانی ئەم حوکم بردنەوەیان بۆ لای طاغوت چ حوکمێکی دونیایی بەسەر ئەم مونافیقە و هاوشێوەکانی درا.

**يحيى بن سلام** دەڵێ:

﴿فَكَيْفَ إِذَآ أَصَٰبَتْهُم مُّصِيبَةٌۢ﴾ **[النساء: ٦٢]**

**الحسن دەڵێ:** ﴿إِذَآ أَصَٰبَتْهُم﴾ واتا: **گەر ئەو کوفرە دەربخەن کە لە ناخیان دایە ئەوا پێغەمبەری الله دەیانکوژێت.**

**[مختصر تفسير يحيى بن سلام لابن أبي زمنين : 383/1]**

**يحيى بن سلام** دەڵێ:

﴿أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ يَعْلَمُ ٱللَّهُ مَا فِي قُلُوبِهِمْ﴾ الله دەزانێ چی لە دڵیان دا هەیە لە شیرک و نیفاق، ﴿فَأَعْرِضْ عَنْهُمْ﴾ **مەیانکوژە لەبەر ئەو ئیمانە ڕووکەشەی کە دەری دەخەن،** ﴿وَعِظْهُمْ وَقُل لَّهُمْ فِيٓ أَنفُسِهِمْ قَوْلَۢا بَلِيغًا﴾ **[النساء:٦٣]**، پێیان دەفەرمووێ: **ئەگەر**

**ئەو نیفاقە دەربخەن کە لە دڵتان دایە دەتانکوژم.**

**[مختصر تفسير يحيى بن سلام لابن أبي زمنين : 1/383-384]**

ووتم: بڕوانە لە دەوڵەتێکی ئیسلامی کە پێغەمبەر ﷺ لە ژیاندایە و دابەزینی قورئان بەردەوامە، کەچی کابرای مونافیق ئامادە نیە حوکم بۆ پێغەمبەر بەرێتەوە بەڵکو حوکم دەباتەوە بۆ لای طاغوتێک، لەگەڵ ئەمەشدا الله تعالی بە پێغەمبەرەکەی دەفەرمووێ: مەیانکوژە بەهۆی ئەو ئیمانە ڕووکەشەی کە دەری دەبڕن، پێیان بڵێ گەر کوفرتان لێ دەرکەوێ ئەوا دەتانکوژم.

دەزانی ئەمە مانای چیە ؟ واتا مونافیقەکان بەم حوکم بردنەوەیان بۆ لای طاغوت تەکفیر نەکران، بەڵکو ئیسلامە ڕووکەشەکەیان هەر قبوڵ کرا، هەڕەشەیان لێکرا گەر بێتو کوفریان لێ دەرکەوێ ئەوا دەکوژرێن، واتا هێشتا کوفریان لێ دەرنەکەوتووە، ئەم حوکم بردنەوەیان بۆ لای طاغوت بەس نەبوو بۆ تەکفیر کردنیان و کوشتنیان، مەرجی خۆی هەیە تاکو بەهۆیەوە کافر بن و بکوژرێن نەک بە ڕەهایی بەهۆیەوە کافر ببن، تۆی زیادەڕەویش لەم داری کوفرەدا دینت لە موسڵمان تەنگ کردووە کە هیچ دادگایەکی شەرعی لێ نیە هەندێک جار ناچارە بۆ وەرگرتنەوەی حەقەکەی حوکم بەرێتەوە بۆ یاسا دانراوەکان لە کاتێکدا لێی بەرییە و بە کوفری دەزانێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا تۆی زیادەڕەو تەنها بەم حوکم بردنەوەیە تەکفیری دەکەیت، کەچی کابرای مونافیق پێغەمبەر ﷺ لە ژیاندا بوو نەچوو بۆ لای، چوو بۆ لای طاغوت، الله هەواڵیشی پێداین دەربارەی ناخی کە پڕیەتی لە کوفر و نیفاق و تەعزیم کردنی طاغوت و ڕق لێبوونەوە لە شەرعی الله و پێغەمبەرەکەی، بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا تەکفیر نەکرا و نەکوژرا، پێی ووترا گەر کوفر دەربخەی دەکوژرێیت، واتا هێشتا کوفری دەرنەخستووە چونکە حوکم بردنەوە بۆ لای طاغوت بە ڕەهایی کوفر نیە مەرجی خۆی هەیە بۆ تەکفیر کردن.

**الزجاج** دەڵێ:

فەرمایشتی الله جل وعز: ﴿فَأَعۡرِضۡ عَنۡهُمۡ وَعِظۡهُمۡ وَقُل لَّهُمۡ فِيٓ أَنفُسِهِمۡ قَوۡلَۢا بَلِيغٗا﴾ واتا: پێیان ڕابگەیەنە **گەر ڕەتکردنەوەی حوکمی تۆ و کوفریان لێ دەرکەوێ، ئەوا کوشتن حەقیانە.**

**[معاني القرآن وإعرابه : 70/2]**

**القاسمي** دەربارەی ئایەتی: ﴿وَقُل لَّهُمۡ فِيٓ أَنفُسِهِمۡ قَوۡلَۢا بَلِيغٗا﴾ دەڵێ:

بریتیە لە هەڕەشە کردن و بەڵێندان بە کوشتنیان و بنبڕ کردنیان **گەر نیفاقیان لێ دەرکەوێ و قۆچی نیفاق دەرکەوێ**، وە پێی ڕاگەیاندن کە ئەو پیسی و نیفاقەی کە لە ناخیاندا هەیە زانراوە لەلای الله، وە جیاوازی نیە لەنێوان ئێوە و موشریکاندا، **وە ئەم نەکوشتنە تەنها پاداشتی ئەوەیە کە ئیمان بە ڕووکەش نیشان دەدەن و کوفر دەشارنەوە، جا گەر شتێک بکەن کە پەردە لەسەرتان لابەرێت ئەوا هیچ شتێک نامێنێتەوە جگە لە شمشێر،**

**[محاسن التأويل : لاپەرە 1358]**

**المراغي** دەڵێ:

﴿وَقُل لَّهُمۡ فِيٓ أَنفُسِهِمۡ قَوۡلَۢا بَلِيغٗا﴾ القول البليغ: کاریگەرە لەسەر ناخ، خەمی پێ دەخۆن و بەهۆیەوە هەست بە ترس دەکەن لەوەی کە هەڕەشەیان لێ بکات بە کوشتن و بنبڕ کردن **گەر نیفاقیان لێ دەرکەوێ**، وە پێیان ڕابگەیەنێ ئەوەی لە ناخیاندا هەیە لە شەڕ و نیفاقی شاراوە لە الله-ی العليم شاراوە نیە کە زانایە بە نهێنی و ووتەی شاراوە، وە جیاوازی نیە لەنێوان ئەوان و کافراندا، **بەڵام شمشێر لەسەریان هەڵگیراوە**

**لەبەر ئەوەی ئیمان دەردەخەن و کوفر دەشارنەوە، جا گەر کارێک بکەن پەردەیان لەسەر لابەرێت ئەوا هیچ نامێنێتەوە جگە لە شمشێر.**

**[تفسير المراغي : 78/5]**

## مكي بن أبي طالب دەڵێ:

فەرمایشتی الله: ﴿فَأَعۡرِضۡ عَنۡهُمۡ وَعِظۡهُمۡ﴾ ابن عباس دەڵێ: نەسخ بۆتەوە بە ئایەتی شمشێر لە سورەتی براءة، **وە زۆرینەی زانایان لەسەر ئەوەن کە نەسخ نەبۆتەوە**، چونکە ئاماژە دان بە فرمان کردن بە شمشێر لە ئایەتەکەدا هەیە گەر ووتەکانی پێغەمبەر ﷺ قبوڵ نەکەن، ئەمەش بریتیە لە فەرمایشتی الله: ﴿وَقُل لَّهُمۡ فِيٓ أَنفُسِهِمۡ قَوۡلَۢا بَلِيغٗا﴾ واتا: گەر ووتەکانی تۆیان قبوڵ نەکرد ئەوا شمشێر بەکاردێت بۆیان، وە شمشێر پەیوەستە بە پشت هەڵکردنیان بۆیە پێویست بە نەسخ ناکات بە شمشێرێکی تر.

**[الإيضاح لناسخ القرآن ومنسوخه : لاپەرە 251-252]**

ووتم: نازانم ابن عباس لەکوێ وتوویەتی ئەم ئایەتە نەسخ بۆتەوە بە ئایەتی شمشێر، کە مەبەستی ئایەتی (٥)ی سورەتی التوبة-یە، بەپێی گەڕانم لە تەفسیرەکانی سەلەف شتێکی ئاوام بەرچاو نەکەوت، تەنانەت لە (موسوعة التفسير المأثور) کە کۆکراوەی تەفسیری سەلەفە، لە هەموو ئایەتێکدا بەشێکیان تایبەت کردووە بە نەسخ، هەر زانایەک باسی نەسخی کردبێ دەربارەی ئایەتەکە، نەقلی دەکەن و دەڵێن ئەم زانایە وتوویەتی ئەم ئایەتە نەسخ بۆتەوە، جا ووتەی زاناکە صەواب بێ یان هەڵە بێ هەر نەقلی دەکەن، بەڵام لەم ئایەتەدا تەنها نەقلی ووتەی مقاتل بن سلیمان-یان کردووە کە لە تەفسیرەیەکەیدا دەڵێ: ئەم ئایەتە نەسخ بۆتەوە بە ئایەتی شمشێر، بەڵام باسی ابن عباس ناکەن کە بڵێ ئەم ئایەتە

نەسخ بۆتەوە، جا نازانم مكي بن أبي طالب ئەم ووتەیەی ابن عباس-ی لەکوێ بینیوە ! خۆشی باسی ئەوە دەکات کە زۆرینەی زاناکان لەسەر ئەوەن کە ئەم ئایەتە نەسخ نەبۆتەوە، وە خودی ئایەتەکە فرمان کردن بە شمشێری تێدایە، هەروەک الحسن البصري دەڵێ: الله بە پێغەمبەرەکەی فەرموو: بەم مونافیقانە بڵێ گەر نیفاق ناو دڵتان دەربخەن ئەوا دەتان کوژم.

## عز الدين الرسعني الحنبلي دەڵێ:

﴿فَأَعۡرِضۡ عَنۡهُمۡ﴾ واتا: واز بهێنە لە سزادانیان.

ژمارەیەک لە زانایانی تەفسیر بۆ ئەوە چوونە کە فرمان کردن بە واز لێهانانیان نەسخ بۆتەوە بە ئایەتی شمشێر، **ئەمەش دروست نیە**، چونکە ئایەتی شمشێر خوێنی موشریکانی حەلال کرد و هانیدان بۆ کوشتنیان، **بەڵام مونافیق خوێنی پارێزراوە بەهۆی دەرخستنی ووشەی حەق.**

**[رموز الكنوز : 547/1-548]**

## ابن كثير دەڵێ:

﴿أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ يَعۡلَمُ ٱللَّهُ مَا فِي قُلُوبِهِمۡ﴾ واتا: ئەم جۆرە کەسانە لە خەڵکی کە مونافیقن الله دەزانێ چی لە دڵیاندا هەیە، وە پاداشتیان دەداتەوە لەسەری، هیچ شتێک لە الله شاراوە نیە، ئەی محمد الله بەسە بۆت دەربارەی ئەوان، الله زانایە بە ڕووکەش و ناخیان، هەر بۆیە بە پێغەمبەرەکەی فەرموو: ﴿فَأَعۡرِضۡ عَنۡهُمۡ﴾ **واتا: توند مەبە لەگەڵیان بەهۆی ئەو نیفاقەی کە لە دڵیاندا هەیە.** ﴿وَعِظۡهُمۡ﴾ **واتا: نەهیان لێ بکە لەو نیفاقە و خراپە نهێنیانەی کە لە دڵیاندا هەیە.** ﴿وَقُل لَّهُمۡ فِيٓ أَنفُسِهِمۡ قَوۡلَۢا

بَلِيغًا﴾ واتا: ئامۆژگاریان بکە لەنێوان خۆت و ئەواندا بە ووتەیەکی بەهێزو کاریگەر کە ڕایان بچەڵەکێنێ.

**[تفسير ابن كثير : 347/2]**

ووتم: بڕوانە باسی نیفاق دەکات کە کوفری شاراوەی ناخە، باسی کوفرێکی ئاشکرا ناکات کە ئەنجامیان دابێت.

## مقاتل بن سليمان دەڵێ:

﴿وَلَوۡ أَنَّهُمۡ إِذ ظَّلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ جَآءُوكَ﴾ [النساء: ٦٤]، گەر کاتێک زوڵمیان لە خۆیان کرد بە **تاوان**، واتا ئەو کاتەی ڕازی نەبوون بە حوکمی تۆ، بێن بۆ لات، ﴿فَٱسۡتَغۡفَرُواْ ٱللَّهَ﴾ داوای لێخۆشبوون لە الله بکەن لە **تاوانەکانیان.**

**[تفسير مقاتل بن سليمان : 386/1]**

## الطبري دەڵێ:

﴿إِذَآ أَصَٰبَتۡهُم مُّصِيبَةُۢ﴾ واتا: گەر سزایەکیان بەسەر دابەزی لەلایەن الله-وە، ﴿بِمَا قَدَّمَتۡ أَيۡدِيهِمۡ﴾ **بەو تاوانانەیان کە پێشتر ئەنجامیان داوە.** ﴿ثُمَّ جَآءُوكَ يَحۡلِفُونَ بِٱللَّهِ﴾ الله دەفەرمووێ: پاشان دێن بۆ لات سوێند دەخۆن بە الله بە درۆ، ﴿إِنۡ أَرَدۡنَآ إِلَّآ إِحۡسَٰنًا وَتَوۡفِيقًا﴾ ئەمە هەواڵ پێدانی الله-یە دەربارەی ئەم مونافیقانە کە ڕووداوە جۆراو جۆرەکان و سزاکان ڕایان ناچڵەکێنێ لە نیفاق، وە ئەوان گەر سزا بیانگرێتەوە لەلایەن الله-وە بەهۆی حوکم بردنەوەیان بۆ لای طاغوت ئەوا ناگەڕێنەوە و تەوبە ناکەن، بەڵکو سوێند دەخۆن بە الله بە درۆ و جورئەت هەبوونە بەرامبەر الله دەڵێن:

**هیچ شتێکمان نەویست بە حوکم بردنەوەمان بۆ لای طاغوت جگە لە چاکە کردنی هەندێکمان بۆ هەندێکمان و گەیشتن بە صەواب لەو بابەتەی کە حوکممان بردەوە بۆ لای طاغوت بە حوکم بردنەوەمان بۆی.**

**[تفسير الطبري : 7/196-197]**

**الطبري** لە تەفسیری ئایەتی: ﴿وَلَوْ أَنَّهُمْ إِذ ظَّلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمْ جَآءُوكَ فَٱسْتَغْفَرُواْ ٱللَّهَ وَٱسْتَغْفَرَ لَهُمُ ٱلرَّسُولُ لَوَجَدُواْ ٱللَّهَ تَوَّابًا رَّحِيمًا﴾ [النساء: ٦٤]، دەڵێ:

الله جل ثناؤە دەفەرمووێ: ئەو مونافیقانەی کە وەصفی صیفەتەکانم کردن لەم دوو ئایەتەدا، ئەوانەی گەر بانگ کرابوان بۆ حوکمی الله و حوکمی پێغەمبەرەکەی ڕێگریان دەکرد، ﴿إِذ ظَّلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمْ﴾ **زوڵمیان لەخۆیان کرد بە ئەنجامدانی تاوانێکی گەورە بە حوکم بردنەوەیان بۆ لای طاغوت**، وە ڕێگری کردنیان لە گەڕانەوە بۆ کتێبی الله و سوننەتی پێغەمبەرەکەی کاتێک بانگ کرابوان بۆی، ﴿جَآءُوكَ﴾ گەر بهاتنایە بۆ لات ئەی محمد کاتێک ئەو کارەیان ئەنجامدا لە چوونیان بۆ لای طاغوت **ڕازی بوون بە حوکمی ئەو لەبڕی حوکمی تۆ**، هاتن بۆ لات بە تەوبە و گەڕانەوە، **داوایان لە الله کرد لێیان خۆشبێ لە سزادانی تاوانەکەیان بە داپۆشینی**، وە پێغەمبەریش ﷺ هەمان شتیان بۆ داوا بکات لە الله، ئەمەیە مانای فەرمایشتی الله: ﴿فَٱسْتَغْفَرُواْ ٱللَّهَ وَٱسْتَغْفَرَ لَهُمُ ٱلرَّسُولُ﴾ بەڵام فەرمایشتی الله: ﴿لَوَجَدُواْ ٱللَّهَ تَوَّابًا رَّحِيمًا﴾ الله دەفەرمووێ: گەر ئەوان وابکەن و **تەوبە بکەن لە تاوانەکەیان**، ﴿لَوَجَدُواْ ٱللَّهَ تَوَّابًا﴾ الله دەفەرمووێ: لەو شتە دەگەڕێتەوە بۆیان کە پێیان ناخۆشە بۆ ئەو شتەی کە پێیان خۆشە، ﴿رَّحِيمًا﴾ واتا: بە بەزەییە بۆیان لە وازهێنانی لە سزادانیان لەسەر ئەو

**تاوانەی کە تەوبەیان لێ کرد.**

[تفسير الطبري : 199/7]

ووتم: هەریەک لە مقاتل بن سلیمان و الطبري حوکم بردنەوەی مونافیقەکانیان بۆ لای طاغوت بە تاوان ناو برد نەک کوفر، ئەمە لە حوکمی ڕووکەشدا، ئەگەرچی لە ناخەوە کافر بوون الله و ئیمانیان بە طاغوت هەبوو.

**ابن كثير** دەڵێ:

﴿ثُمَّ جَآءُوكَ يَحۡلِفُونَ بِٱللَّهِ إِنۡ أَرَدۡنَآ إِلَّآ إِحۡسَٰنٗا وَتَوۡفِيقًا﴾ واتا: عوزر دەهێننەوە بۆت و سوێند دەخۆن کە بە ڕۆیشتنمان بۆ لای کەسێکی تر جگە لە تۆ و حوکم بردنەوەمان بۆ لای لای غەیری تۆ، **هیچمان نەویستووە لەم کارەدا تەنها ئیحسان و تەوفیق نەبێ**، واتا: موجامەلە کردن و نواندن، نەک بڕوامان وابێت ئەو حوکمە دروستە.

[تفسير ابن كثير : 2/346-347]

**يحيى بن سلام** دەڵێ:

الحسنی واتا: خێر، ئەم مانایەش لە فەرمایشتی الله لە سورەتی براءة هاتووە: ﴿وَلَيَحۡلِفُنَّ إِنۡ أَرَدۡنَآ إِلَّا ٱلۡحُسۡنَىٰۖ وَٱللَّهُ يَشۡهَدُ إِنَّهُمۡ لَكَٰذِبُونَ﴾ [التوبة: ١٠٧]، واتا: هیچمان نەویست لە دروستکردنی ئەم مزگەوتە جگە لە خێر، هاوشێوەی ئەمەش لە سورەتی النساء هەیە، الله فەرموویەتی: ﴿يَحۡلِفُونَ بِٱللَّهِ إِنۡ أَرَدۡنَآ إِلَّآ إِحۡسَٰنٗا وَتَوۡفِيقًا﴾ [النساء: ٦٢]، **واتا: هیچمان نەویست جگە لە خێر.**

[التصاریف : لاپەرە 194]

ووتم: مونافیقەکان لە عوزر هێنانەوەیان بۆ کارەکەیان ئەمە دەردەخات کە حوکم بردنەوە بۆ لای طاغوت لە هەموو حاڵەتێکدا کوفر نیە، چونکە گەر بە ڕەهایی کوفر بوایە ئەوا ئەم عوزرەیان نەدەهێنایەوە، لەبەر ئەوەی ئەوان ئەم درۆیە دەکەن تاکو پارێزراو بن لە سزای دونیایی، مەحاڵیشە عوزرێک بهێننەوە کە بزانن بەهۆی ئەم عوزرەوە تەکفیر دەکرێن و دەکوژرێن، بێگومان دەزانن ئەم عوزرە سودێکیان پێ دەگەیەنێت بۆیە ئاوا بە درۆ سوێندی لەسەر دەخۆن، تەنانەت عوزرەکەیان جۆرێک لە حەلال کردنی کارەکەیانی تێدایە بەڵام بە تەئویلەوە، هەروەک یحیی بن سلام و ابن کثیر باسیان کرد، چونکە دەڵێن لەم کارەدا مەبەستمان چاکە کاری و صەواب بووە، واتا وامان بە باش زانیوە کە حوکم بۆ لای طاغوت ببەینەوە لەبەر ئەم هۆکارانە، واتا کارەکەمان بە تەئویلەوە کردووە نەک بڕوامان بە حوکمی طاغوت هەبێت، جا ئەگەر مونافیق بەم حاڵەوە تەکفیر نەکرێت، ئەی چۆن موسڵمانێک تەکفیر دەکرێت کە حاڵی تەواو پێچەوانەی حاڵی مونافیقەکە ؟!

جا ڕەنگە بڵێن: مونافیقەکان وتوویانە ئێمە حوکمی طاغوت بە دروست نازانین وەک ابن کثیر باسیکرد بۆیە تەکفیر نەکران و نەکوژران.

لە وەڵامدا دەڵێین: ئەمە بەڵگەیە لە دژتان نەک بەڵگە بێت بۆتان، گەر مونافیق بە درۆ بڵێ من باوەڕم بە حوکمی طاغوت نیە تەنها لەبەر چەند بەرژەوەندیەک حوکم دەبەمەوە بۆ لای، بەم ووتەیە عوزری پێ بدرێت و تەکفیر نەکرێت، ئەی چ جای ئەوەی موسڵمانێک کە بەڕاستی لە دڵەوە کوفری کردووە بە طاغوت و بەرییە لە خۆیان و یاساکانیان بەڵام بۆ وەرگرتنەوەی حەقێکی حوکم دەباتەوە بۆ لایان چونکە هیچ ڕێگایەکی تری لە بەردەم نیە تا حەقەکەی وەربگرێتەوە، چۆن ئەمە تەکفیر دەکرێت ؟!

قال الله تعالى:

﴿فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُواْ فِيٓ أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُواْ تَسْلِيمًا﴾ [النساء: ٦٥]

زیادەڕەوەکان بەڵگە بەم ئایەتە دەهێننەوە بە تێگەیشتنێکی نادروست دایدەبەزێنن بەسەر خەڵکیدا، بە جۆرێک گەر بێتو لە ووتەکەی خۆیان وورد ببنەوە ئەوا دەبێت ڕۆژانە چەند جارێک خۆیان تەکفیر بکەن.

تێگەیشتنی ئەوان بۆ ئەم ئایەتە بەم جۆرەیە:

الله تعالى سوێندی خواردووە بە زاتی خۆی کە هیچ کەسێک ئیمانی نیە تاکو سێ مەرجی تێدا نەیەتە دی، یەکەم: لە هەموو ناکۆکیەک حوکم بەرێتەوە بۆ لای قورئان و سوننەت، دووەم: لە دڵەوە بە حوکمی قورئان و سوننەت ڕازی بێت، سێیەم: بە ڕووکەشیش تەسلیمی بێت و جێبەجێی بکات، گەر یەکێک لەمانەی نەکرد ئەوا ئیمانی نیە و کافرە.

جا هەر موسڵمانێک لە هەر ناکۆکیەکدا حوکم بەرێتەوە بۆ یاسا دانراوەکان ئەوا بە بەڵگەی ئەم ئایەتە کافر بووە، چونکە حوکمی نەبردۆتەوە بۆ قورئان و سوننەت، تەنانەت حوکم بۆ قورئان و سوننەتیش بباتەوە و لە دڵەوە قبوڵی بێت بەڵام لە ڕووکەشدا تەسلیمی نەبێت و جێبەجێی نەکات ئەوا هەر کافرە.

بە پێی ئەم تێگەیشتنەی زیادەڕەوەکان بۆ ئەم ئایەتە، دەبێ بڵێین:

گەر موسڵمانێک مامەڵەیەکی هاتە پێشەوە، نەیزانی مامەڵەکە حەلالە یان حەرامە، ئەویش بچێتە لای زانایەک پرسیاری لێ بکات دەربارەی مامەڵەکە، زاناکەش بڵێ: ئەم مامەڵەیە حەرامە بە بەڵگەی ئەم فەرموودەیە، موسڵمانەکە لێرەدا حوکمی بردەوە بۆ لای شەرعی الله واتا مەرجی یەکەمی بەجێ هێنا، لە دڵیشەوە حوکمەکەی قبوڵ کرد و دانی پێدانا کە ئەمە

حەرامە واتا مەرجی دووەمیشی بەجێ هێنا، بەڵام مامەڵەکەی ئەنجامدا، ئەوا لێرەدا کافر بوو، چونکە مەرجی سێیەمی بەجێ نەهێنا کە تەسلیم بوونە بە حوکمەکە و جێبەجێ کردنیەتی.
جا ڕەنگە بڵێن نەخێر وانیە ئێمە ئەو کەسە بە تاوانبار دەزانین نەک کافر!
بەڵام بە پێی تەئصیلەکەتان بۆ ئەم بابەتە مولزەم دەبن بەوەی کە ئەم موسڵمانە تەکفیر بکەن، هەروەک چۆن لە بابەتی حوکم کردن بە غەیری ئەوەی الله دایبەزاندووە مولزەم دەبن بەوەی ئەو موسڵمانە تەکفیر بکەن کە بەردەوامە لەسەر تاوان و تاکو دەمرێت لێی لانادات، چونکە بە بەردەوامی حوکمی نەکردووە بەوەی الله دایبەزاندووە نەک جارێک و دووان.

**ابن تيمية** دەڵێ:

فەرمایشتی الله تعالى: ﴿فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤۡمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيۡنَهُمۡ ثُمَّ لَا يَجِدُواْ فِيٓ أَنفُسِهِمۡ حَرَجٗا مِّمَّا قَضَيۡتَ وَيُسَلِّمُواْ تَسۡلِيمٗا﴾ کاتێک الله نەفی ئیمانی کرد تاکو ئەم ئامانجە بوونی دەبێت، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەم ئامانجە فەرزە لەسەر خەڵکی، هەر کەسێک وازی لێ بهێنێت ئەوا لەو کەسانەیە کە هەڕەشەیان لێکراوە، **ئەو ئیمانە واجبەی نیە کە ئەهلەکەی بەڵێنیان پێدراوە بە چوونە بەهەشتەوە بەبێ سزا**، الله بەڵێنی ئەمەی داوە بەو کەسانەی کە فرمانەکانی الله ئەنجام دەدەن، **بەڵام ئەو کەسەی هەندێک واجبات ئەنجام دەدات و هەندێکی واز لێ دەهێنێت ئەوا شایستەیە هەڕەشە بیگرێتەوە.**

[مجموع الفتاوى: 37/7]

ووتم: مەبەستی لە ئامانجەکە حوکم بردنەوە و ڕازی بوون و تەسلیم بوونە بە حوکمی الله و پێغەمبەرەکەی.

ابن تیمیة نەفی کردنی ئیمانەکەی گەڕاندەوە بۆ واجباتی ئیمان نەک ئەصلی ئیمان، وەک زانراویشە ئیمان ئەصل و واجب و موستەحەباتی هەیە، کە ئەوەی یەکەمیان هەر کەسێک نەیبێت کافرە و ئیمانی نیە، وە ئەوەی دووەمیان پێی تاوانبار دەبێت نەک کافر بێت، وە ئەوەی سێیەمیان سزای لەسەر نیە و پاداشتی هەیە.

**ابن تیمیة** دەڵێ:

الله تعالی فەرموویەتی: ﴿فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤۡمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيۡنَهُمۡ ثُمَّ لَا يَجِدُواْ فِيٓ أَنفُسِهِمۡ حَرَجٗا مِّمَّا قَضَيۡتَ وَيُسَلِّمُواْ تَسۡلِيمٗا﴾ جا هەر کەسێک پابەند نەبێت بە حوکم کردنی الله و پێغەمبەرەکەی لەو خیلافەی کە لەنێوانیان ڕوو دەدات، ئەوا الله سوێندی خواردووە بە زاتی خۆی کە ئیمان ناهێنێ، **بەڵام ئەو کەسەی کە پابەندە بە حوکمی الله و پێغەمبەرەکەی لە ناخ و ڕووکەشدا، بەڵام سەرپێچی دەکات و شوێنی ئارەزووی دەکەوێ، ئەوا ئەم کەسە لە پلەی تاوانبارەکانی هاوشێوەیەتی.**

**وە ئەم ئایەتە لەوانەیە کە خەواریجەکان بەڵگەی پێ دەهێننەوە بۆ تەکفیر کردنی ئەو کار بەدەستانەی کە حوکم ناکەن بەوەی الله دایبەزاندووە**، پاشان پێیان وایە بیروباوەڕی خۆیان حوکمی الله-یە.

**[منهاج السنة النبوية : 131/5]**

ووتم: بڕوانە کاکی زیادەڕەو لە بەشی یەکەمدا زانایان ووتیان خەواریجەکان بەڵگە بە ئایەتی: ﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾ دەهێننەوە، لەم بەشەشدا ابن تیمیة دەڵێ: خەواریجەکان بەڵگە بە ئایەتی: ﴿فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤۡمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيۡنَهُمۡ

ثُمَّ لَا يَجِدُواْ فِيٓ أَنفُسِهِمۡ حَرَجٗا مِّمَّا قَضَيۡتَ وَيُسَلِّمُواْ تَسۡلِيمٗا﴾ دەهێننەوە ! بۆچی لەم دوو بابەتە دەستت گرتووە بە دوو ئایەتەوە کە هەردووک ئایەت خەواریج بەڵگەیان پێی هێناوەتەوە ؟ ئێستا لەوە حاڵی بوویت کە تێگەیشتنی تۆ بۆ ئەم دوو بابەتە هەمان تێگەیشتنی خەواریجە ؟

ابن تيمية ووتی: (بەڵام ئەو کەسەی کە پابەندە بە حوکمی الله و پێغەمبەرەکەی لە ناخ و ڕووکەشدا، بەڵام سەرپێچی دەکات و شوێنی ئارەزووی دەکەوێ، ئەوا ئەم کەسە لە پلەی تاوانبارەکانی هاوشێوەیەتی).

پابەند بوون بە حوکمی الله و پێغەمبەرەکەی لە ناخدا ئەوەیە کە لە دڵەوە قبوڵت بێت و گومانت لە حەق و عەدلی حوکمەکە نەبێت.

وە پابەند بوون لە ڕووکەشدا ئەوەیە کە بە زمان دەری ببڕی کە ئەم حوکمە لەسەر تۆ واجبە، یان ئەم شتە لەسەر تۆ حەرامە، هیچ تانەیەک لە حوکمەکە نەدەیت و ڕەخنەی لێ نەگریت و ڕەتی نەکەیتەوە، هەروەک چۆن کەسێک زینا دەکات دان بەوە دەنێت کە تاوانبارە کارێکی حەرامی ئەنجامی داوە، ئەم کەسە لە ناخ و ڕووکەشدا پابەند بووە بە فەرمانی الله، بەڵام سەرپێچی کردووە و شوێنی ئارەزووی کەوتووە.

ڕەنگە بڵێن: ئەمە بۆ تاوان وایە نەک بۆ کوفر، لە وەڵامدا دەڵێین: حوکم کردن بە غەیری الله یان حوکم بردنەوە بۆ غەیری شەرعی الله لە ئەصلدا تاوانە بە مەرج دەبێتە کوفر وەک باقی تاوانەکان.

## ***ابن تيمية*** دەڵێ:

هەر نەفی کردنێکی کردەوە لە قورئان و سوننەتدا هاتبێ **ئەوا بۆ نەفی کردنی هەندێک لە واجباتەکانی کردەوەکەیە**، وەک فەرمایشتی الله تعالى: ﴿فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤۡمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيۡنَهُمۡ ثُمَّ لَا يَجِدُواْ فِيٓ أَنفُسِهِمۡ حَرَجٗا مِّمَّا قَضَيۡتَ وَيُسَلِّمُواْ تَسۡلِيمٗا﴾.

**[القواعد النورانية الفقهية : لاپەرە 53]**

ووتم: واتا ئەم نەفی کردنەی ئیمان لەم ئایەتەدا نەفی کردنی هەندێک لە واجباتی ئیمانە، نەک نەفی کردنی ئەصلی ئیمان کە خاوەنەی کافر بێت.

**السمعاني** دەڵێ:

فەرمایشتی الله تعالی: ﴿فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ﴾ **مەبەست پێی ئیمانی کاملە، واتا ئیمانیان کامل نابێت،** ﴿حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ﴾ تاکو تۆ نەکەن بە حاکم لەو خیلافەی کە لەنێوانیان ڕوو دەدات.

**[تفسير السمعاني : 1/444]**

**السمعاني** دەڵێ:

﴿فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُواْ فِيٓ أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُواْ تَسْلِيمًا﴾ **مانای ئایەتەکە ئەمەیە: ئیمانیان کامل نابێت** تاکو ڕازی دەبن بە حوکمی تۆ، وە ملکەچ دەبن بۆت، وە ووتراوە: ئەم ئایەتە توندترین ئایەتە لە کتێبی الله تعالی لە هەڕەشە کردندا.

**[تفسير السمعاني : 1/444]**

ووتم: بڕوانە باسی کەمالی ئیمانی کرد کە بە ئەنجامدانی واجباتەکان و دوورکەوتنەوە لە تاوانەکان کەمالی واجبی ئیمان دێتە دی، نەک مەبەستی ئەصلی ئیمان بێت.

**عبدالرحمن بن حسن آل الشيخ** دەربارەی فەرموودەی: (لا يؤمن أحدكم حتى يكون

هواه تبعا لما جئت به) کە لە کتێبی التوحید هاتووە، دەڵێ:

ئەم فەرموودەیە الشیخ أبو الفتح نصر بن إبراهیم المقدسي الشافعي ڕیوایەتی کردووە لە کتێبی (الحجة علی تارك المحجة) بە سەنەدێکی صەحیح، هەروەک دانەری کتێب رَحِمَهُ اللَّهُ لە النووي-ەوە نەقلی کرد، وە الطبراني و أبو بکر بن عاصم و الحافظ أبو نعیم لە کتێبی (الأربعین) ڕیوایەتی کردووە کە کردوویەتی بە مەرج فەرموودەکانی کتێبەکە صەحیح بن، **وە شایەتی بۆ ئەم فەرموودەیە لە قورئاندا فەرمایشتی الله تعالی-یە:** ﴿فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤۡمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيۡنَهُمۡ﴾ وە فەرمایشتی: ﴿وَمَا كَانَ لِمُؤۡمِنٖ وَلَا مُؤۡمِنَةٍ إِذَا قَضَى ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ أَمۡرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ ٱلۡخِيَرَةُ مِنۡ أَمۡرِهِمۡۗ﴾ وە فەرمایشتی: ﴿فَإِن لَّمۡ يَسۡتَجِيبُواْ لَكَ فَٱعۡلَمۡ أَنَّمَا يَتَّبِعُونَ أَهۡوَآءَهُمۡۚ﴾ وە هاوشێوەی ئەم ئایەتانە، **پێغەمبەر ﷺ کە دەفەرمووێ: (لا یؤمن أحدکم) واتا: لە ئەهلی کەمالی ئیمانی واجب نیە کە الله بەڵێنی بە ئەهلەکەی داوە بە چوونە بەهەشت و ڕزگاربوون لە دۆزەخ، لە پلەی ئەهلی خراپەکاری و تاوان دایە لە ئەهلی ئیسلامدا.**

[فتح المجید : 2/662-663]

ووتم: ئایەتەکەی کردە شایەت بۆ ئەم فەرموودەیە، وە فەرموودەکەی بەوە شەرح کرد کە مەبەست پێی نەفی کردنی کەمالی ئیمانە نەک ئەصلی ئیمان، جا کاتێک ئەم ئایەتەی کردە شایەت بۆ فەرموودەکە مانای وایە لە ئایەتەکەشدا نەفی کردنی ئیمان هەر بە کەمالی ئیمان تەفسیر دەکات نەک ئەصلەکەی.

**السعدي** دەڵێ:

﴿فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤۡمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيۡنَهُمۡ ثُمَّ لَا يَجِدُواْ فِيٓ أَنفُسِهِمۡ حَرَجٗا مِّمَّا قَضَيۡتَ وَيُسَلِّمُواْ تَسۡلِيمٗا﴾ پاشان الله تعالى سوێندی خوارد بە زاتی بەڕێزی خۆی کە ئەوان ئیمان ناهێنن تاکو پێغەمبەرەکەی نەکەن بە حاکم لەو خیلافەی کە لەنێوانیان ڕوو دەدات، واتا لە هەموو شتێک کە خیلافی تێدا ڕوو دەدات، بە پێچەوانەی بابەتەکانی ئیجماع کە پاڵپشتن بە قورئان و سوننەت، پاشان ئەم حوکم بردنەوەیە بەس نیە تاکو دڵتەنگی لە دڵیاندا نامێنێت و حوکم دەبەنەوە بۆ لای بە شێوەیەکی ئاسایی و بەبێ زۆر لەخۆ کردن، پاشان ئەمە بەس نیە تاکو تەسلیم دەبن بۆ حوکمەکەی تەسلیم بوونێک بە سینگ فراوانی و دڵ ئارامیەوە، وە ملکەچ بوون بە ناخ و بە ڕووکەشەوە، حوکم بردنەوە بۆ لای پێغەمبەر لە پلەی ئیسلام دایە، وە نەبوونی دڵتەنگی لە پلەی ئیمان دایە، وە تەسلیم بوون لە پلەی ئیحسان دایە، جا هەر کەسێک ئەم پلانە تەواو بکات ئەوا هەموو پلەکانی دینی تەواو کردووە، **وە هەر کەسێک واز بهێنێت لەم حوکم بردنەوەیە بۆ لای پێغەمبەر، پابەند نەبێت پێی ئەوا کافرە، وە هەر کەسێک واز لەم حوکم بردنەوەیە بهێنێت بەڵام پابەند بێت پێی، ئەوا هەمان حوکمی تاوانبارەکانی هاوشێوەی هەیە.**

**[تفسير السعدي : لاپەرە 199-200]**

ووتم: بڕوانە ووتی: (هەر کەسێک واز بهێنێت لەم حوکم بردنەوەیە بەڵام پابەند بێت پێی، ئەوا تاوانبارە) واتا پابەند بوون ئەوە نیە ئیللا فرمانەکە ئەنجام بدەیت، دەکرێ فرمانەکەش ئەنجام نەدەیت بەڵام پابەند بیت پێیەوە.

لە بەشی یەکەم باسمان کرد ئەو کەسەی حوکم بە غەیری قورئان دەکات و یاسا دادەنێت بە چەند مەرجێک کافر دەبێت، جا گەر حاکم بە ڕەهایی تەکفیر نەکرێت کە خۆی

خاوەن دەسەڵاتە و حوکم کردن بە قورئان لەسەر ویستی ئەو وەستاوە، ئەی چۆن خەڵکێکی داماو تەکفیر دەکرێت کە تەنها داوای حەقەکەی خۆی دەکاتەوە و لە غەیری شەرعی اللە بە هیچ حوکمێکی تر ڕازی نیە ؟! تەنانەت هەر بەم تەئصیلە باطلەی کە باسی دەکەن و دەڵێن جارێک و دووان حوکم نەکات بە قورئان کافر نیە، ژمارەکە زۆر بوو ئەوکات کافرە، هیچ نەبێت ئەم تەئصیلە باطلە بۆ خەڵکی داماویش بەکاربهێنن بڵێن گەر جارێک و دووان حوکمی بردەوە بۆ لایان تەکفیر ناکرێت، چونکە بە هەموو حەقێک دەبێت حوکمی ئەم خەڵکە سوکتر بێت لە حوکمی حاکمەکان، چۆن دەکرێت حاکم کە حوکمەکە لە ژێر دەستی خۆیەتی بواری زیاتر پێ بدرێت لە تەکفیر کردندا، بەڵام خەڵکەکە کە هیچ دەسەڵاتێکیان نیە و بە ناچاری حوکمی بۆ دەبەنەوە دەست بەجێ تەکفیر بکرێن بەبێ ڕەچاو کردنی هیچ مەرجێک ؟!

تەنانەت کەسێک بڕوای بە حوکمی شەرع هەبێت و جگە لەمە بڕوای بە هیچ حوکمێکی تر نەبێت، بەڵام لە بابەتێکدا دەزانێت گەر حوکم بباتەوە بۆ شەرع ئەوا حەقەکە بۆ کەسی بەرامبەر دەبێت، وە ئەگەر حوکم بباتەوە بۆ یاسا دانراوەکان ئەوا حەقەکە بۆ خۆی دەبێت، ئەویش لەبەر بەرژەوەندی و ئارەزووەکانی حوکم دەباتەوە بۆ یاسا دانراوەکان بەڵام لە دڵەوە تەنها بڕوای بە شەرعی اللە هەیە و تانەی لێ نادات و دان بە حەرام و حەلالەکانی دەنێت و دەزانێت جگە لەم حوکمە هەموو حوکمێکی تر باطلە، وە هیچ تەعزیم کردنێک و پیرۆزیەک بۆ یاساکە دەرنەبڕێت و دان بەوە بنێت کارەکەی تاوانە، ئەوا کافر نابێت بەم کارە بەڵام تاوانێکی یەکجار گەورەی ئەنجامداوە، هەروەک چۆن مونافیقەکان تەکفیر نەکران کاتێک وتیان ئێمە بڕوامان بە حوکمی طاغوت نیە بەڵام بۆ بەرژەوەندی و چاکە ئەم کارەمان کرد، جا گەر ئەوان بەم کارە تەکفیر نەکرێن، ئەی موسڵمانێکی حەق خوراو کە تەنها دەیەوێت حەقەکەی وەربگرێتە هیچ ڕێگایەکی شەرعی لەبەردەم نیە بۆ گەڕاندنەوەی حەقەکەی، ناچار سکاڵا تۆمار دەکات و حوکم دەباتەوە بۆ یاسا دانراوەکان، چۆن تەکفیر دەکرێت ؟!

گەر بووترێ: ناچاری عوزر نیە تەنها (إکراه) عوزرە، الله تعالی لە قورئاندا تەنها (إکراه)ی بە عوزر داناوە بۆ کوفر کردن، لە وەڵامدا دەڵێین: وەک ووتمان هیچ کام لە حوکم نەکردن بە شەرع و حوکم بردنەوە بۆ غەیری شەرع بە ڕەهایی کوفر نین بەڵکو بە مەرج دەبن بە کوفر، کەواتە مادام لە ئەصلدا کارەکە تاوانە کوفر نیە، ئەوا ئایەتی: ﴿مَن كَفَرَ بِٱللَّهِ مِنۢ بَعۡدِ إِيمَٰنِهِۦٓ إِلَّا مَنۡ أُكۡرِهَ وَقَلۡبُهُۥ مُطۡمَئِنُّۢ بِٱلۡإِيمَٰنِ وَلَٰكِن مَّن شَرَحَ بِٱلۡكُفۡرِ صَدۡرٗا فَعَلَيۡهِمۡ غَضَبٞ مِّنَ ٱللَّهِ وَلَهُمۡ عَذَابٌ عَظِيمٞ﴾ **[النحل: ١٠٦]**، نابێتە بەڵگە بۆ ئەم بابەتە.

خاڵێکی تر کە زۆر گرنگە بەڵام درک پێکردنی وورد بوونەوەی دەوێت، کە باسی بابەتی حوکم کردن بە غەیری قورئان دەکرێت ڕێک بیرمان بۆ لای حاکم و یاسا دانەران دەچێت، وە کاتێک باسی حوکم بردنەوە بۆ لای یاسا دانراوەکان دەکرێت ڕێک بیرمان بۆ لای ئەم خەڵکە دەچێت کە حوکم دەباتەوە بۆ ئەم یاسایانە، بە جۆرێک وای لێهاتووە ئایەتی (٤٤)ی سورەتی المائدة تایبەت کراوە بە حاکم، ئایەتی (٦٥)ی سورەتی النساء تایبەت کراوە بەو خەڵکەی حوکم دەبەنەوە بۆ لای حاکم، ئەم تێگەیشتنەش هەڵەیە ئایەتەکەی المائدة هەموو موسڵمانێک دەگرێتەوە حاکم و جگە لە حاکمیش بەڵام لە حاکمدا زیاتر حوکمەکە دەردەکەوێ، ئەگینا باقی تری خەڵکەکەش لێی بێ بەش نین، هەر بۆیە کاتێک پیاوێک بە طاوس-ی ووت: دەمەوێ هەندێک باخی خورما بدەم بە یەکێک لە کوڕەکانم بە دیاری، بەڵام بەوانی تری نەدەم، طاوس ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿أَفَحُكۡمَ ٱلۡجَٰهِلِيَّةِ يَبۡغُونَۚ﴾ **[المائدة: ٥٠]**، کە ئەمڕۆ ئەم ئایەتە تەنها پەیوەست کراوە بە حاکمان و یاسا دانەران، هەروەها مقاتل بن حیان هەرکاتێک ئایەتی: ﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾ تەفسیر دەکرد دەیووت: وەصفی پێغەمبەریان شاردەوە و باوەڕیان پێی نەهێنا بۆیە کافرن، مەعلومیشە کە باوەڕ نەهێنانی یەهود بە پێغەمبەر هەموویان دەگرێتەوە نەک تەنها کاربەدەست و زاناکانیان، هەروەک الطبري-ش ئاماژەی پێ دەدات.

**الطبري** دەڵێ:

﴿وَلۡيَحۡكُمۡ أَهۡلُ ٱلۡإِنجِيلِ بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فِيهِۚ﴾ [المائدة: ٤٧]، الله تعالى ذكره هيچ کتێبێکی دانەبەزاندووە بەسەر پێغەمبەرێک لە پێغەمبەرانی تەنها بۆ ئەوە نەبێت کە کار بکەن بەوەی لە کتێبەکەدا هەیە ئەو کەسانەی کە فرمانیان پێ کراوە کاری پێ بکەن، وە داینەبەزاندووە بەسەریان ئیللا فرمانی پێ کردوون کە کار بکەن بەوەی لە کتێبەکەدا هەیە، بۆ کار کردن بەوەی لە کتێبەکەدا هەیە دایبەزاندووە، وە فرمانی کردووە بە ئەهلی کتێبەکە کار بکەن بەوەی لە کتێبەکەدا هەیە.

**[تفسير الطبري: 484/8]**

ووتم: هەموو ڕستەکانی ئەم ووتەیەی سەرەوە لە ڕووی مانەوە هەمان شتن دووبارە بوونەتەوە بە شێوازی جیاواز، نازانم هۆی ئەمە چیە، دەیتوانی بە دوو ڕستە کۆتایی پێ بهێنێت ! بۆیەش ئاماژەم بەمەدا تا کەس وا هەست نەکات هەڵە لە وەرگێڕانەکە هەیە، یان ووتەکان دووبارە بوونەتەوە بە هەڵە.

بڕوانە باسی ئەوەی کرد الله هەر کتێبێکی دابەزاند بێت بۆ ئەوە بووە تا ئەهلی کتێبەکە کاری پێ بکەن، کار کردن بە حوکمەکانی کتێبەکە هەموو ئەهلی کتێبەکە دەگرێتەوە نەک تەنها حاکمەکان.

جا هەروەک وەک چۆن ئایەتەکەی المائدة تایبەت نیە بە حاکمان بەڵکو خەڵکیش دەگرێتەوە، بە هەمان شێوە ئایەتەکەی النساء ﴿فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤۡمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيۡنَهُمۡ ثُمَّ لَا يَجِدُواْ فِيٓ أَنفُسِهِمۡ حَرَجٗا مِّمَّا قَضَيۡتَ وَيُسَلِّمُواْ تَسۡلِيمٗا﴾ تایبەت نیە بەو خەڵکەی کە حوکم دەبەنەوە بۆ لای غەیری شەرعی الله، بەڵکو یاسا دانەرانیش دەگرێتەوە بگرە ئەوان لە پێشترن بۆ ئەم ئایەتە، چونکە یاسا دانەران کە خۆیان بە موسڵمان دەزانن

لەکاتی نوسینی یاساکان دەبوایە سەرچاوەی یەکەم و کۆتاییان تەنها قورئان و سوننەت بێت حوکم بەرنەوە بۆ لای ئەم دووانە لەو بابەتانەی کە لە دیندا باسکراون، بەڵام ئەم ئایەتەیان جێبەجێ نەکرد، حوکمیان نەبردەوە بۆ قورئان و سوننەت بەڵکو حوکمیان بردەوە بۆ یاسای فەرەنسی و ئینگلیزی و یۆنانی یان بۆ ڕەئی و ئارەزووەکانی خۆیان، بە پێی یاساکانی ئەوان بڕیارەکانیان دەرکرد و سزاکانیان سەپاند، ئینجا هاتن کاریان بەم یاسایانە کرد و ئایەتەکەی المائدة ئەوانی گرتەوە، جا ئەو کەسەی یاسا دادەنێت گەر موسڵمان بێت و یاساکانی هیچ کوفرێکی تێدا نەبێت و دوور بێت لە حەلال کردن و تەفزیل کردن و یەکسان کردن و سوکایەتی کردن بە حوکمی شەرعی و ڕەتکردنەوە و ئینکاری کردنی، ئینجا یاساکانیشی جێبەجێ بکات لەسەر خەڵکی و حوکمی پێ بکات، هەم حوکمی نەبردەوە بۆ لای قورئان و سوننەت، وە هەم حوکمی کرد بە غەیری قورئان و سوننەت، کەچی لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا تەکفیر نەکرێت، ئەی چۆن ئەم خەڵکە موسڵمانە داماوە کە نە یاسای داناوە و نە دەسەڵاتی هەیە، تەنها بە حوکم بردنەوەی بۆ لای ئەم حاکمانە تەکفیر دەکرێت کە سەرچاوەی ئەم خراپەکارییە هەمووی یاسا دانەران و حاکمەکانن ؟!!!

**الرازي** دەڵێ:

بزانە فەرمایشتی الله تعالی: ﴿فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤۡمِنُونَ﴾ سوێندە لەلایەن الله تعالی لەسەر ئەوەی کە ئەوان وەصف ناکرێن بە صیفەتی ئیمان تەنها لەگەڵ هاتنەدی چەند مەرجێک نەبێت.

یەکەمیان: فەرمایشتی الله تعالی: ﴿حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيۡنَهُمۡ﴾ **ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی هەر کەسێک ڕازی نەبێت بە حوکمی پێغەمبەر ئیماندار نیە.**

مەرجی دووەم: فەرمایشتی الله: ﴿ثُمَّ لَا يَجِدُواْ فِيٓ أَنفُسِهِمۡ حَرَجٗا مِّمَّا قَضَيۡتَ﴾ بزانە ئەو کەسەی کە ڕازییە بە حوکمی پێغەمبەرﷺ لەوانەیە لە ڕووکەشدا پێی ڕازی بێت لە دڵدا پێی ڕازی نەبێت، **جا الله ڕوونی کردەوە لەم ئایەتەدا بێگومان دەبێت ڕازی بوون لە دڵدا بێتە دی**، وە بزانە مەیلی دڵ و پێ ناخۆش بوونی بۆ حوکمەکە شتێکە لە دەرەوەی توانای مرۆڤ دایە، جا ئایەتەکە مەبەستی ئەمە نیە، **بەڵکو مەبەست پێی ئەوەیە یەکلایی بوونەوە و یەقین لە دڵدا دروست بێ کە ئەو شتەی پێغەمبەر حوکمی پێ دەکات حەق و ڕاستە.**

مەرجی سێیەم: فەرمایشتی الله: ﴿وَيُسَلِّمُواْ تَسۡلِيمٗا﴾ بزانە ئەو کەسەی لە دڵیدا دەزانێ ئەو حوکمەی پێغەمبەر حەقە و ڕاستە، **لەوانەیە یاخی ببێت لە قبوڵ کردنی حوکمەکە بە صیفەتی عینادی کردن یان بوەستێ لە قبوڵ کردنی حوکمەکە.**

جا الله تعالی ڕوونی کردەوە هەروەک چۆن بۆ ئیمان مەرجە و دەبێت یەقین لە دڵدا دروست بێت، **بە هەمان شێوە مەرجە و دەبێت تەسلیم بوونی ڕووکەشی لەگەڵ بێت**، جا فەرمایشتی الله: ﴿ثُمَّ لَا يَجِدُواْ فِيٓ أَنفُسِهِمۡ حَرَجٗا مِّمَّا قَضَيۡتَ﴾ **مەبەست پێی ملکەچ بوونە لە ناخەوە**، وە فەرمایشتی الله: ﴿وَيُسَلِّمُواْ تَسۡلِيمٗا﴾ **مەبەست پێی ملکەچ بوونە لە ڕووکەش، والله أعلم.**

**[التفسير الكبير : 10/169-170] بتصرف**

ووتم: هەر سێ مەرجەکەی ڕوون کردەوە:

یەکەم: ﴿حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيۡنَهُمۡ﴾

(ئەوەی ڕازی نەبێت بە حوکمی پێغەمبەر ئیماندار نیە)

واتا: ڕازی نەبێت بە حوکمی شەرع و ڕەتی بکاتەوە یان باوەڕی بە حوکمی طاغوت هەبێت ئەوکات کوفرە.

دووەم: ﴿ثُمَّ لَا يَجِدُواْ فِيٓ أَنفُسِهِمۡ حَرَجٗا مِّمَّا قَضَيۡتَ﴾

(یەکلایی بوونەوە و یەقین لە دڵدا دروست بێ کە ئەو شتەی پێغەمبەر حوکمی پێ دەکات حەق و ڕاستە)

واتا: لە دڵدا دان بە حوکمی شەرع بنێت و قبوڵی بێت و بە حەق و عەدلی بزانێت.

سێیەم: ﴿وَيُسَلِّمُواْ تَسۡلِيمٗا﴾

(لەوانەیە یاخی ببێت لە قبوڵ کردنی حوکمەکە بە صیفەتی عینادی کردن یان بوەستێ لە قبوڵ کردنی حوکمەکە، بۆیە مەرجە و دەبێت تەسلیم بوونی ڕووکەشی لەگەڵ بێت)

واتا: تەنها بە ئەنجام نەدانی کارەکە کافر نابێت، گەر کارەکە جێبەجێ نەکات بە عینادی کردنەوە یان حوکمەکە قبوڵ نەکات ئەوکات کافرە.

بۆ نموونە: پیاوێک خوشکەکەی دەباتە لای حاکمی شەرعی، پرسیاری لێدەکات ئایا بە پێی شەرع خوشکەکەم میراتی بەردەکەوێ ؟ حاکمیش دەڵێ: بەڵێ، جا پیاوەکە ملکەچی حوکمی شەرع دەبێت، دەزانێت حەقی خوشکەکەیەتی میراتی پێ بدات، بەڵام لەبەر ئارەزووی ماڵی دونیا میرات نادات بە خوشکەکەی و دەزانێت تاوانبارە، لێرەدا ناووترێ ئەم پیاوە ﴿وَيُسَلِّمُواْ تَسۡلِيمٗا﴾ جێبەجێ نەکردووە و کافرە، بەڵکو جێبەجێی کرد بە ملکەچ بوون بۆ حوکمەکە، بەڵام بە ئەنجام نەدانی تاوانبار بوو.

الرازي کە دەڵێ: (وە بزانە مەیلی دڵ و پێ ناخۆش بوونی بۆ حوکمەکە شتێکە لە دەرەوەی توانای مرۆڤ دایە) مەبەستی ئەوەیە هەموو کەسێک کاتێک لە خیلافێکدا حەقەکە بۆ کەسی بەرامبەری دەبێت ئەوا لە دڵەوە پێی ناخۆشە، هەروەک چۆن زید و عمرو لەسەر سامانێک دەبێتە کێشەیان دەچن بۆ لای حاکمی شەرعی، حاکمیش دەڵێ سامانەکە بۆ زید

دەبێت، عمرو هیچی بەرناکەوێت بە پێی شەرع، لەم حاڵەتەدا گەر عمرو ڕازی بێت بە حوکمی شەرع، وە لە دڵەوە بە حەق و عەدلی بزانێت، بە زمانیش تانەی لێ نەدات، ئەوا ئاساییە لە دڵەوە پێی ناخۆش بێت کە سامانەکە درا بە زید، ئەم پێ ناخۆش بوونەش بە دەگمەن هەیە کەسمان لێی دەرباز بین، وە ئەمەش هیچ تاوانێکی تێدا نیە چ جای ئەوەی ببێتە کوفر.

**ابن عاشور** دەربارەی ئایەتی: ﴿فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤۡمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيۡنَهُمۡ ثُمَّ لَا يَجِدُواْ فِيٓ أَنفُسِهِمۡ حَرَجٗا مِّمَّا قَضَيۡتَ وَيُسَلِّمُواْ تَسۡلِيمٗا﴾ دەڵێ:

نەفی کرا کە ئەم مونافیقانە ئیماندار بن وەک ئەوەی ئەوان پێیان وایە، **لە حاڵێکدا خەڵکی وادەزانن ئەوان ئیماندارن و هەست بە کوفری ئەوان ناکەن،** لەبەر ئەمە هەواڵەکە پێویستی بە تەئکید کردنەوە هەیە بە سوێند، وە تەئکید کردنەوەی لەفزیش، **چونکە ئاشکرا کردنی حاڵی ناخیانە،** وە ئەو شتەی کە سوێندی لەسەر خوارەوە بریتیە لە ﴿حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيۡنَهُمۡ﴾ لەگەڵ ئەوەی کە لە دوای پیتی (ثم) دێت هەردووکیان بەیەکەوە، **جا گەر ئەوان حوکم بەرنەوە بۆ لای غەیری پێغەمبەر لەو خیلافەی لەنێوانیان ڕوو دەدات ئەوا ئیماندار نین، واتا گەر حوکم نەبردنەوەیان بۆ لای پێغەمبەر لەبەر ترسان بێ لە زوڵمی پێغەمبەر هەروەک ڕوونە لە سیاقی ئایەتەکەدا،** جا کوفرەکەیان ئاشکرا بوو، وە ﷲ ئوممەتی فێرکرد کە نابن بە ئیماندار تاوەکو حوکم دەبەنەوە بۆ لای پێغەمبەر و هیچ دڵتەنگیەک نابینن لە ناخیاندا بەرامبەر حوکمی پێغەمبەر، واتا دڵتەنگ بوونێک کە وایان لێ بکات حوکم بۆ لای نەبەنەوە یان توڕەیان بکات لە حوکمەکەی دوای ئەوەی کە حوکمی کرد، جا لەمەوە بە قیاس دەزانرێ کە ئیمانداران لە پێشترن لەوەی کە

پشت ناکەن لە حوکم بردنەوە بۆ لای پێغەمبەر، وە دڵتەنگی نابینن لە ناخیاندا لە حوکم کردنی، **وە مەبەست لە دڵتەنگی ئەوە نیە ئەو کەسەی حوکمی بەسەر دەدرێت هەست بە ناخۆشی بکات، گەر گومان کردن لە عەدلی پێغەمبەر و پێکانی پێغەمبەر بۆ حەق تێکەڵ بە دڵی نەبێت.**

**[التحرير والتنوير : 111/5]**

ووتم: بڕوانە ووتی: (خەڵکی نەیاندەزانی ئەوان کافرن) واتا کوفرێکی ڕوون و ئاشکرایان ئەنجام نەداوە لە ڕووکەشدا کاتێک حوکمیان بردەوە بۆ لای طاغوت.

پاشان ووتی: (الله سوێندی خوارد کە ئەم مونافیقانە ئیماندار نین، وە تەئکیدیشی کردەوە چونکە ئاشکرا کردنی حاڵی ناخیانە) واتا الله تعالی باسی شتێکی شاراوەی ئەوان دەکات، نەک خودی حوکم بردنەوەکەیان بۆ لای طاغوت حاڵیان ئاشکرا بکات و تەکفیر بکرێن بەهۆیەوە.

ئینجا دەڵێ: (جا گەر ئەوان حوکم بەرنەوە بۆ لای غەیری پێغەمبەر لەو خیلافەی لەنێوانیان ڕوو دەدات ئەوا ئیماندار نین، واتا گەر حوکم نەبردنەوەیان بۆ لای پێغەمبەر لەبەر ترسان بێ لە زوڵمی پێغەمبەر هەروەک ڕوونە لە سیاقی ئایەتەکەدا) بڕوانە حوکم بردنەوە بۆ لای غەیری پێغەمبەری بە کوفر دانا بەڵام نەک بە ڕەهایی، بەڵکو مەرجداری کرد بەوەی کە بترسن پێغەمبەر زوڵمیان لێ بکات، واتا تانە بدەن لە پێغەمبەر ﷺ.

**ابن عاشور** (دوای باسکردنی حاڵەتەکانی حوکم نەکردن بە قورئان و حوکمەکانی) پاشان دەڵێ:

**حاڵەتێکی تر هەیە لە ژێر ئەمەدا، ئەویش بریتیە لەوەی لە نەفسی خۆیدا پابەند بێت بەوەی کە حوکم نەکات بەوەی الله دایبەزاندووە، وەک ئەو موسڵمانەی کە لە شوێنەکەی ئەودا حوکمە شەرعیەکان کاریان پێ دەکرێ،**

**ئەویش دەچێتە مەحکەمە ناشەرعیەکان بە ویستی خۆی، جا ئەم پابەند بوونە حوکمەکەی توندترە لە موخالەفە کردنی شەرع لە بابەتە لاوەکیەکان، بە تایبەتی گەر بێتو ئەم کارەی بۆ بە دەست هێنانی سودێکی دونیایی نەبێت، وە گەورەتریش لەمە ئەوەیە دەسەڵاتداران خەڵکی پابەند بکەن بە حوکم کردن بە غەیری ئەوەی الله دایبەزاندووە، ئەمەش پلەی جیاوازی هەیە، هەیانە هەڵگەڕانەوە لە دینی لێ دەکەوێتەوە گەر بە سوک سەیری حوکمی الله بکات یان بە هەڵەی بزانێت.**

**[التحرير والتنوير : 212/6]**

ووتم: کە دەڵێ: (ئەو موسڵمانەی کە لە شوێنەکەی ئەودا حوکمە شەرعیەکان کاریان پێ دەکرێ، ئەویش دەچێتە مەحکەمە ناشەرعیەکان بە ویستی خۆی، جا ئەم پابەند بوونە حوکمەکەی توندترە لە موخالەفە کردنی شەرع لە بابەتە لاوەکیەکان، بە تایبەتی گەر بێتو ئەم کارەی بۆ بە دەست هێنانی سودێکی دونیایی نەبێت) واتا گەر مەبەستی بە دەست هێنانی سودێکی دونیایی نەبێت بەڵکو مەبەستی تانەدان لە حوکمی شەرع و ڕازی نەبوون بێت پێی ئەوکات کوفرە، بەڵام گەر تەنها بۆ بەرژەوەندی دونیایی بێت حوکمەکەی سوکترە، ئەمە لەکاتێکدا ئەو موسڵمانە مەحکەمە شەرعیەکان هەیە لە ووڵاتەکەیدا، ئەی چ جای ئەوەی هیچ مەحکەمەیەکی شەرعی بوونی نەبێت ؟!

دواتر ووتی: (وە گەورەتریش لەمە ئەوەیە دەسەڵاتداران خەڵکی پابەند بکەن بە حوکم کردن بە غەیری ئەوەی الله دایبەزاندووە، ئەمەش پلەی جیاوازی هەیە، هەیانە هەڵگەڕانەوە لە دینی لێ دەکەوێتەوە گەر بە سوک سەیری حوکمی الله بکات یان بە هەڵەی بزانێت) واتا گەر خەڵکیش پابەند بکات بە حوکم نەکردن بە شەرع ئەوا هەر بە ڕەهایی کوفر نیە، بەڵکو پلەی جیاوازی هەیە، وە دەگات بە کوفریش گەر بە سوک سەیری شەرعی الله بکات.

**جمال الدين الحبيشي الوصابي** دەڵێ:
یەکێک لە جۆرەکانی فەرامۆش کردنی حوکمی الله تعالی ئەوەیە کەسێک بە هاوڕێکەی بڵێ: لەنێوان من و تۆدا ووتەی الله یان ووتەی پێغەمبەری الله ﷺ یان ووتەی حاکمی موسڵمانان حاکمە، کەسی بەرامبەریش پێی بڵێ: ئەمەم قبوڵ نیە، بە دەم ئەمەوە ناچم، **خاوەنی ئەم ووتەیە فاسقە بە ئیجماع، بە یەکێک لە فاجرەکان دادەنرێت، بەڵکو کافرە گەر بەم ووتەیە مەبەستی سوک سەیر کردنی شەریعەتی پاک بێت.**

**[نشر طي التعريف في فضل حملة العلم الشريف : لاپەرە 67]**

**عبدالله بن محمد بن عبدالوهاب:**
**پرسیاری لێ دەکرێ: ئایا حوکم بردنەوە بۆ غەیری کتێبی الله جائیزە ؟**
**وەڵامی دایەوە: ئەمە جائیز نیە، وە هەرکەسێک بڕوای وابێت حەلالە ئەوا کافر بووە**، ئەمە لە گەورەترینی کارە خراپەکانە، وە پێویستە لەسەر هەموو موسڵمانێک سەرزەنشتی ئەو کەسە بکات کە ئەم کارە دەکات، وە هەر کەسێک کەمترین زانستی هەبێت ئەوا گومانی لەمە نیە.

**[الدرر السنية : 252/10]**

ووتم: بڕوانە کوڕەکەی شێخ محمد بن عبدالوهاب دەڵێ: (حوکم بردنەوە بۆ غەیری قورئان جائیز نیە، ئەوەی بە حەلالی بزانێت کافرە). جا گەر خودی حوکم بردنەوە بۆ غەیری قورئان بە ڕەهایی کوفر بوایە بەبێ هیچ بەند و مەرجێک ئەوا پێویستی نەدەکرد باسی حەلال کردن بکات، دەست بەجێ دەیووت کوفرە.

**ابن القيم** (باسی قبوڵ کردنی شایەتیدانی ڕافیزی و قەدەری و جەهمی و غولاتی مورجیئە دەکات و دەیانکات بە چەند بەشێک) دەڵێ:

بەشی سێیەم: پرسیار دەکات و بە دوای هیدایەت دەگەڕێ و هیدایەتی بۆ ڕوون دەبێتەوە، بەڵام وازی لێدەهێنێت لەبەر تەقلید و دەمارگیری، یان لەبەر ڕق لێبوونەوە و دژایەتیکردنی ئەو کەسانەی لەسەر هیدایەتەکەن، جا ئەمە کەمترین پلەی ئەوەیە کە فاسق بێت، وە تەکفیر کردنی جێگای ئیجتیهاد و تەفصیلە، جا گەر بیدعەکەی ئاشکرا بکات و بانگەشەی بۆ بکات ئەوا شایەتیدان و فەتوا و حوکمەکانی ڕەت دەکرێتەوە گەر توانای ڕەت کردنەوە هەبوو، **وە شایەتیدان و فەتوا و حوکمی لێ قبوڵ ناکرێت تەنها لەکاتی زەرورەتدا نەبێ، لە حاڵێکدا ئەم جۆرە کەسانە زاڵ بن و دەست بگرن بەسەر دەسەڵات، وە قازی و موفتی و شایەت لە خۆیان بێت، جا لە ڕەت کردنەوەی شایەتیدانیان و حوکمەکانیان فەسادێکی زۆر هەیە، ئەمەش ناکرێ، بۆیە قبوڵ دەکرێت بۆ زەرورەت.**

بڕوانە [الطرق الحكمية في السياسة الشرعية : 1/464-465]

ووتم: ووتەکانی چەندە نزیکن لە واقعی ئەمڕۆماندا کە لە تەواوی ووڵاتان لە زۆربەی بابەتەکان حاکمەکان حوکم بە غەیری شەرعی الله دەکەن و خۆیان دەسەڵاتدارن و هەموو شتێکیان بە دەستە، جا وەک ابن القیم ووتی گەر حوکمی ئەمانە ڕەت بکرێتەوە لە حاڵێکدا هیچ حاکمێک نیە جگە لەم حاکمانە ئەوا فەسادێکی زۆر گەورە ڕوو دەدات، موسڵمانان حەقێکی زۆریان دەفەوتێ جا بۆیە لەبەر زەرورەت حوکمەکانیان قبوڵ دەکرێت، وە ئەگەر حوکمەکە موافقی شەرع بوو ئەوا زۆر چاکە ئەوەی موسڵمان دەیەوێت بە دەستی دێنێت، ژمارەیەکی زۆریش لە یاساکان لە بابەتەکانی زوڵم کردن موافقی شەرعە لەم ڕووەدا کە کێ

تاوانبار و زاڵمە، وە کێ مەزڵومە، بۆ نموونە کە دزی لە کەسێک دەکرێ یان فێڵی لێ دەکرێ یان حەقی دەخورێ یان هێرش دەکرێتە سەر گیان و ناموسی ئەوا لە یاسای زۆربەی ووڵاتاندا کەسی دەست درێژی کەر بە تاوانبار و زاڵم دادەنرێت دەبێت حەقەکەی لێ بسەندرێتەوە، ئەمەش لەم ڕووەدا موافقی شەرعە بەڵام لە سەپاندنی سزاکان بەسەر کەسی تاوانباردا زۆربەی جار سزاکە پێچەوانەی شەرعە، جا زۆربەی کێشەی موسڵمانانیش لەمڕۆدا ئەم جۆرە بابەتانەن دزیان لێ دەکرێت و حەقیان دەخورێت و زوڵمیان لێ دەکرێت یان توشی ڕووداوێک دەبن کە لایەنی بەرامبەر ئامادە نیە بە شەرع لەنێوان خۆیاندا حوکم بکەن، جا موسڵمانان بۆ داوا کردنی حەقەکەیان حوکم دەبەنەوە بۆ لای یاسا دانراوەکان، گەر حەقەکەی خۆی وەرگرێتەوە ئەوا مەبەستێکی شەرعی هاتۆتە دی، وە ئەگەر سزاکانیان پێچەوانەی شەرع بوو ئەوا موسڵمان تەنها بۆ وەرگرتنەوەی حەقەکەی ڕۆیشتووە بۆ لایان نەک بۆ سەپاندنی ئەم سزایە، لە ئیسلامیشدا کە کەسێک زوڵمی لێ دەکرێ دوو ئامانج شەرعی هەیە، یەکەمیان وەرگرتنەوەی حەقەکە لە زاڵم و گەڕاندنەوەی بۆ مەزڵوم، دووەمیان سزادانی زاڵمەکە، جا بە حوکم بردنەوە بۆ یاسا دانراوەکان ئامانجی یەکەم دێتە دی کە وەرگرتنەوە و گێڕانەوەی حەقەکەیە، کە ئامانجی موسڵمانەکە تەنها ئەمەیە، سەبارەت بە سزاکەش ئەوا زاڵمەکە سزا دەدرێت ئامانجی دووەمیش دێتە دی بەڵام سزاکە پێچەوانەی شەرعە، لە شەرعدا دز دەستی دەبڕدرێت، بەڵام یاسا دەستی نابڕێت بەندی دەکات، جا موسڵمان لەم سزایە بەریە و قبوڵی نیە و پێی ڕازی نیە، تەنها بە دەست بڕین ڕازیە بەڵام هیچ دەسەڵاتێکی نیە بۆ جێبەجێ کردنی، جا گەر بێتو لەبەر سزاکە بڵێین کەس حوکم نەباتەوە بۆ لای یاسا، ئەوا وەک ابن القیم باسی کرد فەسادێکی گەورەیە تەنانەت خەڵکانێک دەکەونە گیانی موسڵمانانەوە بە ئارەزووی خۆیان زوڵمیان لێ دەکەن چونکە دەزانن هەرچی بەرامبەریان بکرێت حوکم نابەنەوە بۆ لای یاسا، گەر حوکمی شەرع بخەیتە ڕوو بۆ کەسی زاڵم ئەوا ڕەنگە گاڵتەت پێ بکات، گەر بڵێی خۆم دەڕۆم بە زۆر لێی دەستێنم بە زەبری هێز ڕەنگە سکاڵات لە دژت تۆمار بکات بڵێ هێرشی کردۆتە سەرم، ئەوکات یاسا لە دژت دەوەستێت

و سزات دەدات، یان زۆرجار کەسی تاوانبار بە نهێنی کارەکە ئەنجام دەدات، بەبێ گەڕانەوە بۆ لای حکومەت ئەستەمە شوێنەواری تاوانبارەکە بدۆزیتەوە، بۆ نموونە ئۆتۆمبێلێکت لێ دەدزرێت، کاتێک سکاڵا تۆمار دەکەیت ناوی ئۆتۆمبێلەکە و ژمارەکەی دەدرێت بە هەموو بازگەیەک هەر چۆن جووڵە بە ئۆتۆمبێلەکە بکات ئاشکرا دەبێت، یان هەرزەکارێک بە خێرایی ئۆتۆمبێل لێدەخورێت لە منداڵەکەت دەدات و دەیکوژرێت و ڕادەکات، بەبێ گەڕانەوە بۆ لای حکومەت ئەستەمە بتوانیت بیدۆزیتەوە، دەکرێ بووترێ لەبەر ئەوەی حکومەت بە پێی شەرع سزای نادات ئەوا دەبێت وازی لێ بهێنیت بۆت نیە سکاڵا تۆمار بکەیت و بە دوای سۆراغی شۆفێرەکەوە بیت ؟!

ئەمە و دەیان نموونەی تر کە بەبێ گەڕانەوە بۆ لایان ئەستەمە بتوانی حەقەکەت وەربگریتەوە، تەنانەت ئەو نموونانەی باسم کرد تەنها داوا کردنەوەی حەقەکەی تێدایە لەلایەن کەسی مەزڵوم، ئەوەی تێدا نیە کە دوو لایەنی ناکۆک حوکم بەرنەوە بۆ لای حاکم و بڵێن حوکم بکە لەنێوانمان کامەمان حەقین و کامەمان ناحەقین، جا بۆیە حوکمەکەی سوکتریشە لە حوکمی ناکۆکی بردنەوە بۆ لایان، کە ئەویش بە مەرج دەبێتە کوفر.

جا لێرەدا مەبەست هاندانی خەڵک نیە بۆ حوکم بردنەوە بۆ لای یاسا و ئاسانکردنی کارەکە و ڕێگا خۆشکردن بۆیان، بەڵکو مەبەست دەرخستنی ئەو زیادەڕەویەیە کە کراوە لەم بابەتەدا کە وەک ابن القيم ووتی فەسادێکی زۆر بە دوای خۆی دێنێت، وە لە سەردەمی المأمون خەلیفەی عەباسی زۆرێک لە قازیەکان جەهمی بوون، لەگەڵ ئەوەشدا نەزانراوە زانایەک بڵێ ئەوەی داوای حەقی خۆی بکات لەم قازیە جەهمیانە ئەوا کافر بووە، هەرکەسێکیش ئاگاداری مەنهەجی سەلەف بێت ئەوا دەزانێت جەهمی کوفرەکەی پیستر و توندترە لە عەلمانی.

### ابن أبي زيد القيرواني دەڵێ:

لە المجموعة و کتێبی ابن سحنون هاتووە: **سحنون دەڵێ:** ئەگەر دوو کەسی ناکۆک

دوو پیاو بکەن بە حاکم لەنێوان خۆیاندا، جا یەکێکیان حوکمیان بکات و ئەوی تریان حوکمیان نەکات، ئەم حوکم کردنە دروست نیە، وە ئەگەر کەسێکی ناڕازی یان یان ئافرەتێک یان کۆیلەیەک کە خۆی دەکڕێتەوە لە خاوەنەکەی یان کۆیلەیەک **یان کافرێک بکەن بە حاکم ئەویش حوکم بکات لەنێوانیاندا، ئەوا حوکمەکەی باطلە.**

**ابن الماجشون-یش هەمان شتی ووتوە لە المجموعة.**

**[النوادر والزيادات : 85/8]**

ووتم: (المجموعة) کتێبی ابن عبدوس-ە، کتێبێکی مەزهەبی مالکیە.

**ابن أبي زيد القيرواني** دەڵێ:

**أشهب دەڵێ:** منداڵ و **نەصرانی** و کەسی عەقڵ ناتەواو و کەسی وەسواس، **حوکمی دروست نیە ئەگەرچی بپێکێت لە حوکمدا.**

**[النوادر والزيادات : 85/8]**

**ابن أبي زيد القيرواني** دەڵێ:

ابن حبيب دەڵێ: **مطرف و ابن الماجشون وتوویانە:** گەر دوو کەسە ناکۆکە ڕازی بوون بە حوکمی منداڵێک یان کەسێکی ناڕازی **یان نەصرانیەک، ئەویش حوکم بکات لەنێوانیان بە صەواب، ئەوا ئەم حوکمە هیچ یەکێک لە دوو کەسەکە پابەند ناکات.**

**[النوادر والزيادات : 86/8]**

**ابن أبي زيد القيرواني** دەڵێ:

**سحنون دەڵێ:** گەر ئافرەتێک بکەن بە حاکم لەنێوانیان یان پیاوێک کە دادپەروەر نەبێت یان کۆیلەیەک یان کۆیلەیەک کە خۆی دەکڕێتەوە لە خاوەنەکەی **یان کەسێکی ئەهلی ذیممە، جا ئەویش حوکم بکات لەنێوانیان، ئەوا ئەمە باطلە و جائیز نیە.**

**[النوادر والزيادات : 86/8]**

ووتم: گەر ئەم پرسیارە لە زیادەڕەوەکان کرابوایە یەکەم شت بیریان بۆ تەکفیرکردنی ئەو دوو کەسە ناکۆکە دەچوو کە کافریان کردۆتە حاکم لەنێوانیان، بەڵام زانا مالکیەکان تەنها باسی ئەوەیان کردووە حوکمی کافر باطلە و پێی پابەند نابن، گەر باسەکە بەم جۆرە بوایە کە زیادەڕەوەکان تێیگەیشتوون ئەوا دەست بەجێ ئایەتی (٦٥)ی سورەتی النساء دەخوێندەوە و تەکفیریان دەکردن، بەڵام ئەمەش مانای ئەوە نیە کە بڵێین ئاساییە کافر بکەن بە حاکم لەنێوانتان هیچ تاوانێکی تێدا نیە، بەڵکو مەبەستمان دەرخستنی زیادەڕەوییەکانە لێرەدا.

زۆرێک لە زیادەڕەوەکان لە بابەتی حوکم بردنەوە بۆ غەیری شەرعی الله و حوکم بردنەوە بۆ غەیری شەرعی الله ووتەکانی سلیمان بن سحمان دەکەن بە بەڵگە کە لە نامەی (بیان الطاغوت و وجوب اجتنابه) باسی دەکات، بەڵام وەک هەمیشە ووتەکانی دەقرتێنن و لە سیاقی خۆی دەری دێنن، بۆ مەبەستی خۆیان بەکاری دەهێنن کە دوورە لە مەبەستی سلیمان بن سحمان، ئەم نامەیە نزیکەی 10 لاپەرە دەبێت، لێرەدا بە بەشکراوی هەمووی نەقل دەکەین و بە جیا قسە لەسەر بەشەکانی دەکەین، تاکو ڕوون بێتەوە کە شێخ سلیمان قسە لەسەر چی دەکات و ووتەکانی دەربارەی چیە.

**سليمان بن سحمان** لە نامەی (بيان الطاغوت و وجوب اجتنابه) دەڵێ:

طاغوت سێ جۆرە: طاغوتی حوکم و طاغوتی عیبادەت و طاغوتی گوێڕایەڵی و شوێنکەوتن، **ئەوەی مەبەستە لەم پەڕاوەدا طاغوتی حوکمە، کە زۆرێک لەو کۆمەڵانەی خۆیان داوەتە پاڵ ئیسلام حوکم دەبەنەوە بۆ لای عادەتی باب و باپیرانیان، وە ناوی لێ دەنێن: (حەق بە شەرعی الرفاقة) وەک ئەوەی کە دەڵێن: (شرع عجمان) و (شرع قحطان) و جگە لەمانەش**، جا ئەمە خودی طاغوتە کە الله فرمانی پێکردووین بە خۆ پاراستنمان لێی، وە شيخ الإسلام ابن تيمية لە کتێبی (منهاج السنة النبوية) و ابن كثير لە تەفسیرەکەیدا باسیان کردووە کە هەرکەسێک ئەمە بکات ئەوا کافرە بە الله، ابن كثير ئەمەشی زیاد کردووە: واجبە شەڕی لە دژ بکرێت تا دەگەڕێتەوە بۆ حوکمی الله و پێغەمبەرەکەی.

**[الدرر السنية : 10/503-504]**

ووتم: لەم بەشەی کە نەقلمان کرد باسی ئەوەی کرد کە ئەم پەڕاوە دەربارەی طاغوتی حوکمە، کە زۆرێک لە خەڵکی سەردەمەکەی حوکم دەبەنەوە بۆ لای عادەتی باب و باپیرانیان، وە ناوی لێ دەنێن: (حەق بە شەرعی الرفاقة)، واتا عادەتی باب و باپیرانیان بە حەق دەزانن و ناویان لێی ناوە شەرع !!! جا ڕەحمەتی الله-ت لێبێ بزانە نامەکەی شێخ سليمان دەربارەی چیە و باسی چی دەکات، نەک پارچەیەک لە ووتەکانی دەربهێنێت لە سیاقی خۆیدا ئینجا بە دڵی خۆت لەگەڵ ئەو بابەتەی بگونجێنی کە دەتەوێ.

**سليمان بن سحمان** (ووتەکەی ابن تيمية نەقل دەکات) دەڵێ:

شيخ الإسلام دەڵێ: وە گومان لەوە دانیە هەرکەسێک بڕوای وانەبێت حوکم کردن

بەوەی الله دایبەزاندووە بەسەر پێغەمبەرەکەی واجبە ئەوا ئەم کەسە کافرە، **جا هەرکەسێک بە حەلالی بزانێت حوکم بکات لەنێوان خەڵکی بەوەی کە خۆی بە عەدلی دەزانێت بەبێ شوێنکەوتنی ئەوەی الله دایبەزاندووە، ئەوا ئەم کەسە کافرە**، هیچ ئوممەتێک نیە ئیللا فرمان دەکات بەوەی کە حوکم بە عەدل بکرێ، جا لەوانەیە عەدل لە دینی ئوممەتەکە ئەوە بێت کە گەورەکانیان بە عەدلی دەزانن، بەڵکو زۆرینەی ئەوانەی خۆیان داوەتە پاڵ ئیسلام حوکم بە عادەتەکانیان دەکەن کە الله سبحانه و تعالی داینەبەزاندووە، وەک عادەتی پێشینی دەشتەکیەکان، وەک فرمانی ئەوانەی کە گوێڕایەڵی دەکرێن لەناویاندا، **وە پێیان وایە ئەمە دەبێت حوکمی پێ بکرێ نەک قورئان و سوننەت، ئەمەش کوفرە**، زۆرێک لە خەڵکی موسڵمان بوونە بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا حوکم ناکەن تەنها بە عادەتە باوەکانی خۆیان نەبێ، ئەو عادەتانەی کە گوێڕایەڵی کراوەکان فرمانی پێ دەکەن، **جا ئەمانە گەر زانیان دروست نیە حوکم بکرێ تەنها بەوەی الله دایبەزاندووە، وە پابەند نەبوون پێیەوە بەڵکو بە حەلالیان زانی حوکم بکەن بە پێچەوانەی ئەوەی الله دایبەزاندووە، ئەوا ئەمانە کافرن**. ووتەکەی بە کۆتا هات.

**سلیمان بن سحمان دەڵێ:** ئەم ووتەیە کافر بوونی خودی حاکمەکەی تێدایە، وە ئەوانەش کە حوکم دەبەنە بۆ لای **بەو جۆرەی کە ابن تیمیة باسی کرد**، وە بە هەمان شێوە ئەوەی بڕوای بە واجب بوونی ئەوە نەبێت کە الله دایبەزاندووە ئەوا کافرە ئەگەرچی حاکم نەبێت و حوکمیش نەباتەوە بۆ لای حاکم، **جا بڕوانە ابن تیمیة ئەم ووتەیەی باس کرد لە کاتی هێنانی فەرمایشتی الله تعالی:** ﴿وَمَن لَّمۡ

يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾.

**[الدرر السنية : 10/504-505]**

ووتم: سلیمان بن سحمان دەڵێ: (ئەم ووتەیەی ابن تیمیة کافر بوونی خودی حاکمەکەی تێدایە، وە ئەوانەش کە حوکم دەبەنە بۆ لای، بەو جۆرەی کە ابن تیمیة باسی کرد).

بڕوانە ئەم ڕستەیەی کۆتایی (بەو جۆرەی کە ابن تیمیة باسی کرد) واتا ئەو مەرجانەی تێدا بێت کە باسی کرد ئەوکات تەکفیر دەکرێن، سلیمان بن سحمان لەم نامەیەدا وەک بەڵگە هێنانەوە ئەم ووتەیەی نەقل کردووە نەک بۆ ئەوەی ڕەخنەی لێ بگرێت و موخالەفەی بکات، جا کەواتە ئەمە مەزهەبی ئەویشە بۆیە ئاگاداری ووتەکانی بە، شتێکی مەدەرە پاڵ کە لێی بەری بێت.

لە کۆتاییدا سلیمان بن سحمان ئاگادارکردنەوەیەکی تریش دەدات و دەڵێ: بڕوانە ابن تیمیة ئەم شتانەی باسکرد لەکاتی هێنانی ئایەتی: ﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾ واتا مەزهەبی ابن تیمیة لەم ئایەتەدا بریتیە لە مەرجدارکردنی حەلال کردن بۆ تەکفیرکردنی کەسەکە.

**سلیمان بن سحمان** (ووتەکەی ابن کثیر نەقل دەکات) دەڵێ:

ابن کثیر رَحِمَهُ ٱللَّهُ لە فەرمایشتی الله تعالی: ﴿أَفَحُكۡمَ ٱلۡجَٰهِلِيَّةِ يَبۡغُونَۚ﴾ [المائدة: ٥٠]، دەڵێ: الله تعالی سەرزەنشتی ئەو کەسە دەکات کە دەرچووە لە حوکمی پتەوی الله کە هەموو خێرێکی لەخۆ گرتووە، نەهی دەکات لە هەموو خراپەیەک، چووە بەرەو شتانی تر لە ڕەئی و ئارەزوو و ڕێککەوتنەکان کە پیاوان دایانهێناوە بەبێ هیچ پاڵپشتێک لە شەریعەتی الله، هەروەک چۆن ئەهلی جاهیلی حوکمیان پێی دەکرد لە گومڕاییەکان و جەهلەکان کە بە ڕەئی و ئارەزووی خۆیان دایان دەهێنا، وە هەروەک چۆن مەغۆل

حوکمیان پێی دەکرد لە سیاسەتە پاشاییەکان کە لە پاشاکەیان جەنگیز خان وەریان گرتبوو، یاسقی بۆ دانان کە بریتیە لە کتێبێکی کۆکراوە لە ئەحکامەکان کە لە چەند شەریعەتێکی جیاواز وەری گرتووە، لە شەریعەتی یەهودی و نەصرانی و دینی ئیسلام، وە زۆر حوکمی تێدایە کە تەنها لە بیرورِا و ئارەزووی خۆی وەری گرتووە، **جا لەناو نەوەکانی بووە شەرعێک کە شوێنی دەکەوتن، پێشیان دەخست بەسەر حوکم کردن بە کتێبی الله و سوننەتی پێغەمبەرەکەی ﷺ، جا هەر کەسێک وابکات لەوان ئەوا کافرە**، واجبە شەڕی لە دژ بکرێت تا دەگەڕێتەوە بۆ حوکمی الله و پێغەمبەرەکەی، جگە لەم دووانە حوکم بە هیچی تر ناکات نە لە زۆر و نە لە کەم. ووتەکەی بە کۆتا هات.

**سلیمان بن سحمان دەڵێ: ئەوەی باسمان کرد لە عادەتی دەشتەکیەکان کە ناوی لێنراوە: (شرع الرفاقة) لە هەمان جۆرە**، هەر کەسێک ئەنجامی بدات ئەوا کافرە، واجبە شەڕی لە دژ بکرێت تا دەگەڕێتەوە بۆ حوکمی الله و پێغەمبەرەکەی، جگە لەم دووانە حوکم بە هیچی تر ناکات نە لە کەم و نە لە زۆر.

**[الدرر السنية : 505/10]**

ووتم: ابن کثیر ووتی: مەغۆل حوکم کردن بە یاسق پێش دەخەن بەسەر حوکم کردن بە قورئان و سوننەت، پێشی دەخەن واتا تەفزیلی دەکەن بەسەر قورئان و سوننەت، گەر پێش خستن تەنها مانای ئەوە بێت حوکمی پێدەکەن، ئەوا تەنها دەیووت حوکم دەکەن بە یاسق، ئەمەندە بەس بوو کە بزانین حوکم ناکەن بە قورئان و سوننەت، بەڵام کە دەڵێ: پێشی دەخەن بەسەر قورئان و سوننەت، واتا تەفزیلی دەکەن بەسەر قورئان و سوننەت، کاتێک بە کەسێک دەووترێ: ئاو دەخۆیتەوە یان شیر، ئەویش دەڵێ: ئاو، ئیتر زانیمان ئاوەکەی

هەڵبژارد و شیرەکەی هەڵنەبژارد، بەڵام کە دەووترێ: ئاوەکەی پێش خست بەسەر شیرەکەدا، لێرەدا ئەمە وەصفێکی زیاترە و مانایەکی زیاتر دەبەخشێت، جا ناکرێت (پێش خستن) هیچ مانایەکی نەبێت تەنها مەبەست پێی ئەوە بێت ئاوەکەی هەڵبژارد.

وە ابن کثیر لە شوێنی تریش باسی (پێش خستن) دەکات نەک تەنها لێرەدا، بۆ نموونە بڕوانە: [تفسیر ابن کثیر : 113/3] ، [تفسیر ابن کثیر : 329/3-330] کە هەردووک ووتەمان نەقل کردووە لەم کتێبەدا، بگەڕێوە سەری تاکو تێبگەیت.

جا سلیمان بن سحمان دوای نەقل کردنی ووتەکەی ابن کثیر، پاشان ووتی: عادەتی دەشتەکیەکان کە ناوی لێنراوە (شرع الرفاقة) هەمان جۆرە.

هەمان جۆرە مانای چیە ؟ واتا ابن کثیر جۆرێکی باسکردووە بۆیە دەڵێ هەمان جۆرە، جۆرەکەش ئەوە بوو کە یاسقی جەنگیز خانیان پێش دەخست بە قورئان و سوننەتدا.

هەروەها حمد بن عتیق کە پێشتر ووتەکەیمان نەقل کرد ئەویش هەمان ئەم ووتەیەی ابن کثیر نەقل دەکات پاشان دەڵێ: عادەتی دەشتەکیەکان کە ناویان لێناوە (شرع الرفاقة) هەمان شێوەی یاسقی جەنگیز خانە، پێشی دەخەن بەسەر قورئان و سوننەتدا.

## سلیمان بن سحمان دەڵێ:

الله تعالى فەرموویەتی: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُمْ ءَامَنُوا۟ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ يُرِيدُونَ أَن يَتَحَاكَمُوٓا۟ إِلَى ٱلطَّٰغُوتِ وَقَدْ أُمِرُوٓا۟ أَن يَكْفُرُوا۟ بِهِۦ﴾ تا کۆتایی ئایەتەکە، تا دەگات بە فەرمایشتی: ﴿لَهُمْ تَعَالَوْا۟ إِلَىٰ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ وَإِلَى ٱلرَّسُولِ رَأَيْتَ ٱلْمُنَٰفِقِينَ يَصُدُّونَ عَنكَ صُدُودًا﴾ [النساء: ٦٠-٦١].

الشعبي دەڵێ: لەنێوان پیاوێکی یەهود و پیاوێکی مونافیق ناکۆکی هەبوو، یەهودییەکە ووتی: حوکم دەبەینەوە بۆ لای محمد ﷺ، زانی پێغەمبەر بەرتیل وەرناگرێ و زوڵم ناکات لە حوکمدا، وە مونافیقەکە ووتی: حوکم دەبەینەوە بۆ لای یەهود، دەیزانی

یەهود بەرتیل وەردەگرن و زوڵم دەکەن لە حوکمدا، پاشان ڕێککەوتن کە بچن بۆ لای کاهینێک لە (جهينة) حوکم بەرنەوە بۆ لای ئەو، جا ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ يَزۡعُمُونَ﴾ تا کۆتایی ئایەتەکە.

وە ووتراوە دەربارەی دوو پیاو دابەزی کە ناکۆک بوون، یەکێکیان ووتی: دەچین بۆ لای محمد ﷺ، ئەوی تریان ووتی: دەچین بۆ لای كعب بن الأشرف، پاشان حوکمیان بردەوە بۆ لای عمر بن الخطاب، جا یەکێکیان چیرۆکەکەی بۆ عمر باسکرد، عمر بەوەیانی ووت **کە بە پێغەمبەری الله ﷺ ڕازی نەبوو، ئایا وایە بە حوکمی پێغەمبەر ڕازی نەبوویت ؟ ووتی: بەڵێ**، جا عمر بە شمشێرلێی دا و کوشتی، ئینجا ئایەتەکە دابەزی.

جا پێویستە ئاوا بکرێ لەو کەسانەی کە حوکم بۆ لای طاغوتەکان دەبەنەوە، جا ئەگەر ئەم خەلیفە ڕاشیدە ئەم پیاوە بکوژێ تەنها لەبەر ئەوەی داوای کردووە حوکم بەرنەوە بۆ لای طاغوت، **جا هەر کەسێک ئەمە عادەتی بێت و لەسەری بێت، ڕازی نەبێت بۆ خۆی و بۆ هاوشێوەکانی جگە لەمە، ئەوا حەقترە و لە پێشترە بکوژرێ بەهۆی هەڵگەڕانەوەی لە ئیسلام و فەسادیەکەی لە زەوی بە گشتی.**

**[الدرر السنية : 10/506-507]**

ووتم: کە دەڵێ: (عمر ئەم پیاوەی کوشت تەنها لەبەر ئەوەی کە داوای کردووە حوکم بەرنەوە بۆ لای طاغوت) ئەم ووتەیە جێگای تێڕامانە چونکە هەر خۆی نەقلی دەکات کە مونافیقەکە ووتویەتی ڕازی نیم بە حوکمی پێغەمبەر، بۆیە عمر کوشتویەتی، ئەوەی سليمان بن سحمان نەقلی کرد هیچ شتێکی لەم جۆرەی تێدا نیە کە ئەو باسی دەکات ! تەنانەت خودی ووتەکانی خۆی کە پێشتر نەقلمان کرد بە مەرج حوکم بردنەوە بۆ لای غەیری شەرعی الله دەکات بە

کوفر نەک بە ڕەهایی.
ئەمەش ووتەی سلیمان بن سحمان-ە لە کتێبی (کشف غیاهب الظلام) کە پێشتر نەقلمان کرد: (بەڵام پێویستە بزانرێ ئەوەی حوکم بەرێتەوە بۆ لای طاغوت یان حوکم بکات بە غەیری ئەوەی الله دایبەزاندووە، وە بڕوای وابێت حوکمی ئەوان تەواوتر و باشترە لە حوکمی الله و پێغەمبەرەکەی، ئەمەیان دەبێتە کوفری اعتقادی کە لە دین دەرخەرە، هەروەک باسکراوە لە 10 هەڵوەشێنەرەوەکەی ئیسلام، بەڵام ئەوەی بڕوای وانەبێت بەڵام حوکم بەرێتەوە بۆ لای طاغوت، وە بڕوای وایە حوکمی طاغوت باطلە، ئەمەیان کوفری عەمەلیە).
هەروەها پێشتر لە سلیمان بن سحمان نەقلمان کرد کە لە کتێبی (مجموعة الرسائل والمسائل النجدية) دەڵێ: (گەر حوکم کردن بە غەیری ئەوەی الله دایبەزاندووە بە حەلال بزانێ، وە پێی وابێ حوکمی طاغوت باشترە لە حوکمی الله، وە ئەو کەسانەی لە شارەکان دەژین هیچ نازانن جگە لە حوکمەکانی میرات، وە ئەوەی دەشتەکیەکان لەسەری دەڕۆن لە حوکمی پێشینانیان و عادەتەکانیان ئەوەیان حەقە، هەر کەسێک ئەم بڕوایەی هەبێت ئەوا کافرە، بەڵام ئەو کەسەی ئەمە بە حەلال نەزانێ، وە پێی وایە حوکمی طاغوت باطلە، وە حوکمی الله و پێغەمبەرەکەی حەقن، ئەوا ئەم کەسە کافر نابێت و لە ئیسلام ناچێتە دەرەوە).

**سلیمان بن سحمان** دەڵێ:

وە بزانە: هیچ بانگ کەرێک بانگی خەڵکی نەکردووە بۆ حەق ئیللا شەیتان گومانی دروست کردووە بۆ ئەم کارە بۆ ئەوەی خەڵکی لێ هەڵگەڕێنێتەوە، نموونەش لەمە: گەر بێتو بە ئەهلی طاغوت بووترێ: بگەڕێنەوە بۆ حوکمی الله و پێغەمبەرەکەی، واز لە حوکمی طاغوتان بهێنن، **دەڵێن: ئێمە حوکم نابەینەوە بۆ لای طاغوتەکان تەنها لەبەر ئەوە نەبێت کە دەترسین هەندێکمان هەندێکی ترمان بکوژن، من گەر هاوڕای هاوڕێکەم نەبم لە حوکم بردنەوە بۆ (شرع الرفاقة) دەمکوژێ**

**یان من دەیکوژم.**

لە وەڵامدا دەڵێین: پوچی ئەم گومانە شەیتانیە بە سێ پلە دەردەکەوێ:

پلەی یەکەم: ئەو فەسادەی کە لە زەویدا ڕوویداوە لە کوشتنی خەڵک و تاڵان بردنی ماڵ و سامان، ئەوا بەهۆی فەرامۆش کردنی فرمانەکانی الله بووە و ئەنجام دانی نەهیەکانی بووە، هەروەک الله تعالی فەرموویەتی: ﴿ظَهَرَ ٱلْفَسَادُ فِي ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ بِمَا كَسَبَتْ أَيْدِي﴾ [الروم: ٤١]، موفەسیرەکانی سەلەف وتوویانە: (البر) خەڵکی دەشتن، وە (البحر) خەڵکی دێهات و شارەکانن.

الله تعالی هەواڵیدا کە دەرکەوتنی فەساد لە دەشت و شارەکاندا بەهۆی کردەوەی خەڵکەوەیە، گەر پەروەردگاریان بپەرستن و حوکم بەرنەوە بۆ لای پێغەمبەرەکەی ئەوا حاڵیان چاک دەبێت و ماڵ و سامان و ژمارەیان گەشە دەکات، ... (پاشان دەڵێ) جا کاتێک ئیسلام غەریب بوویەوە وەکو سەرەتای دەست پێکردنی، ئەوانەی جاهیلن بە ئیسلام بڕوایان وایە ئەوەی هۆکاری ڕەحمەتە دەبێتە هۆکاری سزا، وە ئەوەی هۆکاری تەبایی و یەک گرتنەوە دەبێتە هۆی دووبەرەکی و خیلاف، وە ئەوەی خوێنی پێ دەپارێزرێ دەبێتە هۆی ڕژاندنی خوێن، ... (پاشان دەڵێ) **هەرکەسێک بڕوای وابێت کە حوکم کردن بە شەریعەتی ئیسلام سەردەکێشێت بۆ کوشتن و ناکۆکی، وە تەبایی و یەک گرتن ڕوو نادات تەنها بە حوکمی طاغوت نەبێ، ئەوا ئەم کەسە کافرە دوژمنی الله و هەموو پێغەمبەرانە**، ئەمە هەمان ئەو شتەیە کە کافرانی قوڕەیش لەسەری بوون، کە بڕوایان وابوو صەواب ئەوەیە کە باب و باپیرانیان لەسەری بوونە نەک ئەوەی الله پێغەمبەرەکەی پێ ناردووە ﷺ.

پلەی دووەم: ئەوەیە کە بووترێ: کە زانیت حوکم بردنەوە بۆ لای طاغوت کوفرە، الله

تعالی لە کتێبەکەی باسی کردووە کە کوفر گەورەترە لە کوشتن، فەرمووی: ﴿وَٱلۡفِتۡنَةُ أَكۡبَرُ مِنَ ٱلۡقَتۡلِۗ﴾ [البقرة: ٢١٧]، وە فەرموویەتی: ﴿وَٱلۡفِتۡنَةُ أَشَدُّ مِنَ ٱلۡقَتۡلِۚ﴾ [البقرة: ١٩١]، وە فیتنەش بریتیە لە کوفر، **جا گەر دەشت و شارەکان شەڕ بکەن تاکو لەناو دەچن ئەوا سوکترە لەوەی لە زەویدا طاغوتێک دابنێن کە حوکم بکات بە پێچەوانەی شەریعەتی ئیسلام کە الله پێغەمبەرەکەی پێ ناردووە ﷺ.**

پلەی سێیەم: ئەوەیە کە بڵێین: **گەر ئەم حوکم بردنەوەیە کوفر بێت**، وە ناکۆکیش لە پێناوی دونیا بێت، جا چۆن دەکرێت کوفر بکەیت لە پێناوی ئەمە ؟ مرۆڤ ئیمان ناهێنێت تاکو الله و پێغەمبەرەکەی خۆشەویشتر دەبن لەلای لە هەموو شتێکی تر جگە لەوان، وە تاکو پێغەمبەر لەلای خۆشەویستر دەبێت لە منداڵی و لە باوکی و لە هەموو خەڵکی، جا گەر هەموو دونیات لێ بڕوات ئەوا بۆت جائیز نیە حوکم ببەیتەوە بۆ لای طاغوت لە پێناوی دونیا، ئەگەرچی کەسێک ناچارت بکات و سەرپشکت بکات لەنێوان ئەوەی حوکم بەریتەوە بۆ لای طاغوت یان دونیات لە دەست بدەیت، ئەوا واجبە لەسەرت کە دونیات لە دەست بدەیت، وە بۆت جائیز نیە حوکم ببەیتەوە بۆ لای طاغوت.

**بڕوانە [الدرر السنية : 10/508-511]**

ووتم: سەرەتا باسمان کرد کە ئەم نامەیە دەربارەی دەشتەکیەکانە کە حوکم دەبەنەوە بۆ عادەتەکانیان و ناوی لێدەنێن (حەق بە شەرعی الرفاقة) هەروەها پێشی دەخەن بەسەر حوکمی قورئان و سوننەتدا، جا ووتەکانی سليمان بن سحمان دەربارەی ئەم حوکم بردنەوەیە بۆیە لێرەدا بە کوفر ناوی دەبات بەبێ مەرجی حەلال کردن و تەفزیل کردن چونکە ئەم دوو مەرجە لەناو دەشتەکیەکان بوونی هەیە هەروەک خۆی باسیکرد، تەنانەت وەڵامی ئەو

گومانەی دەشتەکیەکانیشی دایەوە کە دەڵێن گەر حوکم بکەین بە قورئان و سوننەت ئاوا ناکۆکی و کوشتار ڕوودەدات لەنێوانمان، بەڵام گەر حوکم بکەین بە عادەتەکانمان ئەوا تەبا دەبین، کە خودی ئەم ووتەیە کوفرە و بێ ڕێزی کردنە بەرامبەر شەرعی الله هەروەک باسیکرد، جا کاتێک سلیمان بن سحمان لە پلەی سێیەم دەڵێ: (ئەم حوکم بردنەوەیە کوفرە) ئەوا باسی شتێکی دیاریکراو دەکات کە پێشتر باسی کردووە ئەویش حوکم بردنەوەی دەشتەکیەکانە بۆ عادەتەکانیان بەوپەڕی تەعزیم کردنەوە، ئەگینا مەحاڵە زانایەکی وەک سلیمان بن سحمان بڵێ: ناچارت بکەن لەنێوان حوکم بردنەوە بۆ لای طاغوت یان لە دەستدانی دونیات ئەوا دەبێت لە دەستدانی دونیا هەڵبژێری و بۆت نیە حوکم بەریتەوە بۆ لای طاغوت بەم حوکم بردنەوەیە کافر دەبیت ! لە کاتێکدا هەر خۆی ووتی ئەوەی حوکم بباتەوە بۆ لای طاغوت و حوکمی طاغوت بە باطل بزانێ ئەوا کافر نابێت، تەنانەت ئەو حاکمەی کە حوکم بە غەیری قورئان و سوننەت دەکات بە مەرجی حەلال کردن و تەفزیل کردن تەکفیری دەکات، ئەی چۆن موسڵمانێکی داماو کە تەنها بۆ وەرگرتنەوەی حەقەکەی چۆتە لایان و لێیان بەرییە و جگە لە شەرعی الله بە هیچ شتێکی تر ڕازی نیە، بەڵام هیچ ڕێگایەکی نیە بۆ وەرگرتنەوەی حەقەکەی جگە لە حوکم بردنەوە بۆ یاساکان، چۆن تەکفیر دەکرێت ؟!

سەبارەت بەوەش کە دەڵێ: (گەر خەڵکی دەشت و شار شەڕ بکەن تا هەموویان لەناو دەچن باشترە لەوەی طاغوتێک دابنێن لە زەویدا کە حوکم بکات بە غەیری شەرعی الله).

بەڵێ بێگومان ئەمە ڕاستە، گیان و ماڵت لە دەست بدەیت باشترە لەوەی بە دەستی خۆت طاغوتێک دابنێیت بەسەر سەرتەوە تاکو حوکمت بکات بە غەیری شەرعی الله، هاوشێوەی ئەو دەنگدەرانەی کە بە دەستی خۆیان طاغوتان هەڵدەبژێرن، جا خودی ئەم ووتەیە مانای ئەوە دەدات کە دەشتەکیەکان بە دەستی خۆیان ئەم کارەیان کردووە و دەگەڕێنەوە بۆ عادەتەکانیان و تەعزیمیان کردووە، نەک کەسێکی دەسەڵاتدار بە زۆر بەسەریاندا بسەپێنێ. یەکێک لە معاصرین ووتەی هەندێک لە هۆزەکان نەقل دەکات دەربارەی عادەتەکانیان کە حوکمی پێ دەکەن دەڵێ: هەندێکیانم بەخۆم بیستووە و هەندێکیان کەسانی سیقە بۆیان

نەقل کردووم، یەکێکیان دەڵێ: دەست دەگرم بە عادەتی باب و باپیرانم ئەگەرچی بچمە دۆزەخەوە، یەکێکیان دەڵێ: فەرع باشترە لە شەرع، مەبەستی لە (فەرع) ئەو یاسایانەیە کە هۆزەکان حوکمی پێ دەکەن، یەکێکیان دەڵێ: شەرع ئینصافی نیە بەرامبەرمان، یەکێکیان دەڵێ: شەرع عادەت و تەقالیدی ئێمە نازانێت.

جا ئەمە حاڵی دەشتەکیەکانە کە بەم جۆرە تەعزیمی عادەتەکانیان دەکەن و بێ ڕێزی دەکەن بەرامبەر شەرعی الله، بۆیە زانایانی نەجد هێندە توند بوونە لە فەتواکانیان دەربارەی ئەمانە، وە پێشتریش ووتەی شێخ عبداللطیف-مان نەقل کرد کە چی دەڵێ دەربارەی حوکم کردن و حوکم بردنەوە بۆ غەیری شەرعی الله، بە گرنگی دەزانم لێرەدا ووتەکەی دووبارە بکەمەوە.

عبداللطيف بن عبدالرحمن بن حسن دەڵێ:

**حوکم بردنەوە حەڕامە گەر بۆ لای شەریعەتێکی باطل بێت پێچەوانەی قورئان و سوننەت بێت، وەک حوکمەکانی یۆنان و ئەورووپا و مەغۆلەکان، وە یاساکانیان کە سەرچاوەکەی بریتیە لە ڕەئی و ئارەزووەکانیان، وە بە هەمان شێوە عادەتی پێشینی دەشتەکیەکان و عادەتە باوەکانیان، جا هەر کەسێک بە حەلالی بزانێت حوکم بەمە بکات لە بابەتی خوێن و جگە لەویش ئەوا کافرە، الله تعالى فەرموویەتی:** ﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾ **ئەم ئایەتە هەندێک لە زانایانی تەفسیر باسیان کردووە کە کوفر لەم ئایەتە مەبەست پێی کوفری گەورە نیە، چونکە تێگەیشتوون گەر بووترێ کوفری گەورەیە ئەوکات ئەو کەسەش دەگرێتەوە کە حوکم بە غەیری ئەوە دەکات کە الله دایبەزاندووە و بە حەلالیشی نازانێت، بەڵام زانایانی تەفسیر خیلافیان**

**لەوە نیە ئایەتەکە ئەو کەسە دەگرێتەوە کە حوکم نەکردن بە قورئان بە حەلاڵ دەزانێت، وە کوفرەکەی لە دین دەرخەرە.**

**[منهاج التأسیس والتقدیس : لاپەرە 71]**

**ابن کثیر** دەڵێ:

هەر کەسێک واز بهێنێت لە شەرعی پتەوی دابەزێنراو بەسەر محمد بن عبداللّه کۆتای پێغەمبەران، وە حوکم بەرێتەوە بۆ غەیری ئەو لە شەریعەتە نەسخ بووەکان ئەوا کافر بووە، چ جای ئەو کەسەی کە حوکم دەباتەوە بۆ لای **الیاساق و پێشی دەخات بەسەر شەریعەتی اللّه ؟! ئەوەی ئەم کارە بکات کافر بووە بە ئیجماعی موسڵمانان**، اللّه تعالی فەرموویەتی: ﴿أَفَحُكۡمَ ٱلۡجَٰهِلِيَّةِ يَبۡغُونَۚ﴾ وە فەرموویەتی: ﴿فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤۡمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيۡنَهُمۡ ثُمَّ لَا يَجِدُواْ فِيٓ أَنفُسِهِمۡ حَرَجٗا مِّمَّا قَضَيۡتَ وَيُسَلِّمُواْ تَسۡلِيمٗا﴾.

**[البدایة والنهایة : 17/162-163]**

ووتم: گومانێکی تری زیادەڕەوەکان ئەم ووتەیەی ابن کثیر-ە، دەووترێ: ئەوەتا ابن کثیر دەڵێ: (ئەوەی حوکم بەرێتە بۆ شەریعەتە نەسخ بووەکان وەک دینی یەهود و نەصارا کافرە) تەنها بە حوکم پێکردن و حوکم بردنەوە بۆی کافر دەبێت، بەبێ هیچ مەرجێک لەو مەرجانەی کە باس دەکرێن، ئەی چ جای ئەو کەسەی حوکم دەباتەوە بۆ یاسقی جەنگیز خان و پێشی دەخات بەسەر شەریعەتی اللّه، بە ئیجماع کافرە.

لە وەڵامدا دەڵێین: ابن کثیر لە بابەتی حوکم نەکردن بە قورئان لەسەر مەنهەجی سەلەف ڕۆیشتووە، ووتەکانی سەلەفی نەقل کردووە و لێی لانەداوە هەروەک پێشتر

ووتەکانیمان نەقل کرد، زانینی ئەمە گرنگە لە ڕەتدانەوەی هەر گومانێک کە بەهۆی ووتەی موتەشابیهی زانایەکەوە دروست کرا بێت، سەرەتا مەنهەجی زاناکە دیراسە بکرێ لەم بابەتەدا، کە زانیمان لە هەموو شوێنەکاندا بەیەک جۆر باسی دەکات، تەنها لەیەک شوێندا بە جۆرێکی تر باسی دەکات، ئەوا یان ووتەکە موتەشابیهە، وە یان ئەم ووتەیەش وەک ئەوانی ترە بەڵام وورد بوونەوەی دەوێت تاکو تێی دەگەیت و لات ڕوون دەبێتەوە.

کەواتە زانیمان ابن كثير لە تەفسیرەکەیدا لەسەر مەنهەجی سەلەف ڕۆیشتووە، لێرەدا ئەم ووتەیەی جێگای هەڵوەستە لەسەر کردنە کە دەڵێ: (حوکم بردنەوە بۆ لای شەریعەتە نەسخ بووەکان کوفرە) بەبێ ئەوەی هیچ مەرجێک باس بکات وەک حەلال کردن و تەفزیل کردن و ئینکار کردن و یەکسان کردن.

بە سێ خاڵ وەڵامی ئەم گومانە دەدەینەوە:

یەکەم: گریمان بڵێین ئەمە مەنهەجی ابن كثير-ە، ئەوا مەنهەجی سەلەف پێچەوانەیەتی جا هەر زانایەک موخالەفەی مەنهەجی سەلەف بکات شایستەی لۆمە کردنە نەک شوێنکەوتن.

دووەم: ئێوە بەڵگە بەم ووتەیەی ابن كثير دەهێننەوە، ئێمەش بەڵگە با ووتەکانی تری دەهێنینەوە کە پێشتر باسمان کرد، جا کامەی دەبێتە بەڵگە بەسەر کامەیەوە ؟ بۆیە دەست گرتن بە ووتەی موتەشابیهی تاکە زانایەکەوە هەرگیز ناتگەیەنێت بە ئەنجامێکی دڵنیاکەر، هەر کاتێک ووتەیەکی ئەوت هێنا ئەوا کەسانێک ژمارەیەک ووتەی تری ئەو دێنن و وەڵامت دەدەنەوە.

سێیەم: تاکو بواری کۆکردنەوە و گونجاندنی ووتەکان هەبێت ئەوا ئەنجامی دەدەین نەک ووتەکانی زانایەک بهێنین بەیەکتری دابدەین، تۆمەتی ناڕوونی مەنهەج بدەینە پاڵ زاناکە.

جا ابن كثير کە دەڵێ: ئەوەی واز بهێنێت لەو شەریعەتەی کە بەسەر محمد ﷺ دابەزیوە، حوکم بەرێتەوە بۆ شەریعەتە نەسخ بووەکان ئەوا کافرە، مەبەستی ئەو کەسانەیە کە وەک

شەرع و دینی الله حوکمی بۆ دەبەنەوە نەک وەک یاسایەکی دانراو، واتا دەڵێن: تەوراتیش کتێبی الله-یە با حوکمی پێ بکەین یان حوکمی بۆ ببەینەوە، ئینجیلیش کتێبی الله-یە بە هەمان شێوە، جا واز هێنان لە شەرعێکی موحکەم و حوکم بردنەوە بۆ شەرعێکی مەنسوخ ئەوا بێگومان کوفرە چونکە کەسی حوکم کەر یان حوکم بەرەوە وەک شەرعی الله حوکمی پێ دەکات بە دروست و پیرۆزی دەزانێت، بە پێچەوانەی ئەو موسڵمانەی کە حوکم بە یاسای دانراو دەکات و خۆی بە تاوانبار دەزانێت، هەر بۆیەش کاتێک ابن کثیر باسی شەریعەتە مەنسوخەکانی کرد هیچ مەرجێکی باس نەکرد چونکە خودی کارەکە کوفرە بەڵام کە باسی یاسقی جەنگیزخانی کرد مەرجی پێشخستنی یاسقی بەسەر قورئان و سوننەت باسکرد، ووتی: (چ جای ئەو کەسەی کە حوکم دەباتەوە بۆ لای الیاساق و پێشی دەخات بەسەر شەریعەتی الله ؟! ئەوەی ئەم کارە بکات کافر بووە بە ئیجماعی موسڵمانان)، هەروەک لە تەفسیرەکەشی کە باسی یاسقی جەنگیز خان دەکات دەڵێ: (لەناو نەوەکانی بووە شەرعێک کە شوێنی دەکەوتن، پێشیان دەخست بەسەر حوکم کردن بە کتێبی الله و سوننەتی پێغەمبەرەکەی ﷺ، جا هەر کەسێک وابکات لەوان ئەوا کافرە واجبە شەڕی لە دژ بکرێت تاکو دەگەڕێتەوە بۆ حوکمی الله و پێغەمبەرەکەی).

# ئایا هەر یاسایەک لە دەرەوەی شەرعی الله دابنرێت حوکم بردنەوە بۆی دروست نیە ؟

زیادەڕەوەکان هەموو یاسایەکی دانراو و پەیماننامە و ڕێککەوتنێک لە دەرەوەی شەرع کرا بێت بە یاسای طاغوتی دادەنێن و حوکم بردنەوە بۆی بە کوفر دەزانن، ڕەچاوی ئەوە ناکەن یاساکە موافقی شەرعە یان پێچەوانەیەتی، لە کاتێکدا هەندێک یاسا و پەیماننانە و ڕێککەوتن هەیە موافقی شەرعی الله-یە ئەگەرچی لە ڕوانگەی پابەند بوون بە شەرع و ملکەچ بوون بۆ شەرعی الله یاساکە یان ڕێککەوتنەکە دەر نەکرا بێت، هاوشێوەی ئەم پەیماننامە و ڕێککەوتنانەی کە بۆ سەندنەوەی حەقی مەزڵوم لە زاڵم دەرکراون کە ئەمە ئامانجێکی شەرعیە و شەرع داوای دەکات ئەگەرچی کەسەکان لە پێناوی الله و پابەند بوون بە شەرعەکەی ئەنجامیان نەدا بێت.

**ابن هشام** دەڵێ:

حدثني زياد بن عبدالله البكائي عن محمد بن إسحاق ووتی:

چەند هۆزێکی قورەیش یەکتریان بانگ کرد بۆ پەیماننامەیەک جا بۆی کۆبوونەوە لە ماڵی عبدالله بن جدعان بن عمرو بن كعب بن سعد بن تيم بن مرة بن كعب بن لؤي، بەهۆی ڕێز و تەمەنی عبدالله بن جدعان، جا هاوپەیمانەکان ئەمانە بوون: بنو هاشم و بنو المطلب و أسد بن عبدالعزى و زهرة بن كلاب و تيم بن مرة، جا پەیمان و بەڵێنیان بەست کە لە مەککە دا هیچ مەزڵومێک نەبینن کە خەڵکی مەککە بێت یان جگە لەویش لەو کەسانەی کە هاتوونەتە ناو مەککە ئەوا ئیللا پشتی بگرن و دژی ئەو کەسە بوەستن کە زوڵمی لێکراوە تاکو حەقەکەی بۆ دەگەڕێننەوە، جا قورەیش ناویان لەم پەیماننامەیە نا: (حلف الفضول).

[السيرة النبوية : 1/153-154]

**ابن هشام** دەڵێ:

قال ابن إسحاق: حدثني محمد بن زيد بن المهاجر بن قنفذ التيمي أنه سمع طلحة بن عبدالله بن عوف الزهري دەیووت: **پێغەمبەری الله ﷺ فەرمووی:**

**لە ماڵی عبدالله بن جدعان ئامادەی پەیماننامەیەک بووم حەز ناکەم حوشتری سوورم پێ بدرێت لە بەرامبەر هەڵوەشاندنەوەی پەیماننامەکە. وە ئەگەر لە ئیسلامیشدا بانگەوازی بۆ کرابوایە ئەوا بە دەمیەوە دەچووم.**

**[السيرة النبوية : 1/154-155]**

**ابن هشام** دەڵێ:

قال ابن إسحاق: حدثني يزيد بن عبدالله بن أسامة بن الهادي الليثي أن محمد بن إبراهيم بن الحارث التيمي حدثه: لەنێوان الحسين بن علي بن أبي طالب رضي الله عنهما و الوليد بن عتبة بن أبي سفيان ناکۆکی هەبوو لەسەر سامانێک لە (ذي المروة)، ئەوکاتیش الوليد ئەمیری مەدینە بوو معاوية-ی مامی کردبووی بە ئەمیر لەسەر مەدینە، جا الوليد زوڵمی لە الحسين کرد رضي الله عنه دەربارەی حەقەکەی بەهۆی ئەوەی کە دەسەڵاتی هەبوو، الحسين بە الوليد-ی ووت: سوێند دەخۆم بە الله حەقەکەم پێ دەدەیتەوە یان دەست دەکەمە شمشێرەکەم، پاشان لە مزگەوتی پێغەمبەری الله ﷺ دەوەستم ئینجا بانگەواز دەکەم بۆ حلف الفضول.

عبدالله بن الزبير لەلای الوليد بوو کاتێک الحسين رضي الله عنه ئەم قسەیەی کرد، جا عبدالله بن الزبير ووتی: وە منیش سوێند دەخۆم بە الله گەر الحسين بانگەواز بکات بۆ حلف الفضل ئەوا دەست دەکەمە شمشێرەکەم، پاشان پشتی الحسين دەگرم تا

حەقەکەی وەردەگرێتەوە یان هەمووومان دەمرین.

جا ئەم هەواڵە بە المسور بن مخرمة بن نوفل الزهري گەیشت، ئەویش هەمان شتی ووت، وە ئەم هەواڵە بە عبدالرحمن بن عثمان بن عبیدالله التیمي گەیشت، ئەویش هەمان شتی ووت، جا کاتێک ئەم هەواڵە گەیشی بە الولید بن عتبة حەقەکەی الحسین-ی دایەوە تاکو الحسین ڕازی بوو.

**[السیرة النبویة : 1/155-156]**

ووتم: پێغەمبەر ﷺ بەشداری (حلف الفضول)ی کردووە لە مەککە کاتێک تەمەنی بیست ساڵ بووە، واتا بیست ساڵ پێش ئەوەی ببێت بە پێغەمبەر بەشداری تێدا کردووە، هێشتا قورئان دانەبەزیوە بەسەری و نەبۆتە پێغەمبەر و شەریعەتی ئیسلام نەهاتووە بۆی، وە ئەو هۆزانەی کە بەشداری ئەم پەیمانەیان کرد موشریک و بت پەرست بوون، بەڵام لەبەر ئەوەی پەیمانەکە لەسەر وەرگرتنەوەی حەقی مەزڵوم بوو لە زاڵم، بۆیە پێغەمبەر ﷺ دوای ئەوەی کە دەبێت بە پێغەمبەریش شانازی بەم بەشداری کردنەی دەکات و بە حوشتری سوور نایگۆڕێتەوە، تەنانەت دەفەرمووێ گەر ئێستاش کە ئایینی ئیسلام هاتووە بانگم بکەن بۆ ئەو پەیمانە ئەوا بەشداری تێدا دەکەم، هەروەها نەوەکەی پێغەمبەر ﷺ ئیمام الحسین کاتێک دەبێتە ناکۆکی لەگەڵ الولید هەڕەشەی لێ دەکات بە بانگ کردنی خەڵکی بۆ جێبەجێ کردنی ئەو پەیمانەی سەردەمی جاهیلی، عبدالله بن الزبیر کە هاوەڵە دەڵێ: گەر بانگی خەڵک بکات بۆ ئەو پەیمانە ئەوا بە دەنگیەوە دەچم، هەموو ئەمانە لەبەر ئەوەیە کە پەیمانەکە موافقی شەرعی الله-یە، ئەگەرچی کەسانێکی موشریک بیرۆکەی ئەمایان بۆ هاتبێت و هەڵسابن بە ئەنجامدانی و نیازیان ڕەزامەندی الله نەبوو بێت، وە بێگومان ئەم پەیمانە لە پێشنیاری پێغەمبەر نیە چونکە خۆی دەفەرمووێ: بانگ کرام بۆی، واتا کەسانێکی تر پێی هەڵساون و بیرۆکەی ئەوان بووە کە ئەوانیش موشریک بوونە، جا ئەمە ئەوەمان پێ دەڵێ: گەر طاغوت یاسایەکی دەرکرد کە یاسایەکە وەرگرتنەوەی حەقی مەزڵوم بوو لە زاڵم، تۆش زوڵمت لێکرا و

هیچ چارێکی ترت نەبوو جگە لەم ڕێگایە، مادام یاساکەی موافقی شەرعە ئەوا هیچ تاوانێکی تێدا نیە حوکمی بۆ ببەیتەوە، ئەگینا چۆن پێغەمبەر ﷺ شانازی پێوە دەکات ؟! وە زۆرێک لەم حاڵەتانەی ئەمڕۆ توشی موسڵمانان دەبێت بابەتی حەق خواردن و زوڵم کردنە، کە وایان لە موسڵمانان کردووە حەقێکی زۆریان بفەوتێ بە بیانووی ئەوەی سکاڵا تۆمار بکەیت و حوکم بەریتەوە بۆ لای یاساکان ئەوا کافر دەبیت، وە سوپاس و ستایش بۆ الله کە ئەمە لە پاکی و بەرزی شەریعەتەکەیەتی کە یاسای زۆرێک لە وولاتان بە وولاتانی بەناو ئیسلامی و غەیرە ئیسلامی لە بابەتەکانی زوڵم و حەقی نێوان مرۆڤەکان یاساکانیان موافقی شەرعی ئیسلامە ئەگەرچی لە شەرعی ئیسلامیان وەرنەگرتبێ تەنانەت کافرانی قورەیشیش پەیمانەکەیان موافقی شەرعی الله بوو ئەگەرچی کافریش بوون، جا ئەمڕۆ لە هەر وولاتێک سکاڵا تۆمار بکەیت بڵێی دزیم لێکراوە، ماڵم خوراوە، لێیان داوم، قەرزەکەم نادەنەوە، فێڵیان لێکردووم، ناموسیان لەکەدار کردووم، زەوی و زار و خانوویان لێ زەوت کردووم، لە هەموو ئەم بابەتانە کە حەقی نێوان مرۆڤەکانە لە یاسای وولاتاندا لایەنی دەست درێژ کەر بە زاڵم دادەنرێت و لایەنەکەی تر بە مەزڵوم دادەنرێت، کە ئەمەش موافقی شەرعی الله-یە، جا حلف الفضول لەکوێ و عەقیدەی زیادەڕەوەکان لەکوێ کە بە ئافرەتێکی موسڵمان دەڵێن: نابێت لای مێردە مورتەددەکەت بیت نیکاحەکەتان بەتاڵ بۆتەوە، بێتە لات بە زینا حیسابە و منداڵەکانتان زۆڵ دەردەچن، ئەویش دەڵێ: باشە داوای تەڵاق دەکەم چونکە دەزانم نابێت ئافرەتی موسڵمان لای پیاوی کافر بێت، پێی دەڵێن: داوای تەڵاق بکەیت دەبێت بچیتە لای حاکم، کەواتە لە کێشەی نێوان خۆت و مێردەکەت حوکمت بردۆتەوە بۆ لای طاغوت بەمەش کافر دەبیت !!! ئەی ئافرەتی داماو چی بکات ؟ یان کافرە یان زیناکەرە ! والله المستعان.

جا ئەگەر بووترێ: ڕاستە حوکمەکانیان موافقی شەرعە بەڵام سزاکانیان پێچەوانەی شەرعە، دەڵێین: وەک پێشتر باسمان کرد شەرع داوای دوو شتی کردووە، یەکەمیان: دەبێت حەقی مەزڵوم لە زاڵم وەربگیرێتەوە، دووەمیان: سزادانی زاڵمەکەیە، جا تۆ لەم دوو ئامانجە

شەرعیە یەکێکیان بە دەست بهێنی باشترە لەوەی کە هیچیان بە دەست نەهێنی، وە ئەو سزایەش کە دەدرێت بەسەر زاڵم گەر پێچەوانەی سزای شەرعی بوو ئەوا تۆ لێی بەری و دانی پێ نانێیت، تەنها سزا شەرعیەکەت قبوڵە، تاوانەکە یان کوفرەکە لە ئەستۆی حاکمەکەیە.

# ئایا هەموو ڕازی نەبوونێک بە گەڕاندنەوەی حوکم بۆ قورئان و سوننەت کوفرە ؟

**البغوي** دەڵێ:

﴿وَإِن طَآئِفَتَانِ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ٱقۡتَتَلُواْ فَأَصۡلِحُواْ بَيۡنَهُمَاۖ فَإِنۢ بَغَتۡ إِحۡدَىٰهُمَا عَلَى ٱلۡأُخۡرَىٰ فَقَٰتِلُواْ ٱلَّتِي تَبۡغِي حَتَّىٰ تَفِيٓءَ إِلَىٰٓ أَمۡرِ ٱللَّهِۚ فَإِن فَآءَتۡ فَأَصۡلِحُواْ بَيۡنَهُمَا بِٱلۡعَدۡلِ وَأَقۡسِطُوٓاْۖ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُقۡسِطِينَ﴾ **[الحجرات: ٩]**

﴿فَإِنۢ بَغَتۡ إِحۡدَىٰهُمَا عَلَى ٱلۡأُخۡرَىٰ﴾ گەر یەکێکیان دەست درێژی کردە سەر ئەوی تریان، **وە ئامادە نەبوو بەرەو حوکمی کتێبی الله بێت**، ﴿فَقَٰتِلُواْ ٱلَّتِي تَبۡغِي حَتَّىٰ تَفِيٓءَ إِلَىٰٓ أَمۡرِ ٱللَّهِۚ﴾ ئەوا شەڕ بکەن لەگەڵ ئەو لایەنەی کە دەست درێژی دەکات **تا دەگەڕێتەوە بۆ فرمانی الله لە کتێبەکەی**، ﴿فَإِن فَآءَتۡ﴾ گەر گەڕایەوە بۆ حەق، ﴿فَأَصۡلِحُواْ بَيۡنَهُمَا بِٱلۡعَدۡلِ﴾ ئەوا صولح بکەن لەنێوانیان بە عەدل بەوەی کە وایان لێ بکەن حەقەکە بگەڕێننەوە بۆ خاوەنەکەی و **ڕازی بن بە حوکمی الله**. ﴿وَأَقۡسِطُوٓاْۖ﴾ دادپەروەر بن، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُقۡسِطِينَ﴾ الله دادپەروەرانی خۆش دەوێت.

**[تفسير البغوي : 7/340-341]**

**الطبري** لە تەفسیری ئایەتی: ﴿وَإِن طَآئِفَتَانِ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ٱقۡتَتَلُواْ فَأَصۡلِحُواْ بَيۡنَهُمَاۖ فَإِنۢ بَغَتۡ إِحۡدَىٰهُمَا عَلَى ٱلۡأُخۡرَىٰ فَقَٰتِلُواْ ٱلَّتِي تَبۡغِي حَتَّىٰ تَفِيٓءَ إِلَىٰٓ أَمۡرِ ٱللَّهِۚ فَإِن فَآءَتۡ فَأَصۡلِحُواْ بَيۡنَهُمَا بِٱلۡعَدۡلِ وَأَقۡسِطُوٓاْۖ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُقۡسِطِينَ﴾ دەڵێ:

الله تعالی ذکرە دەفەرمووێ: ئەگەر دوو کۆمەڵ لە ئەهلی ئیمان شەڕیان کرد لەگەڵ

یەکتر، صولح بکەن ئەی ئیمانداران لەنێوانیان بە بانگ کردنیان بۆ حوکمی کتێبی اللە، وە ڕازی بوون بەوەی لە کتێبی اللە هاتووە، لە بەرژەوەندیان بێت یان لە دژیان بێت، ئەمەش بریتیە لە صولح کردن لەنێوانیان بە عەدل، ﴿فَإِنۢ بَغَتۡ إِحۡدَىٰهُمَا عَلَى ٱلۡأُخۡرَىٰ﴾ اللە دەفەرمووێ: **گەر یەکێک لە دوو کۆمەڵەکە ڕازی نەبوون بە گەڕانەوە بۆ حوکمی کتێبی اللە لە بەرژەوەندی بێت یان لە دژی بێت، وە سنوری عەدل ببەزێنێ کە اللە دایناوە لەنێوان بەندەکانی، وە کۆمەڵەکەی تر ملکەچ بوو بۆ حوکمی اللە**، ﴿فَقَٰتِلُواْ ٱلَّتِي تَبۡغِي﴾ اللە دەفەرمووێ: شەڕ بکەن لە دژی ئەو کۆمەڵەی دەست درێژی دەکات و **ڕازی نابێت بگەڕێتەوە بۆ حوکمی کتێبی اللە**، ﴿حَتَّىٰ تَفِيٓءَ إِلَىٰٓ أَمۡرِ ٱللَّهِۚ﴾ **اللە دەفەرمووێ: تاکو دەگەڕێتەوە بۆ حوکمی اللە**، کە حوکمی کردووە لە کتێبەکەی لەنێوان دروستکراوەکانی، ﴿فَإِن فَآءَتۡ فَأَصۡلِحُواْ بَيۡنَهُمَا بِٱلۡعَدۡلِ﴾ اللە دەفەرمووێ: گەر کۆمەڵە دەست درێژکەرەکە دوای شەڕ کردنتان لەگەڵیان **گەڕایەوە بۆ ڕازی بوون بە حوکمی اللە لە کتێبەکەی**، ئەوا صولح بکەن لەنێوان ئەوان و کۆمەڵەکەی تر کە شەڕی لەگەڵ کردووە، ﴿بِٱلۡعَدۡلِ﴾ واتا: بە ئینصاف لەنێوانیان، ئەمەش بریتیە لە حوکمی اللە لە کتێبەکەی کە کردوویەتی بە عەدل لەنێوان دروستکراوەکانی.

**[تفسير الطبري : 357/21]**

**الطبري** دەڵێ:

حدثني علي قال حدثنا أبو صالح قال حدثني معاوية عن علي عن **ابن عباس:**

دەربارەی فەرمایشتی اللە: ﴿وَإِن طَآئِفَتَانِ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ٱقۡتَتَلُواْ فَأَصۡلِحُواْ بَيۡنَهُمَاۖ فَإِنۢ بَغَتۡ

إِحۡدَىٰهُمَا عَلَى ٱلۡأُخۡرَىٰ فَقَٰتِلُواْ ٱلَّتِي تَبۡغِي حَتَّىٰ تَفِيٓءَ إِلَىٰٓ أَمۡرِ ٱللَّهِۚ﴾ ووتی: الله سبحانه و تعالی فرمانی کرد بە پێغەمبەر ﷺ و ئیمانداران گەر دوو کۆمەڵ شەڕیان کرد لە ئیمانداران، ئەوا بانگیان بکەن بۆ حوکمی الله و حەقی هەندێکیان لە هەندێکیان وەرگرن، گەر بە دەمیەوە هاتن ئەوا حوکم دەکرێت لەنێوانیان بە کتێبی الله، تاکو حەقی مەزڵوم لە زاڵم وەردەگیرێت. **هەر یەکێک لەوان ڕازی نەبوو بگەڕێتەوە بۆ حوکمی الله ئەوا سنوور بەزێنە. وە حەقە لەسەر پێشەوای ئیمانداران جیهاد و شەڕ بکات لە دژیان تا دەگەڕێنەوە بۆ فرمانی الله و دان دەنێن بە حوکمی الله.**

**[تفسير الطبري : 21/357-358]**

**الطبري** دەڵێ:

حدثنا ابن حميد قال حدثنا مهران قال حدثنا المبارك بن فضالة عن **الحسن:**

﴿وَإِن طَآئِفَتَانِ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ٱقۡتَتَلُواْ﴾ **ووتی: ناکۆکی ڕوویدەدا لەنێوان دوو هۆز، جا بانگیان دەکردن بۆ حوکمی الله، ئەوانیش ڕازی نەدەبوون ملکەچ بن، جا الله ئەم ئایەتەی دابەزاند:** ﴿وَإِن طَآئِفَتَانِ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ٱقۡتَتَلُواْ فَأَصۡلِحُواْ بَيۡنَهُمَاۖ فَإِنۢ بَغَتۡ إِحۡدَىٰهُمَا عَلَى ٱلۡأُخۡرَىٰ فَقَٰتِلُواْ ٱلَّتِي تَبۡغِي حَتَّىٰ تَفِيٓءَ إِلَىٰٓ أَمۡرِ ٱللَّهِۚ﴾ الله دەفەرمووێ: بیانگەڕێننەوە بۆ حوکم، جا شەڕ کردن لەگەڵیان ئەوە بوو کە بیانگەڕێننەوە بۆ حوکمی الله.

**[تفسير الطبري : 21/360]**

**الطبري** دەڵێ:

حدثنا ابن حميد قال حدثنا مهران عن سفيان عن **السدي:**

﴿وَإِن طَآئِفَتَانِ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ٱقۡتَتَلُواْ فَأَصۡلِحُواْ بَيۡنَهُمَاۖ﴾ ووتی: ئافرەتێک لە ئەنصار پێی دەووترا: دایکی زید لە لای پیاوێک بوو کە کێشە هەبوو لەنێوانیان، پیاوەکە ژنەکەی بردە ژوورێک لە نهۆمی سەرەوەی ماڵەکە، بە منداڵەکانیشی ووت: کەس نەچێتە لای، ئەم هەواڵە گەیشت بە کەس و کاری ژنەکە، جا هاتن، کەس و کاری پیاوەکەش هاتن، شەڕیان کرد بە دەست و بە نەعل، ئەم هەواڵە گەیشت بە پێغەمبەر ﷺ هات بۆ ئەوەی صولح بکات لەنێوانیان، جا قورئان دابەزی: ﴿وَإِن طَآئِفَتَانِ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ٱقۡتَتَلُواْ فَأَصۡلِحُواْ بَيۡنَهُمَاۖ فَإِنۢ بَغَتۡ إِحۡدَىٰهُمَا عَلَى ٱلۡأُخۡرَىٰ﴾ (تَبۡغِي) **واتا: ڕازی نیە بە صولحی پێغەمبەری الله ﷺ یان بە حوکمی پێغەمبەری الله.**

**[تفسير الطبري : 360/21]**

**الطبري** دەڵێ:

حدثنا بشر قال حدثنا يزيد قال حدثنا سعيد عن **قتادة:**

دەربارەی فەرمایشتی الله: ﴿وَإِن طَآئِفَتَانِ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ٱقۡتَتَلُواْ فَأَصۡلِحُواْ بَيۡنَهُمَاۖ فَإِنۢ بَغَتۡ إِحۡدَىٰهُمَا عَلَى ٱلۡأُخۡرَىٰ فَقَٰتِلُواْ ٱلَّتِي تَبۡغِي حَتَّىٰ تَفِيٓءَ إِلَىٰٓ أَمۡرِ ٱللَّهِۚ﴾ تا کۆتایی ئایەتەکە، ووتی: بۆمان باسکراوە کە ئەم ئایەتە دەربارەی دوو پیاو لە ئەنصار دابەزی، ناکۆکی لەنێوانیان هەبوو دەربارەی حەقێک، یەکێکیان بەوی تری ووت: بە زەبری هێز لێتی وەردەگرم بەهۆی زۆری ژمارەی عەشیرەتەکەی، **ئەوەی تریان بانگی کرد بۆ ئەوەی حوکم بەرنەوە بۆ لای پێغەمبەر ﷺ، جا ڕازی نەبوو شوێنی بکەوێ**، جا کێشەکە ئاوا بەردەوام بوو تا پاڵیان بەیەکترەوە نا تاکو گەیشت بەوەی هەندێکیان

لە هەندێکیان بدەن بە دەست و بە نەعل، شەڕەکە بە شمشێر نەبوو، **جا الله فرمانی کرد شەڕ بکرێ لە دژی تاکو دەگەڕێتەوە بۆ کتێبی الله و حوکمی پێغەمبەرەکەی** ﷺ، بەم شێوەیە نیە کە ئەهلی گومانەکان و ئەهلی بیدعە و ئەهلی بوهتان کرد بە الله و بە کتێبەکەی تەفسیری دەکەن کە حەلالە بۆت ئیماندار بکوژیت، واللە الله حورمەتی ئیمانداری زۆر گەورە کردووە تەنانەت نەهی لێکردووی هیچ گومانێک بە برا ئیماندارەکەت ببەیت جگە لە گومانی خێر، فەرموویەتی: ﴿إِنَّمَا ٱلۡمُؤۡمِنُونَ إِخۡوَةٞ فَأَصۡلِحُواْ بَيۡنَ أَخَوَيۡكُمۡۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمۡ تُرۡحَمُونَ﴾ **[الحجرات: ١٠]**.

**[تفسير الطبري: 361/21]**

**الطبري** دەڵێ:

حدثني يونس قال أخبرنا ابن وهب قال وأخبرني عبدالله بن عياش ووتی:

**زيد** دەربارەی فەرمایشتی **الله تعالی**: ﴿وَإِن طَآئِفَتَانِ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ٱقۡتَتَلُواْ فَأَصۡلِحُواْ بَيۡنَهُمَاۖ﴾ ووتی: دوو پیاو شەڕیان دەکرد لە ئەهلی ئیسلام، یان کەسێک لەگەڵ کەسێک، یان هۆزێک لەگەڵ هۆزێک، الله فرمانی بە موسڵمانان کرد کە حوکم بکەن لەنێوانیان بەو حەقەی کە الله دایبەزاندووە لە کتێبەکەی، یان تۆڵە کردنەوە، یان پێدانی حەقی خوێنەکە، یان لێخۆشبوون، ﴿فَإِنۢ بَغَتۡ إِحۡدَىٰهُمَا عَلَى ٱلۡأُخۡرَىٰ﴾ گەر کەسێکیان دەست درێژی کردە سەر ئەوی تر دوای صولح، ئەوا موسڵمانان لایەنگری مەزلومەکە دەکەن لە دژی زاڵمەکە **تاکو دەگەڕێتەوە بۆ حوکمی الله و پێی ڕازی دەبێت.**

**[تفسير الطبري: 362/21]**

ووتم: (زید) زيد بن أسلم-ە.

**الواحدي** دەڵێ:

﴿فَأَصۡلِحُواْ بَيۡنَهُمَاۖ﴾ واتا: صولح بکەین لەنێوانیان بە بانگ کردنیان بۆ حوکمی کتێبی الله، وە ڕازی بوون بەوەی کە تێیدایە لە بەرژەوەندیان بێت یان لە دژیان بێت، وە فەرمایشتی: ﴿فَإِنۢ بَغَتۡ إِحۡدَىٰهُمَا عَلَى ٱلۡأُخۡرَىٰ﴾ واتا: گەر لایەنێکیان داوای شتێکی کرد کە حەقی خۆی نەبوو، **وە نەگەڕایەوە بۆ صولح و ڕازی بوون بە حوکمی الله کە لە کتێبەکەیدا حوکمی داوە.**

**[التفسير البسيط : 351/20]**

بڕوانە سەرەڕای ڕازی نەبوونیان بە گەڕانەوە بۆ حوکمی الله تەکفیر نەکران، بەڵکو بە ئیماندار ناوبران لە ئایەتەکەدا، بەڵام ڕازی نەبوونیان بە گەڕانەوەیان بۆ حوکمی الله لەبەر ڕەتکردنەوە و تانەدان نەبووە لە حوکمەکە، بەڵکو لەبەر ئارەزووی نەفس و تورەیی بووە، وەک ئەو پیاوەی کە کچەکەی زینا دەکات دەزانێت حوکمی لە شەرعدا 100 قامچیە بەڵام لەبەر تورەییەکەی ناگەڕێتەوە بۆ ئەم حوکمە ڕێک کچەکەی دەکوژێت، ئەم کەسە تەکفیر ناکرێت مادام تانەی لە حوکمی شەرع نەداوە، ئەگەرچی پێشی بڵێن حوکمەکەی لە شەرعدا قامچی لێدانە نەک کوشتن، بەڵام هەر ڕازی نابێت بگەڕێتەوە بۆی.

سەیری ووتەکانی موفەسیرین بکە: (ڕازی نەبوون بە حوکمی الله) ، (ڕازی نەبوون بە حوکمی پێغەمبەر) ، (شەڕیان لە دژ بکەن تا دەگەڕێنەوە بۆ کتێبی الله) ، (تاکو دەگەڕێتەوە بۆ کتێبی الله و حوکمی پێغەمبەرەکەی) ، (ڕازی نیە بە صولحی پێغەمبەر) هەموو ئەم ووتانە دەربارەی کەسانێک بەکار هاتوون کە لە ئایەتەکەدا بە ئیماندار ناوبراون نەک کافر.

# ئایا جێبەجێ کردنی یاسای طاغوت مانای پەرستنی طاغوتەکەیە ؟

زیادەڕەوەکان دەڵێن: ئەوەی یاسای طاغوتێک جێبەجێ بکات ئەوا ئەم طاغوتەی پەرستووە و شەریکی بۆ الله بڕیار داوە لە حوکمدا، ئینجا بۆ ئەمەش چەند ئایەتێک دەکەن بە بەڵگە کە ئایەتەکان تەواو دژی خۆیانە گەر بێتو بگەڕێنەوە بۆ تەفسیری دروستی ئەم ئایەتانە لەلایەن زانایانەوە.

یەکێک لەو ئایەتانەی کە دەیکەن بە بەڵگە ئایەتی (٣١)ی سورەتی التوبة-یە:
﴿ٱتَّخَذُوٓاْ أَحۡبَارَهُمۡ وَرُهۡبَٰنَهُمۡ أَرۡبَابٗا مِّن دُونِ ٱللَّهِ وَٱلۡمَسِيحَ ٱبۡنَ مَرۡيَمَ وَمَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعۡبُدُوٓاْ إِلَٰهٗا وَٰحِدٗاۖ لَّآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۚ سُبۡحَٰنَهُۥ عَمَّا يُشۡرِكُونَ﴾

دەڵێن: یەهود و نەصارا گوێڕایەڵی زانا و عابیدەکانیان کرد بە پێچەوانەی فرمانی الله، الله تعالی ئەو کارەی ئەوانی بە پەرستنی زانا و عابیدەکان ناو برد، جا هەر کەسێک حوکم بەرێتەوە بۆ لای طاغوت لەو یاسایانەی کە دژی حوکمی الله-ن ئەوا طاغوتەکەی پەرستووە و کردوویەتی بە خوای خۆی.

**الترمذي** دەڵێ:
حدثنا الحسين بن يزيد الكوفي قال حدثنا عبدالسلام بن حرب عن غطيف بن أعين عن مصعب بن سعد عن عدي بن حاتم ووتی:
چوومە لای پێغەمبەر ﷺ صەلیبێکی زێڕم لە مل بوو، فەرمووی: ئەی عدي ئەم بتە فڕێ بدە و لەخۆتی بکەوە، وە بیستم لە سورەتی (براءة) ئەم ئایەتەی دەخوێند:

﴿ٱتَّخَذُوٓاْ أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَـٰنَهُمْ أَرْبَابًا مِّن دُونِ ٱللَّهِ﴾ فەرمووی: ئەوان زانا و عابیدەکانیان نەدەپەرست، **بەڵام گەر شتێکیان بۆ حەلال کردبوان ئەوانیش بە حەلالیان دەزانی، وە ئەگەر شتێکیان لێ حەڕام کردبوان ئەوانیش بە حەڕامیان دەزانی.**
الترمذي دەڵێ: هذا حديث غريب، ئەم فەرموودەیە ناناسین تەنها لە ڕێگای عبدالسلام بن حرب نەبێت، وە غطیف بن أعین کەسێکی ناسراو نیە لە ڕیوایەت کردنی فەرموودە.
**[جامع الترمذي : ژمارە 3095]**

ووتم: ئەم فەرموودەیە زەعیفە هەروەک الترمذي باسی کرد، بەڵام هاوەڵان و تابعین کۆکن لەسەر ئەم تەفسیرە، هەمان تەفسیریان کردووە بۆ ئایەتەکە.
سورەتی (براءة) واتا سورەتی التوبة.

جا سەیرەکە لەوەدایە زیادەڕەوەکان بەڵگە بەم ڕیوایەتە دەهێننەوە کە بەڵگەیە لە دژی خۆیان، زانا و عابیدەکان حەلالیان حەرام دەکرد خەڵکیش گوێڕایەڵیان دەکردن دەیان ووت حەرامە، وە حەرامیان حەلال دەکرد خەڵکیش گوێڕایەڵیان دەکردن دەیان ووت حەلالە، جا گومان لەمەدا نیە کە ئەم کارە کوفرە و پەرستنی زانا و عابیدەکانە و یەکسان کردنیان بە الله، چونکە حەلال کردن و حەرام کردن تەنها مافی الله-یە، جا ئایا کە موسڵمانێک حوکم دەباتەوە بۆ لای طاغوت و دەزانێت حوکمەکانی باطلن و لێی بەریە ئەم ئایەتە لەسەری جێبەجێ دەبێت ؟ ئەصلەن دەبێت خودی طاغوتەکە بڵێ ئەمە حەلالە و ئەمە حەرامە، ئەوکات دەووترێ حەلالی کرد و حەرامی کرد، چونکە گەر هەموو ڕێگا پێدانێک بۆ تاوان مانای حەلال کردن بێت، ئەوا دەیوث (گەواد) دەبێت طاغوت بێت و کافر بێت، چونکە پیاوی واهەیە خۆی گەوادی بۆ ژن و کچەکەی دەکات و ڕێگای بۆ خۆشکردوون، ئایا دەووترێ ئەم پیاوە زینای حەلال کردووە تەنها لەبەر ئەوەی ڕێگای داوە بە ژن و کچەکەی زینا بکەن؟!

**آدم بن أبي إياس** دەڵێ:

حدثنا ورقاء عن عطاء بن السائب عن **أبي البختري:**

دەربارەی فەرمایشتی الله: ﴿ٱتَّخَذُوٓاْ أَحۡبَارَهُمۡ وَرُهۡبَٰنَهُمۡ أَرۡبَابٗا مِّن دُونِ ٱللَّهِ﴾ ووتی: گوێڕایەڵی زانا و عابیدەکانیان کرد لەو شتانەی کە فرمانیان پێکردن دەربارەی **حەڕام و حەلالی الله**، جا الله گوێڕایەڵی کردنیان بۆیان بە عیبادەت دانا.

**[تفسير مجاهد : لاپەرە 367]**

**سعيد بن منصور** دەڵێ:

حدثنا هشيم قال حدثنا العوام بن حوشب عن حبيب بن أبي ثابت قال حدثني أبو البختري الطائي ووتی: بە حذيفة ووترا: فەرمایشتی الله عز وجل: ﴿ٱتَّخَذُوٓاْ أَحۡبَارَهُمۡ وَرُهۡبَٰنَهُمۡ أَرۡبَابٗا مِّن دُونِ ٱللَّهِ﴾ مانای چیە ؟ **حذيفة ووتی:** ئەهلی کیتاب نوێژیان نەدەکرد بۆ زانا و عابیدەکانیان، **بەڵام ئەوان هەر حەڕامێکیان بۆ حەلال کردبوان ئەوانیش بە حەلالیان دەزانی، وە هەر حەلالێکیان لێ حەڕام کردبوان ئەوانیش بە حەڕامیان دەزانی، ئەمە ربوبیەتی ئەوان بوو.**

**[سنن سعيد بن منصور : ژمارە 1012]**

ووتم: لە دەستنوس نوسراوە أبو البختري دەڵێ: (حذيفة پێی ووتم) بەڵام محقق لە حاشیە ئاماژەی پێداوە کە ئەمە هەڵەیە، چونکە أبو البختري بە حذيفة نەگەیشتووە، بۆیە صەواب ئەوەیە کە أبو البختري بڵێ: (بە حذيفة ووترا) هەروەک لە تەفسیری الطبري هاتووە.

وە برگەی کۆتایی ئەثەرەکە لە چاپدا بەم جۆرە هاتووە: (هەر حەڕامێکیان لێ حەڕام کردبوان ئەوانیش بە حەڕامیان دەزانی) ! صەواب ئەمەیە: (هەر حەلالێکیان لێ حەڕام کردبوان

ئەوانیش بە حەڕامیان دەزانی) هەم دەقەکە وادەخوازێ هەم لە ڕیوایەتی تریش بەم شێوەیە هاتووە، بۆیە چاکم کردەوە، بەڵام محقق ئاماژەی بەم هەڵەیە نەداوە !

**ابن أبي حاتم** دەڵێ:

حدثنا أبو سعيد الأشج و عمرو الأودي قالا حدثنا وكيع عن الأعمش عن حبيب عن أبي البختري ووتی: بە حذيفة ووترا: ﴿ٱتَّخَذُوٓاْ أَحۡبَارَهُمۡ وَرُهۡبَٰنَهُمۡ أَرۡبَابٗا مِّن دُونِ ٱللَّهِ﴾ ئایا دەیان پەرستن ؟ ووتی: نەخێر، **بەڵام حەڕامیان بۆ حەلال دەکردن ئەوانیش بە حەلالیان دەزانی، وە حەلالیان لێ حەڕام دەکردن ئەوانیش بە حەڕامیان دەزانی.**

ابن أبي حاتم دەڵێ: ڕیوایەت کراوە لە (أبو العالية و أبو جعفر محمد بن علي بن الحسين و الضحاك و السدي) نزیک لەم تەفسیرە.

[تفسير ابن أبي حاتم : 8/381-382]

**الطبري** دەڵێ:

﴿أَرۡبَابٗا مِّن دُونِ ٱللَّهِ﴾ **واتا: زانا و عابیدەکانیان کرد بە گەورەی خۆیان لە بڕی الله**، گوێڕایەڵیان دەکەن لە سەرپێچی کردنی الله، **ئەو شتانە بە حەلال دەزانن کە بۆیان حەلال دەکەن کە الله لێی حەڕام کردوون، وە ئەو شتانە بە حەڕام دەزانن کە لێیان حەڕام دەکەن کە الله بۆی حەلال کردوون.**

[تفسير الطبري : 11/417]

**الطبري** دەڵێ:

حدثنا جرير و ابن فضيل عن عطاء عن **أبي البختري:**

﴿ٱتَّخَذُوٓاْ أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَٰنَهُمْ أَرْبَابًا مِّن دُونِ ٱللَّهِ﴾ **ووتی: چوون بەرەو حەلال کراوەکانی الله حەڕامیان کرد، وە چوون بەرەو حەڕام کراوەکانی الله حەلالیان کرد، ئەوانیش گوێڕایەڵیان کردن لەمەدا**، جا الله گوێڕایەڵی ئەوانی بە عیبادەت دانا، گەر پێیان ووتبان: بمان پەرستن، نەیان دەپەرستن.

**[تفسير الطبري : 419/11]**

**الطبري** دەڵێ:

حدثني محمد بن الحسين قال حدثنا أحمد بن المفضل قال حدثنا أسباط عن السدي ووتی:

﴿ٱتَّخَذُوٓاْ أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَٰنَهُمْ أَرْبَابًا مِّن دُونِ ٱللَّهِ﴾ **عبدالله بن عباس ووتی:** فرمانیان پێ نەکردن سوجدەیان بۆ ببەن، بەڵام فرمانیان پێکردن بە سەرپێچی کردنی الله، **ئەوانیش گوێڕایەڵیان کردن، جا الله بەهۆی ئەمەوە ناوی لێنان: أرباب.**

**[تفسير الطبري : 420/11]**

**الطبري** دەڵێ:

حدثنا ابن وكيع قال حدثنا ابن نمير عن أبي جعفر الرازي عن الربيع بن أنس ووتی:

﴿ٱتَّخَذُوٓاْ أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَٰنَهُمْ أَرْبَابًا مِّن دُونِ ٱللَّهِ﴾ بە **أبو العالية**-م ووت: ئەم ربوبیەتەی کە لەناو بەنی ئیسرائیل هەبوو چۆن بوو ؟ ووتی: بەنی ئیسرائیل ووتیان: ئەوەی زانا و عابیدەکان فرمانمان پێ بکەن فەرمانبەردار دەبین، **ئەوەی ئەوان نەهیمان لێ بکەن وازی لێ دەهێنین بەهۆی ووتەی ئەوان، لە کاتێکدا ئەوان دەبینن لە کتێبی الله فرمانیان بەچی پێکراوە و نەهیان لەچی لێکراوە**، جا داوای ئامۆژگاریان لە زانا و عابیدەکان کرد، وە کتێبی الله-یان پشت گوێ خست.

**[تفسير الطبري : 420/11]**

**ابن كثير** دەڵێ:

فەرمایشتی الله تعالی: ﴿وَإِنْ أَطَعْتُمُوهُمْ إِنَّكُمْ لَمُشْرِكُونَ﴾ [الأنعام: ١٢١]، **واتا: کاتێک لاتاندا لە فرمان و شەرعی الله کە بۆتانی دانابوو، چوون بەرەو غەیری ئەو، جا غەیری ئەوتان پێش خست بەسەریدا، ئا ئەمەیە شیرک، هەروەک الله تعالی فەرموویەتی:** ﴿ٱتَّخَذُوٓاْ أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَٰنَهُمْ أَرْبَابًا مِّن دُونِ ٱللَّهِ وَٱلْمَسِيحَ ٱبْنَ مَرْيَمَ وَمَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعْبُدُوٓاْ إِلَٰهًا وَٰحِدًا لَّآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ سُبْحَٰنَهُۥ عَمَّا يُشْرِكُونَ﴾ [التوبة: ٣١]، الترمذي لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا لە عدي بن حاتم ڕیوایەتی کردووە کە وتوویەتی بە پێغەمبەری الله ئەوان نەیان دەپەرستن، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بەڵکو ئەوان حەرامیان بۆ حەلال کردن، وە حەلالیشیان لەسەر حەرام کردن، ئەوانیش شوێنیان کەوتن، ئەمەیە پەرستنی ئەوان بۆیان.

**[تفسير ابن كثير : 3/329-330]**

ئایەتێکی تر کە زیادەڕەوان دەیکەن بە بەڵگە بۆ ئەم بابەتە، ئایەتی (١٢١)ی سورەتی الأنعام-ە: ﴿وَلَا تَأْكُلُواْ مِمَّا لَمْ يُذْكَرِ ٱسْمُ ٱللَّهِ عَلَيْهِ وَإِنَّهُۥ لَفِسْقٌ وَإِنَّ ٱلشَّيَٰطِينَ لَيُوحُونَ إِلَىٰٓ أَوْلِيَآئِهِمْ لِيُجَٰدِلُوكُمْ وَإِنْ أَطَعْتُمُوهُمْ إِنَّكُمْ لَمُشْرِكُونَ﴾

دەڵێن: هەر کەسێک گوێڕایەڵی ئەو یاسا دانراوانە بکات کە پێچەوانەی حوکمی شەرعن ئەوا موشریکە.

بە هەمان شێوەی پێشوو کاتێک تەفسیری سەلەف دەهێنین بۆ ئەم ئایەتەکە ڕوون

دەبێتەوە بۆمان کە تێگەیشتنی زیادەڕەوەکان چەند هەڵەیە بۆ ئەم بابەتە، کە گوێڕایەڵی کردن لە تاوان یەکسان دەکەن بە حەلاڵ کردنی تاوانەکە، وەک ئەو کار بەدەستەی کە بە پاسەوانەکانی دەڵێ: فلان کەسم بۆ بکوژن بە ناحەق، ئەوانیش دەیکوژن، بەم کارە تاوانبار بوون، بەڵام گەر کوشتنی کەسەکە بە حەلاڵ بزانن لەبەر ئەوەی کار بەدەستەکە فرمانی پێکردووە، ئەوکات کافر دەبن.

**ابن أبي حاتم** دەڵێ:

حدثنا علي بن الحسين حدثنا عثمان بن أبي شيبة حدثنا مالك بن إسماعيل حدثنا عيسى بن عبدالرحمن ووتی:

پرسیارم لە الشعبي کرد دەربارەی ئەم ئایەتە: ﴿وَإِنۡ أَطَعۡتُمُوهُمۡ إِنَّكُمۡ لَمُشۡرِكُونَ﴾ **ووتم: خەواریجەکان پێیان وایە ئەم ئایەتە دەربارەی گوێڕایەڵی کردنی کار بە دەستانە، الشعبي ووتی: درۆیان کرد ئەم ئایەتە دەربارەی موشریکەکان دابەزی، مشتومڕیان لەگەڵ هاوەڵانی پێغەمبەری الله ﷺ دەکرد، دەیانووت: ئەوەی الله کوشتویەتی لێی ناخۆن، واتا گۆشتی مردارەوە بوو، بەڵام ئەوەی خۆتان کوشتوتانە لێی دەخۆن ! جا الله ئەم ئایەتەی دابەزاند:** ﴿وَلَا تَأۡكُلُواْ مِمَّا لَمۡ يُذۡكَرِ ٱسۡمُ ٱللَّهِ عَلَيۡهِ وَإِنَّهُۥ لَفِسۡقٞۗ وَإِنَّ ٱلشَّيَٰطِينَ لَيُوحُونَ إِلَىٰٓ أَوۡلِيَآئِهِمۡ لِيُجَٰدِلُوكُمۡۖ وَإِنۡ أَطَعۡتُمُوهُمۡ إِنَّكُمۡ لَمُشۡرِكُونَ﴾ [الأنعام: ١٢١]، **الله فەرمووی: گەر گۆشتی مردارەوە بوو بخۆن و گوێڕایەڵیان بکەن ئەوا ئێوە موشریکن.**

**[تفسير ابن أبي حاتم : 357/6]**

ووتم: مەبەستی الشعبي حەلاڵ کردنی گۆشتی مردارەوە بووە نەک تەنها بە خواردنی ببن بە

موشریک، هەروەک لە تەفسیرەکانی تردا بە ڕوونی دەر دەکەوێ، هۆکاری موشریک بوون لەم ئایەتە گوێڕایەڵی کردنی کەسێکە لە حەلال کردنی شتێک کە الله حەرامی کردووە، گەر تەنها بە گوێڕایەڵی کردنی کافر ببیت بەبێ حەلال کردنی، ئەوا گەر یەکێک لە هاوڕێکانت پێت بڵێ با عەرەق بخۆینەوە تۆش بڵێی باشە، ئەوا بەم کارە کافر دەبیت لە کاتێکدا عەرەق خواردنەوە بە حەرام دەزانیت ! یان هاوڕێکەت پێت دەڵێ: با ئەمشەو بچین بۆ بار، تۆش دەڵێی باشە، بەم کارە کافر دەبیت ئەگەرچی بە حەرامیشی بزانیت ! ئەمەیە تێگەیشتنی خەواریجەکان بۆ ئەم ئایەتە، بەڵام تاکو بۆیان شی نەکەیتەوە خۆشیان نازانن لە چ گێژاوێکدان.

## آدم بن أبي إياس دەڵێ:

حدثنا ورقاء عن ابن أبي نجيح عن **مجاهد ووتی:**

﴿وَإِنَّ ٱلشَّيَـٰطِينَ لَيُوحُونَ إِلَىٰٓ أَوۡلِيَآئِهِمۡ لِيُجَـٰدِلُوكُمۡۖ﴾ موشریکان ووتیان: ئەو ئاژەڵەی الله سەری بڕیوە بۆتان -مەبەستیان ئاژەڵی مردارەوە بووە- نایخۆن، بەڵام ئەو ئاژەڵەی خۆتان سەرتان بڕیوە بۆتان **حەلالە؟!** الله عز وجل فەرمووی: ﴿وَإِنۡ أَطَعۡتُمُوهُمۡ إِنَّكُمۡ لَمُشۡرِكُونَ﴾ گەر گوێڕایەڵیان بکەن ئەوا ئێوە موشریکن.

[تفسير مجاهد : لاپەرە 327]

## ابن أبي حاتم دەڵێ:

حدثنا أبو زرعة حدثنا يحيى بن عبدالله حدثني ابن لهيعة حدثني عطاء عن **سعيد بن جبير:** دەربارەی فەرمایشتی الله: ﴿وَإِنۡ أَطَعۡتُمُوهُمۡ﴾ **ووتی: واتا: گەر گوێڕایەڵیان بکەن لە حەلال کردنی گۆشتی مردارەوە بوو،** ﴿إِنَّكُمۡ لَمُشۡرِكُونَ﴾ **وەک ئەوان موشریکن.**

[تفسير ابن أبي حاتم : 6/356-357]

**الطبري** دەڵێ:

حدثنا المثنى قال حدثنا عبدالله بن صالح قال حدثني معاوية بن صالح عن علي بن أبي طلحة عن **ابن عباس:** دەربارەی فەرمایشتی الله: ﴿فَكُلُواْ مِمَّا ذُكِرَ ٱسْمُ ٱللَّهِ عَلَيْهِ إِن كُنتُم بِـَٔايَـٰتِهِۦ مُؤْمِنِينَ﴾ [الأنعام: ١١٨]، ووتی: موشریکەکان ووتیان: ئەی محمد ئەو ئاژەڵانەی خۆتان کوشتوتانە و سەرتان بڕیوە دەیخۆن، **بەڵام ئەو ئاژەڵانەی کە پەروەردگارتان کوشتویەتی بە حەڕامی دەزانن ؟!** جا الله ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿وَلَا تَأْكُلُواْ مِمَّا لَمْ يُذْكَرِ ٱسْمُ ٱللَّهِ عَلَيْهِ وَإِنَّهُۥ لَفِسْقٌ ۗ وَإِنَّ ٱلشَّيَـٰطِينَ لَيُوحُونَ إِلَىٰٓ أَوْلِيَآئِهِمْ لِيُجَـٰدِلُوكُمْ ۖ وَإِنْ أَطَعْتُمُوهُمْ إِنَّكُمْ لَمُشْرِكُونَ﴾ **گەر گوێڕایەڵیان بکەن لە خواردنی گۆشتی ئەو ئاژەڵانەی کە نەهیم لێکردوون، ئەوا ئێوە موشریکن.**

[تفسير الطبري : 9/523-524]

ووتم: واتا موشریکان مشتومڕی ئەوە دەکەن کە گۆشتی مردارەوە بوو چۆن حەرامە ؟! ئاژەڵێک کە الله مراندوویەتی لە پێشترە گۆشتەکەی حەلال بێت لە گۆشتی ئەو ئاژەڵەی کە خۆتان دەیکوژن، جا بۆیە بە گوێڕایەڵی کردنیان موشریک دەبن چونکە حەرامی الله حەلال دەکەن.

**الطبري** دەڵێ:

حدثني محمد بن الحسين قال حدثنا أحمد بن مفضل قال حدثنا أسباط عن **السدي:**

﴿وَلَا تَأْكُلُواْ مِمَّا لَمْ يُذْكَرِ ٱسْمُ ٱللَّهِ عَلَيْهِ﴾ موشریکەکان بە موسڵمانەکانیان ووت: ئێوە چۆن پێتان وایە شوێنی ڕەزامەندی الله دەکەون لە کاتێکدا ئەو ئاژەڵەی الله کوشتویەتی نایخۆن بەڵام ئەوەی خۆتان سەرتان بڕیوە دەیخۆن؟! الله فەرمووی: گەر

گوێڕایەڵیان بکەن لە خواردنی گۆشتی مردارەوە بوو، ئەوا ئێوە موشریکن.

[تفسير الطبري : 525/9]

**الطبري** دەڵێ:

الله هەواڵیدا کە شەیتانەکان وەحی دەنێرن بۆ ئەولیاکانیان لە مرۆڤ، بۆ ئەوەی مشتومڕ بکەن لەگەڵ ئیمانداران **دەربارەی حەڕام بوونی گۆشتی ئاژەڵی مردارەوە بوو.**

[تفسير الطبري : 527/9]

**الطبري** دەڵێ:

﴿وَإِنۡ أَطَعۡتُمُوهُمۡ إِنَّكُمۡ لَمُشۡرِكُونَ﴾ واتا: گەر گوێڕایەڵیان بکەن لە خواردنی گۆشتی ئاژەڵی مردارەوە بوو، **وە ئەو شتانەی کە پەروەردگارتان لەسەری حەڕام کردوون.**

[تفسير الطبري : 531/9]

**الطبري** دەڵێ:

﴿إِنَّكُمۡ لَمُشۡرِكُونَ﴾ واتا: ئێوە وەک ئەوان موشریکن، چونکە ئەوان گۆشتی مردارەوە بوویان دەخوارد **بە حەلال کردنەوە، جا گەر ئێوەش بەم شێوەیە بیخۆن، ئەوا وەک ئەوان بوونەتە موشریک.**

[تفسير الطبري : 531/9]

**یحیى بن سلام** دەربارەی ئایەتی: ﴿وَلَا تَأۡكُلُواْ مِمَّا لَمۡ يُذۡكَرِ ٱسۡمُ ٱللَّهِ عَلَيۡهِ وَإِنَّهُۥ لَفِسۡقٌۗ وَإِنَّ ٱلشَّيَٰطِينَ لَيُوحُونَ إِلَىٰٓ أَوۡلِيَآئِهِمۡ لِيُجَٰدِلُوكُمۡۖ وَإِنۡ أَطَعۡتُمُوهُمۡ إِنَّكُمۡ لَمُشۡرِكُونَ﴾ دەڵێ:
تەفسیری مجاهد دەڵێ: موشریکەکان مشتومڕیان لەگەڵ موسڵمانان دەکرد دەربارەی ئاژەڵی سەر براو، دەڵێن: ئەوەی خۆتان سەرتان بڕیوە و کوشتوتانە دەیخۆن، بەڵام ئەوەی اللە کوشتویەتی نایخۆن ! وە پێتان وایە شوێنی فرمانی اللە دەکەون ؟! جا اللە ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿وَإِنۡ أَطَعۡتُمُوهُمۡ﴾ **گەر ئاژەڵی مردارەوە بووتان حەلال کرد،** ﴿إِنَّكُمۡ لَمُشۡرِكُونَ﴾ **ئەوا ئێوە موشریکن.**

**[مختصر تفسير يحيى بن سلام لابن أبي زمنين : 95/2]**

**مقاتل بن سلیمان** دەڵێ:
﴿وَلَا تَأۡكُلُواْ مِمَّا لَمۡ يُذۡكَرِ ٱسۡمُ ٱللَّهِ عَلَيۡهِ وَإِنَّهُۥ لَفِسۡقٌۗ﴾ **واتا: گەر ئاژەڵی مردارەوە بوو بخوات ئەوا تاوانە.** ﴿وَإِنَّ ٱلشَّيَٰطِينَ لَيُوحُونَ إِلَىٰٓ أَوۡلِيَآئِهِمۡ﴾ شەیتانەکان وەحی دەنێرن بۆ ئەولیاکانیان لە موشریکان، ﴿لِيُجَٰدِلُوكُمۡۖ﴾ بۆ ئەوەی مشتومڕتان لەگەڵ بکەن دەربارەی سەربڕینی ئاژەڵ، ﴿وَإِنۡ أَطَعۡتُمُوهُمۡ﴾ **گەر گوێڕایەڵیان بکەن لە حەلال کردنی ئاژەڵی مردارەوە بوو،** ﴿إِنَّكُمۡ لَمُشۡرِكُونَ﴾ **ئێوەش وەک ئەوان موشریکن.**

**[تفسير مقاتل بن سليمان : 586/1-587]**

**السمعاني** دەڵێ:
﴿وَإِنۡ أَطَعۡتُمُوهُمۡ إِنَّكُمۡ لَمُشۡرِكُونَ﴾ **واتا: گەر گوێڕایەڵیان بکەن لە حەلال کردنی ئاژەڵی مردارەوە بوو، ئەوا ئێوە موشریکن.**

[تفسير السمعاني : 140/2]

**الزجاج** دەڵێ:

﴿وَإِنۡ أَطَعۡتُمُوهُمۡ إِنَّكُمۡ لَمُشۡرِكُونَ﴾ **ئەم ئایەتە بەڵگەی تێدایە کە هەر کەسێک شتێک حەلاڵ بکات کە الله لەسەری حەڕام کردووە، یان شتێک حەڕام کە الله بۆی حەلاڵ کردووە، ئەوا موشریکە.** گەر کەسێک ئاژەڵی مردارەوە بوو حەلاڵ بکات بەبێ ئەوەی ناچار بێت بیخوات، یان زینا حەلاڵ بکات، ئەوا موشریکە بە ئیجماعی ئوممەت، ئەگەرچی ملکەچی الله بێت لە هەموو ئەو شتانەی فرمانی پێ دەکات، **ناوی لێنراوە موشریک لەبەر ئەوەی شوێنی غەیری الله کەوتووە، شەریکی بۆ الله داناوە.**

[معاني القرآن وإعرابه : 287/2]

**النسفي** دەڵێ:

﴿وَإِنۡ أَطَعۡتُمُوهُمۡ إِنَّكُمۡ لَمُشۡرِكُونَ﴾ **گەر گوێڕایەڵیان بکەن لە حەلاڵ کردنی ئەو شتەی کە الله حەڕامی کردووە،** ﴿إِنَّكُمۡ لَمُشۡرِكُونَ﴾ **ئەوا ئێوە موشریکن**، چونکە ئەوکەسەی شوێنی غەیری الله دەکەوێ **لە دینەکەی ئەوا هاوبەشی بۆ الله داناوە.**

[تفسير النسفي : 533/2]

**ابن تيمية** دەڵێ:

الإله شایستەی عیبادەتە، جا هەر شتێک کە پەرستشی الله-ی پێ دەکرێت ئەوا لە

تەواوی پەرستنی بەندەکانە بۆ الله، جا هەر کەسێک تەکەبور لێ بدات لە هەندێک لە پەرستشەکانی الله، گوێگر و گوێڕایەڵی کەسێکی تر بێت لەم کارەدا، ئەوا ووتەی (لا إله إلا الله)ی بەدی نەهێناوە لەم شوێنەدا.

وە ئەوانەی کە زانا و عابیدەکانیان کرد بە پەروەردگار بەوەی کە گوێڕایەڵیان کردن لە حەلال کردنی ئەوەی الله حەڕامی کردووە، وە لە حەڕام کردنی ئەوەی الله حەلالی کردووە، دوو جۆرن:

**یەکێکیان: دەزانن کە زانا و عابیدەکان دینی الله-یان گۆڕیوە، جا شوێنیان دەکەون لەسەر ئەم گۆڕینە. بڕوایان بە حەلال کردنی ئەو شتانە هەیە کە الله حەڕامی کردووە، وە بڕوایان بە حەڕام کردنی ئەو شتانە هەیە کە الله حەلالی کردووە، شوێنی سەرکردەکانیان دەکەون لەمەدا، لەگەڵ ئەوەشدا دەزانن کە سەرکردەکانیان پێچەوانەی دینی پێغەمبەرانیان کردووە، جا ئەمە کوفرە**، الله و پێغەمبەرەکەی بە شیرکیان داناوە، ئەگەرچی نوێژیش نەکەن بۆ سەرکردەکانیان و سوجدەیان بۆ نەبەن، جا هەر کەسێک شوێنی یەکێک بکەوێ بە پێچەوانەی دین، لەگەڵ ئەوەشدا بزانێ کە ئەمە پێچەوانەی دینە، وە ئەوەی ئەو بیڵێت بڕوای پێ بێت نەک ئەوەی الله و پێغەمبەرەکەی فەرموویانە، ئەوا موشریکە وەک ئەمانە.

**وە دووەمیان: بیروباوەڕ و ئیمانیان بە حەڕام بوونی حەڕام و حەلال بوونی حەلال جێگیر بێت، بەڵام گوێڕایەڵی سەرکردەکانیان بکەن لە سەرپێچی کردنی الله، هەروەک چۆن موسڵمان تاوان ئەنجام دەدات و بڕوای وایە کە تاوانبارە، ئەمانە هەمان حوکمی تاوانبارانی هاوشێوەی خۆیان هەیە.**

**[مجموع الفتاوى : 70/7]**

ووتم: لە خاڵی دووەم کە دەڵێ: بیروباوەڕ و ئیمانیان بە (حەڕام بوونی حەڕام و حەلال بوونی حەلال جێگیر بێت) لە چاپدا نوسراوە (حەڕام بوونی حەلال و حەلال بوونی حەڕام) ئەمەش هەڵەیەکی ڕوونە.

ناصر الفهد دەڵێ: ژمارەیەک لە زانایان ئاماژەیان بەوە داوە کە ئەمە تەصحیفی کۆپی کەرانی کتێبەکەیە، وە ئەوەی دروستە بریتیە لە (حەڕام بوونی حەڕام و حەلال بوونی حەلال).

**[صيانة مجموع الفتاوى من السقط والتصحيف : لاپەرە 59]**

# حوکمی چوونە لای کاهین و بڕوا پێکردنی بەراورد بە حوکم بردنەوە بۆ لای طاغوت

کاهین یەکێکە لە جۆرەکانی طاغوت کە بانگەشەی زانینی غەیب دەکات، تەنانەت لە سەردەمانی پێشوو حوکمیشی دەکرد لەنێوان خەڵکی وەک أبو بردة الأسلمي کاهین کە لە بەشی یەکەم باسمان کرد، جا هەموو طاغوتێک دەبێت کوفری پێ بکەین و لێی بەری بین، کاهینیش یەکێکە لە طاغوتەکان، هەروەک ژمارەیەک لە سەلەف جبت و طاغوتیان بە کاهین تەفسیر کردووە لەم ئایەتەدا: ﴿أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ أُوتُواْ نَصِيبٗا مِّنَ ٱلۡكِتَٰبِ يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡجِبۡتِ وَٱلطَّٰغُوتِ وَيَقُولُونَ لِلَّذِينَ كَفَرُواْ هَٰٓؤُلَآءِ أَهۡدَىٰ مِنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ سَبِيلًا﴾ **[النساء: ٥١].**

**الطبري** دەڵێ:

حدثنا محمد بن بشار قال حدثنا محمد بن جعفر قال حدثنا شعبة عن أبي بشر عن **سعيد بن جبير:** دەربارەی ئەم ئایەتە: ﴿بِٱلۡجِبۡتِ وَٱلطَّٰغُوتِ﴾ **ووتی:**

جبت: ساحیرە بە زمانی حەبەشە، طاغوتیش: کاهینە.

[تفسير الطبري: 7/137]

**الطبري** دەڵێ:

حدثنا ابن المثنى قال حدثنا عبدالأعلى قال حدثنا داود عن **أبي العالية ووتی:**

جبت: ساحیرە، طاغوتیش: کاهینە.

[تفسير الطبري: 7/137]

**الطبري** دەڵێ:

حدثنا بشر قال حدثنا يزيد قال حدثنا سعيد عن **قتادة:**

دەربارەی فەرمایشتی اللە: ﴿يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡجِبۡتِ وَٱلطَّٰغُوتِ﴾ ووتی: ئێمە باسمان دەكرد كە جبت: شەیتانە، طاغوتیش كاهینە.

[تفسير الطبري : 138/7]

**الطبري** دەڵێ:

حدثني محمد بن الحسين قال حدثنا أحمد بن المفضل قال حدثنا أسباط عن **السدي ووتی:**

جبت: شەیتانە، طاغوتیش كاهینە.

[تفسير الطبري : 138/7]

**الطبري** دەڵێ:

حدثنا ابن بشار قال حدثنا حماد بن مسعدة قال حدثنا عوف عن **محمد:**

دەربارەی (الجبت و الطاغوت) ووتی: جبت: كاهینە، ئەوی تریشیان ساحیرە.

[تفسير الطبري : 139/7]

ووتم: (محمد) ابن سيرين-ە.

**الطبري** دەڵێ:

حدثني ابن البرقي قال حدثنا عمرو بن أبي سلمة عن سعيد بن عبدالعزيز: دەربارەی جبت ووتی:

**مكحول ووتی:** كاهینە.

[تفسير الطبري : 139/7]

الله تعالى فەرموویەتی: ﴿يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡجِبۡتِ وَٱلطَّٰغُوتِ﴾ سەرزەنشتیان دەکات کە ئیمانیان بە جبت و طاغوت هەیە، مانای پێچەوانەی ئایەتەکە ئەوەیە کە دەبێت کافر بن بە جبت و بە طاغوت نەک ئیمانیان پێی هەبێت، وە کاتێک ژمارەیەک لە سەلەف هەریەکە لە جبت و لە طاغوت بە کاهین تەفسیر دەکەن، کەواتە دەبێت کافر بین بە کاهین چونکە جۆرێکە لە جۆرەکانی طاغوت.

**الطبري** دەڵێ:

﴿يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡجِبۡتِ وَٱلطَّٰغُوتِ﴾ واتا: بڕوا دەهێنن بە جبت و طاغوت، وە کوفر دەکەن بە الله، وە ئەوان دەزانن کە ئیمان هەبوون بە جبت و طاغوت کوفرە بە الله، وە بڕوا پێکردنیان شیرکە.

[تفسير الطبري : 134/7]

**الطبري** دەڵێ:

صەواب لەم ووتانەی کە ووتران لە تەفسیری فەرمایشتی الله: ﴿يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡجِبۡتِ وَٱلطَّٰغُوتِ﴾ ئەوەیە کە بووترێ: بڕوایان بە دوو پەرستراو هەیە لەبڕی الله، دەیانپەرستن لەبڕی الله، وە دەیانکەن بە خوا، الجبت و الطاغوت دوو ناون بۆ هەموو شتێک کە گەورە کرا بێت بە عیبادەت کردن بۆی لەبڕی الله، یان بە گویڕایەڵی کردن، یان بە ملکەچ بوون بۆی، جا هەر کەسێک بێت ئەم گەورە کراوە لە بەرد یان لە مرۆڤ یان لە شەیتان، جا کاتێک کە شتەکە ئاوایە ئەوا ئەو بتانەی کە ئەهلی جاهیلی

دەیانپەرستن گەورە کرا بوون بە عیبادەت کردن بۆیان لەبڕی الله، جبت و طاغوت بوون، وە بە هەمان شێوە ئەو شەیتانانەی کە کافران گوێڕایەڵیان دەکردن لە سەرپێچی کردنی الله دا، جبت و طاغوت بوون، **وە بە هەمان شێوە ساحیر وکاهین کە ووتەکانیان قبوڵ کراو بوو لەلای ئەهلی شیرک، جبت و طاغوت بوون، وە بە هەمان شێوە حيي بن أخطب وكعب بن الأشرف لەبەر ئەوەی ئەم دووانە گوێڕایەڵی دەکران لەناو ئەهلی دینەکەیان لە یەهود لە سەرپێچی کردنی الله و کافر بوون بە الله و بە پێغەمبەرەکەی، جا ئەمانەش دوو جبت و دوو طاغوت بوون.**

**[تفسير الطبري : 7/140-141]**

ووتم: ووتەکەی الطبري ئەوە دەردەخات کە أبو بردة الأسلمي کاهین و كعب بن الأشرف دوو کەسی ئاسایی نەبوونە بەڵکو ووتەکانیان قبوڵ کراوە وەک شەرعێک، لە دیندا گویڕایەڵی ووتەکانیان کراوە وەک پێشتر باسمان کرد.

**ابن أبي حاتم** دەڵێ:

حدثنا أبو سعيد الأشج حدثنا عقبة عن حنش بن الحارث ووتی:

**بیستم الشعبي دەیووت:** جبت: کاهینە.

ابن أبي حاتم دەڵێ: وە ڕیوایەت کراوە لە سعید بن جبیر لە یەکێک لە ڕیوایەتەکاندا، وە ڕیوایەت کراوە لە الضحاك و یحیی بن أبي کثیر و خصیف وتوویانە: جبت: کاهینە.

**[تفسير ابن أبي حاتم : 4/295]**

**ابن أبي حاتم** دەڵێ:

حدثنا أبو سعيد الأشج حدثنا عبيدالله بن موسى عن إسرائيل عن السدي عن **أبي مالك ووتی:**

طاغوت: کاهینە.

ابن أبي حاتم دەڵێ: وە ڕیوایەت کراوە لە أبو العالية لە یەکێک لە ڕیوایەتەکاندا، وە لە عکرمة لە یەکێک لە ڕیوایەتەکاندا، وە لە الشعبي لە یەکێک لە ڕیوایەتەکاندا، وە لە سعيد بن جبير نزیک لەمەوە.

**[تفسير ابن أبي حاتم : 297/4]**

کەواتە کاهین طاغوتە دەبێت پێی کافر بین، ئەوەی کوفری پێ نەکات ئەوا کافرە و (لا إله إلا الله)ی بەجێ نەهێناوە، جا با بزانین زانایان چیان ووتوە دەربارەی چوونە لای کاهین و بڕوا پێکردنی هەروەک لە فەرموودەدا هاتووە.

**أبو عبيد القاسم بن سلام** دەڵێ:

باب: (الخروج من الإيمان بالمعاصي) واتا: چوونە دەرەوە لە ئیمان بە تاوانەکان.

**[الجامع في كتب الإيمان والرد على المرجئة لعادل / كتاب الإيمان لأبي عبيد : لاپەرە 64]**

أبو عبيد لە ژێر ئەم بابەدا چەند فەرموودەیەک دەهێنێت کە تێیدا باسی کوفر و شیرک و نەفی کردنی ئیمان و بەری بوونی پێغەمبەر ﷺ کراوە.

لە چوار چێوەیاندا ئەم فەرموودەیە دەهێنێت:

(ئەوەی بچێتە لای ساحیرێک یان **کاهینێک جا بڕوا بەوە بکات کە دەیڵێ**، یان بچێتە لای ئافرەتێک لە سوڕی مانگانەدا بێت یان لەدواوە بچێتە لای، ئەوا بەری بووە لەوەی کە بەسەر محمد ﷺ دابەزیوە، یان کافر بووە بەوەی کە بەسەر محمد

ﷺ دابەزیوە).

**بڕوانە [الجامع في كتب الإيمان والرد على المرجئة لعادل / كتاب الإيمان لأبي عبيد : ژمارە 96]**

دوای هێنانی فەرموودەکان لەسەر هەر چوار جۆرەکە، پاشان ڕەددی ئەوانە دەداتەوە کە پێیان وایە ئەم فەرموودانە مەبەست پێی کوفری نیعمەتە، وە ڕەددی ئەوانە دەداتەوە کە پێیان وایە ئەم فەرموودانە تەنها بۆ هەڕەشە و ترساندنە حەقیقەتی نیە، وە ڕەددی ئەوانە دەداتەوە کە کوفر و شیرک لەم فەرموودانە بە هەڵگەڕانەوە لە دین دادەنێن، وە پێیان دەڵێ: خەواریج، وە ڕەددی ئەوانە دەداتەوە کە ئەم فەرموودانە هەمووی ڕەت دەکەنەوە و بە زەعیفی دەزانن.

**بڕوانە [الجامع في كتب الإيمان والرد على المرجئة لعادل / كتاب الإيمان لأبي عبيد : لاپەرە 70-73]**

ئینجا لە کۆتاییدا مەزهەبی ئەهلی سوننە باس دەکات دەڵێ:

**لەلای ئێمە هەموو فەرموودەکانی ئەم بابە ئەوەیە کە تاوانەکان ئیمان لانابەرن و کوفر جێگیر ناکەن**، بەڵام نەفی حەقیقەت و ئیخلاصی ئیمان دەکات کە الله ئەهلی ئیمانی پێ وەصف کردووە.

**بڕوانە [الجامع في كتب الإيمان والرد على المرجئة لعادل / كتاب الإيمان لأبي عبيد : لاپەرە 74]**

## ابن بطة دەڵێ:

حدثنا أبو العباس عبدالله بن عبدالرحمن العسكري قال حدثنا محمد ابن عبيدالله بن المنادي قال حدثنا روح بن عبادة.

وحدثنا إسحاق الكاذي قال حدثنا عبدالله بن أحمد قال حدثنا أبي قال حدثنا روح قال حدثنا عوف عن خلاس عن أبي هريرة ووتی: **پێغەمبەری الله ﷺ فەرمووی:**

**هەر کەسێک بچێتە لای عەررافێک یان کاهینێک جا بڕوا بەوە بکات کە دەیڵێ،**

ئەوا کافر بووە بەوەی کە بەسەر محمد ﷺ دابەزیوە.

**[الإبانة الكبرى : ژمارە 1059]**

**ابن بطة** دەڵێ:

حدثنا إسحاق بن أحمد قال حدثنا عبدالله بن أحمد قال حدثني أبي قال حدثنا يحيى بن سعيد عن عوف قال حدثنا خلاس عن أبي هريرة و الحسن عن **النبي** ﷺ **فەرمووی:**

**هەر کەسێک بچێتە لای کاهینێک** یان عەررافێک، ئەوا کافر بووە بەوەی کە بەسەر محمد ﷺ دابەزیوە.

**[الإبانة الكبرى : ژمارە 1060]**

**ابن بطة** دەڵێ:

حدثنا إسحاق الكاذي قال حدثنا عبدالله بن أحمد قال حدثني أبي قال حدثنا وكيع قال حدثنا حماد بن سلمة عن حكيم الأثرم عن أبي تميمة الهجيمي عن أبي هريرة ووتی:

**پێغەمبەری الله ﷺ فەرمووی: هەر کەسێک بچێتە لای کاهینێک جا بڕوا بەوە بکات کە دەیڵێ**، ئەوا کافر بووە بەوەی کە بەسەر محمد ﷺ دابەزیوە.

**[الإبانة الكبرى : ژمارە 1061]**

**ابن بطة** دەڵێ:

حدثنا أبو جعفر محمد بن عمرو بن البختري قال حدثنا عبدالرحمن بن منصور الحارثي قال حدثنا يحيى بن سعيد عن عبيدالله قال حدثني نافع عن صفية عن بعض أزواج النبي ﷺ عن **النبي** ﷺ

**فەرمووی: هەر کەسێک بچێتە لای عەررافێک جا بڕوا بەوە بکات کە دەیڵێ،**

ئەوا چل ڕۆژ نوێژی لێ قبوڵ ناکرێ.

**[الإبانة الكبرى : ژمارە 1062]**

ووتم: ابن بطة ئەم چوار فەرموودەیەی لە ژێر بابی کوفری بچووک هێناوە، بڕوانە **[الإبانة الكبرى : 430/1]**، هەروەها ابن القيم هەمان فەرموودەی هێناوە لە چوار چێوەی کوفرە بچووکەکاندا، بڕوانە **[الصلاة : لاپەرە 90]**

(عن صفية عن بعض أزواج النبي ﷺ) لە تەحقیقی عادل آل حمدان و چاپی دار الراية بەم جۆرە هاتووە، کە ئەمەش هەڵەیە پێغەمبەر ﷺ لە سەنەد بوونی نەماوە، مسلم لە صەحیحەکەی هەمان فەرموودەی ڕیوایەت کردووە لە (محمد بن المثنى العنزي عن يحيى بن سعيد ... بە هەمان سەنەد لە پێغەمبەرەوە ﷺ)، بەڵام بە لەفزی: (فسأله) واتا پرسیاری لێ بکات، نەک (فصدقه) واتا بڕوای پێ بکات، بڕوانە **[صحيح مسلم : ژمارە 2230]**، وە ئیمام أحمد دوو جار ئەم فەرموودەیەی هێناوە لە موسنەدەکەی لە (يحيى بن سعيد ... بە هەمان سەنەد لە پێغەمبەرەوە ﷺ)، بەڵام بە لەفزی: (فصدقه) واتا بڕوای پێ بکات، بڕوانە **[مسند أحمد : ژمارە 16638 - 23222]**.

**الترمذي** دەڵێ:

حدثنا بندار قال حدثنا يحيى بن سعيد و عبدالرحمن بن مهدي و بهز بن أسد قالوا حدثنا حماد بن سلمة عن حكيم الأثرم عن أبي تميمة الهجيمي عن أبي هريرة عن **النبي ﷺ فەرمووی:**

هەر کەسێک بچێتە لای ئافرەتێک کە لە سوڕی مانگانەدا بێت یان بچێتە لای ئافرەتێک لەدواوە یان **بچێتە لای کاهینێک**، ئەوا کافر بووە بەوەی کە بەسەر محمد دابەزیوە.

الترمذي دەڵێ: ئەم فەرموودەیە ناناسین تەنها لە ڕێگای حکیم الأثرم عن أبي تميمة الهجيمي عن أبي هريرة نەبێت.

**مانای ئەم فەرموودەیە لەلای زانایان توندی هەڕەشەیە**، وە ڕیوایەت کراوە لە پێغەمبەر ﷺ کە فەرموویەتی: هەر کەسێک چووە لای ئافرەتێک کە لە سوڕی مانگانەدا بوو، ئەوا با دینارێک ببەخشێت.

جا گەر چوونە لای ئافرەت لە سوڕی مانگانەدا کوفر بوایە، ئەوا فرمانی پێ نەدەکرا بە پێدانی کەفارەت.

وە محمد ئەم فەرموودەیەی بە زەعیف داناوە لە ڕووی سەنەدەوە.

وە أبو تميمة الهجيمي ناوی طريف بن مجالد-ە.

**[جامع الترمذي : ژمارە 135]**

ووتم: مەبەستی لە (محمد) محمد بن إسماعيل البخاري-ە خاوەنی صەحیح، مەبەستی ئەوەیە ئەم سەنەدە زەعیفە نەک ئەصڵی فەرموودەکە زەعیف بێت، چونکە بە سەنەدی تر هاتووە.

**محمد بن علي بن غريب** (لە وەڵامدانەوەی عبدالله أفندي الراوي) دەڵێ:

سەبارەت بە ووتەکەتان کە دەڵێن: (البخاري بابێکی داناوە لە صەحیحەکەی بە ناونیشانی کفر دون کفر).

**دەڵێین: هەر کەسێک خاوەنی شەرع ووشەی (کوفر)ی بۆ بەکار هێنا بێت بەهۆی ئەو تاوانانەی کە لە دین نایخاتە دەرەوە، وەک:** خۆدانە پاڵی بۆ لای غەیری باوکی، **وە ئەوەی بچێتە لای عەررافێک جا بڕوا بەوە بکات کە دەیڵێ،** یان بچێتە لای ئافرەتێک لە سوڕی مانگانەدا یان لەدواوە بچێتە لای، وە هاوشێوەی

ئەم تاوانانە، **هاتنی ووشەی کوفر بۆ توندیە بەهۆیەوە لە دین دەرناچێت، بەڵکو کوفری نیعمەتە، کۆمەڵێک لە زانایان ئەمەیان نەقلیان کردووە لە پێشەوایانی فیقهـ و فەرموودە**، وە ابن رجب باسی کردووە لە شەرحی صەحیحی البخاري وەک شەرح کەرەکانی تر، **لە زۆرێک لە زانایانەوە نەقلی کردووە**، وە القاضي عیاض و ژمارەیەک لە زانایان دەربارەی فەرموودەی: (ئەوەی بچێتە لای عەررافێک ئەوا کافر بووە بەوەی کە بەسەر محمد دابەزیوە) وتوویانە: واتا ئینکاری هەواڵ پێدانی پێغەمبەر بکات دەربارەی درۆزنی عەررافەکان، مانای ئەوەیە گەر بڕوای بە ڕاستگۆیی عەررافەکان هەبێت دوای ئەوەی زانی پێغەمبەر ﷺ بە درۆی خستوونەتەوە ئەوا کافرە کوفرێکی حەقیقی، وە ئەوەی القاضي عیاض ووتی هیچ موخالەفەیەکی تێدا نیە گەر مەرجەکەی بێتە دی کە بە درۆ دانانی پێغەمبەرە لەوەی کە پێی هاتووە، وە بە درۆ دانانی قورئانە.

**[التوضيح عن توحيد الخلاق في جواب أهل العراق : 1/405-407]**

خیلاف هەیە لای زانایان کە ئایا (الکاهن و العراف) هەمان کەسن، یان دوو کەسی جیاوازن، هەندێکیان دەڵێن: هەمان کەسن، ئەو کەسانەن کە بانگەشەی زانینی غەیب دەکەن، وە هەندێکیان دەڵێن: العراف جیایە لە الکاهن، العراف واتا فاڵچی بانگەشەی زانینی ئەو شتانە شاراوانە دەکات کە لە ڕابردوو ڕوویانداوە بە لێکدانەوەی چەند شتێک، بەڵام الکاهن بانگەشەی زانینی شتە غەیبیەکانی داهاتوو دەکات و لە ڕێگای شەیتانەکانەوە هەواڵی بۆ دێت جا حوکم دەکات لەنێوان خەڵکیدا، شەیتانەکان هەواڵ دەدزن لە ئاسمانەوە کە لە فریشتەکانی دەبیستن، ئینجا دەیهێنن بۆ لای کاهینەکان، ئەوانیش کۆمەڵێک درۆی دەخەنە سەر هەواڵە ڕاستەکە، جا کاتێک بە خەڵکی دەڵێن ئەم شتە ڕوو دەدات و هەواڵەکەیان ڕاست دەردەچێت، خەڵکی وادەزانن کاهینەکان غەیب دەزانن، جا بە گەورە سەیریان دەکەن

و حوكم دەبەنەوە بۆ لایان و پرسیاری غەیبیان لێ دەكەن، هەر بۆیەش كاتی خۆی لە مەدینە مونافیق و یەهودییەكان حوكمیان دەبردەوە بۆ لای أبو بردة الأسلمي كە كاهین بوو پێش ئەوەی ببێتە موسڵمان، وە كاهینەكان خۆیان دەكەن بە زمانحاڵی بتەكان، دەڵێن ئەم بتە داوای قوربانیتان لێ دەكات، ئەم بتە داوا دەكات ئەمە و ئەوەی بۆ بكەن.

**ابن أبي حاتم** دەڵێ:
أخبرنا محمد بن سعد العوفي -فيما كتب إلي- حدثني أبي حدثني عمي الحسين حدثني أبي عن أبيه عن **ابن عباس ووتی:** طاغوت: ئەوانەن كە لە بەردەمی بتەكانن، بەناوی بتەكانەوە درۆ دەكەن بۆ ئەوەی خەڵكی گومڕا بكەن.

**[تفسير ابن أبي حاتم : 4/296-297]**

**ابن أبي حاتم** دەڵێ:
حدثنا أبي قال حدثنا إسحاق بن الضيف حدثنا حجاج عن ابن جريج أخبرني أبو الزبير:
لە جابر بن عبدالله بیستوویەتی كە پرسیاری لێكراوە دەربارەی **طاغوتەكان، ئەویش وتوویەتی: كاهینەكانن**، شەیتان بەسەریان دادەبەزێ.

**[تفسير ابن أبي حاتم : 4/297]**

كاهینەكان لەلایەن شەیتانەوە وەحیان بۆ هاتووە و فرمانی شەیتانیان جێبەجێ كردووە، هەر بۆیە مجاهد دەڵێ: (طاغوت) شەیتانە لەسەر شێوەی مرۆڤ، واتا فرمانەكانی شەیتان ئەنجام دەدات و شەیتانێكە بۆخۆی بەڵام شێوەكەی مرۆڤە.

**آدم بن أبي إياس** دەڵێ:

حدثنا ورقاء عن ابن أبي نجيح عن **مجاهد ووتی:**

طاغوت: شەیتانە لەسەر شێوەی مرۆڤێک، حوکم دەبەنەوە بۆ لای، ئەویش خاوەنی کاروباریانە.

[تفسير مجاهد : لاپەرە 284]

**يحيى بن سلام** دەڵێ:

الكلبي دەڵێ: لەنێوان پیاوێک لە مونافیقەکان و پیاوێک لە یەهود ناکۆکی هەبوو، یەهودییەکە ووتی: با بچین بۆ لای محمد ناکۆکیمان ببەینەوە بۆ لای، مونافیقەکە ووتی: نەخێر، بەڵکو دەچین بۆ لای كعب بن الأشرف.

يحيى بن سلام دەڵێ: كعب بن الأشرف-ە ناوی لێنراوە طاغوت لە ئایەتەکەدا بە پێی ووتەکەی الكلبي، وە هەندێکیان دەڵێن: مونافیقەکە ویستی **حوکمەکە بەرێتەوە بۆ لای کاهینێک** لە مەدینە، جا الله تعالى فەرمووی: ﴿يُرِيدُونَ أَن يَتَحَاكَمُوٓاْ إِلَى ٱلطَّٰغُوتِ وَقَدۡ أُمِرُوٓاْ أَن يَكۡفُرُواْ بِهِۦۖ﴾ [النساء: ٦٠]، **الله تعالى** فەرموویەتی: ﴿وَيُرِيدُ ٱلشَّيۡطَٰنُ أَن يُضِلَّهُمۡ ضَلَٰلَۢا بَعِيدٗا﴾ ، ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمۡ تَعَالَوۡاْ إِلَىٰ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ وَإِلَى ٱلرَّسُولِ رَأَيۡتَ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ يَصُدُّونَ عَنكَ صُدُودٗا﴾ [النساء: ٦٠-٦١]، **طاغوت: شەیتانە، کاهینیش هەر کاری شەیتانە، وە ئیمان هەبوون بە شەیتان کافر بوونە بە الله، وە ئیمان هەبوونیش بە الله کافر بوونە بە شەیتان، الله فەرموویەتی:** ﴿فَمَن يَكۡفُرۡ بِٱلطَّٰغُوتِ وَيُؤۡمِنۢ بِٱللَّهِ فَقَدِ ٱسۡتَمۡسَكَ بِٱلۡعُرۡوَةِ ٱلۡوُثۡقَىٰ﴾ [البقرة: ٢٥٦].

باسیان کردووە لە الحسن البصري کە وتوویەتی: پێغەمبەری الله ﷺ فەرموویەتی: (**ئەوەی بچێتە لای عەررافێک جا بڕوا بەوە بکات کە دەیڵێ** ئەوا کافر بووە بەوەی

کە بەسەر محمد دابەزیوە).

وە باسیان کردووە کە عبدالله بن مسعود وتوویەتی: **ئەوەی بچێتە لای کاهینێک جا بڕوا بەوە بکات کە دەیڵێ**، ئەوا کافر بووە بەوەی کە بەسەر محمد دابەزیوە.

[مختصر تفسیر یحیی بن سلام لهود بن محکم الهواري : 1/393-394]

ووتم: لە چاپدا ئایەتی (فمن یکفر بالطاغوت) بەم جۆرە هاتووە (ومن یکفر بالطاغوت)، وە لە هیچ کام لە قیرائەتەکان بە پیتی (و) نەهاتووە هەمووی بە پیتی (ف) هاتووە.

جا بڕوانە یحیی بن سلام چەند بابەتێکی بەیەکەوە باسکرد و پەیوەستی کردن بەیەکترەوە، وەک: حوکم بردنەوە بۆ لای کاهین، وە هێنانی ئایەتەکەی سورەتی البقرة کە کوفر کردن بە طاغوت و ئیمان هێنان بە الله-ی تێدایە وە بەستنەوەی بە مانای ئایەتی (٦٠)ی سورەتی النساء، وە وەصف کردنی کاهین بەوەی کە کاری شەیتان ئەنجام دەدات، وە هێنانی فەرموودەی بڕوا کردن بە کاهین، هەموو ئەمانە مانای ئەوەیە کە کاهین طاغوتە و دەبێت پێی کافر بین.

هەندێک لە معاصرین دەڵێن: مادام بە دوو لەفز فەرموودەکە هاتووە، بە لەفزی (فسألە) و بە لەفزی (فصدقە) کەواتە گەر تەنها پرسیار لە کاهینەکە بکات ئەوا چل ڕۆژ نوێژی لێ قبوڵ ناکرێ، بەڵام گەر بڕوای پێ بکات ئەوا کافر دەبێت.

بەڵام ئەم ووتەیە جێگای تێڕامانە چونکە هەر یەک لە أبو عبید و الترمذي و ابن بطة و ابن القیم و محمد بن علي بن غریب کە ئەمەی دایە پاڵ کۆمەڵێک زانای تریش کە ئەم فەرموودەیان بە کوفری بچووک داناوە بە لەفزی (فصدقە بما یقول، فقد کفر بما أنزل علی محمد) واتا گەر بڕواشی پێ بکات هەر کوفری بچووکە، بەڵام ئایا ئەم کوفرە بچووکە چۆن دەبێتە کوفری گەورە لە چ حاڵێکدا ؟ هەندێک دەڵێن گەر لەبەر ئەوەی شەیتانەکان لە ئاسمانەوە هەواڵ بۆ دێنن بۆیە خەڵک باوەڕی پێ دەکەن نەک لەبەر خودی کاهینەکە باوەڕ

پێ بکەن ئەمەش بۆتە ڕێگر لە چوونە دەرەوەیان لە دین، هەندێک دەڵێن گەر بڕوای وابێت کاهینەکە غەیبی گشتی دەزانێت وەک الله ئەوکات لە دین دەردەچێت و کوفری گەورەیە بەڵام گەر تەنها لە بەشێکی بچووک بڕوای پێ بکات کوفری بچووکە، هەندێک دەڵێن گەر ئایەتی قورئان و فەرموودەی پێغەمبەر ڕەت بکاتەوە کە تێیدا هاتووە کاهینەکان درۆزنن ئەوکات کوفری گەورەیە وەک محمد بن علي بن غريب باسی کرد، وە تا ئێستا بۆم ڕوون نەبۆتەوە بە دیاریکراوی لە چ حاڵەتێکدا ئەم بڕوا پێکردنە دەبێتە کوفری بچووک، بۆیە قسەی تێدا ناکەم و دەڵێم: الله أعلم، وە لێرەدا مەبەستم ئەوە نیە کە ئەمە ڕێک قیاس بکرێتە سەر طاغوتی حوکم، بڵێین: مادام کاهین کە طاغوتە بڕوا پێکردنی تەفصیلی تێدایە و بە ڕەهایی کوفر نیە، ئەوا بە هەمان شێوە طاغوتی حوکم بڕوا کردن بە حوکمەکانی بە ڕەهایی کوفر نیە دەکرێ هەندێک جار بڕوا بە حوکمەکانی بکەیت، بەڵکو ئەوەی مەبەستمە لە هێنانی ئەم بابەتە ئەوەیە: کاهین جۆرێکە لە جۆرەکانی طاغوت کە دەبێت پێی کافر بین، هەروەک چۆن طاغوتی حوکم هەیە و دەبێت پێی کافر بین، جا ئەگەر بڕوا پێکردن بەم کاهینە لەلای سەلەف بە ڕەهایی بە کوفر دانەنرێت و تەفصیلی هەبێت، ئەی چۆن موسڵمانێک کە بەرییە لە طاغوتی حوکم و بە حوکمەکانی ڕازی نیە و بە باطلی دەزانێت بەڵام لە ناچاری حوکم دەباتەوە بۆ لای بۆ وەرگرتنەوەی حەقەکەی یان لەبەر ئارەزووی ماڵی دونیا، چۆن تەکفیر دەکرێت ؟! تەنانەت لەسەر ووتەی ئەو زانایانەی کە دەوەستن لە بابەتی بڕوا پێکردن بە کاهین، کوفری فەرموودەکە تەفسیر ناکەن، نە دەڵێن کوفری گەورەیە نە دەڵێن کوفری بچووکە کە هەندێک لە حەنبەلیەکان ئەمەیان داوەتە پاڵ ئیمام أحمد، وە لەسەر ووتەی ئەو زانایانەش کە دەڵێن بڕوا کردن بە کاهین بە ڕەهایی کوفرە ڕووکەشی فەرموودەکە وەردەگرن، لەسەر ووتەی ئەم دووانەش نابێت حوکم بردنەوە بۆ طاغوتی حوکم بە ڕەهایی کوفر بێت، چونکە کوفرەکە بەند کراوە بە بڕوا کردن بە کاهینەکە (فصدقه) واتا گەر بڕوای پێکرد کافر دەبێت، کەواتە گەر حوکمی بردەوە بۆ لای طاغوت بەڵام بڕوای بە حوکمی طاغوت نەبوو ئەوا کافر نابێت.

# پوختەی ووتە
# دەربارەی حوکم بردنەوە بۆ غەیری شەرعی الله

بە پێی ئەم ووتانەی هێنامان لەم بەشەدا گەیشتین بەوەی کە مەنهەجی ئەهلی سوننە لە بابەتی حوکم بردنەوە بۆ غەیری شەرعی الله بەم جۆرەیە:

**یەکەم:** حوکم بردنەوە بۆ غەیری شەرعی الله لە ئەصلدا تاوانە.

**دووەم:** گەر ڕقی لە شەرعی الله بێتەوە یان تانە لە حوکمەکانی بدات ئەوا کوفری گەورەیە.

**سێیەم:** بڕوای بە جگە لە شەرعی الله هەبێت یان بە باشتری بزانێت لە شەرعی الله، بەم نیەتە حوکمی بۆ بباتەوە ئەوا کوفری گەورەیە.

**چوارەم:** هەموو جۆرە حوکم بردنەوەیەک بۆ غەیری شەرعی الله تەعزیم کردن و پیرۆزڕاگرتن و ڕێزگرتنی حوکمەکەی تێدا بێت ئەوا دەبێتە کوفری گەورە، وەک ووتنی یاسا سەروەرە، یاسا لە سەرووی هەموومانەوەیە، ملم لە موو باریکترە بەرامبەر یاسا، وەک ئەوەی کە زۆرینەی خەڵکی ئەم سەردەمە توشی هاتوون لەگەڵ دروست بوونی هەر ڕووداوێک یەکەم شت کە بە خەیاڵیان دێت حوکم بردنەوەیە بۆ یاسا دانراوەکان بەوپەڕی ملکەچی و قبوڵ کردنەوە، هەرگیز بە خەیاڵیان نایەت حوکم بەرنەوە بۆ شەرع لەنێوان خۆیان یان کەسی شارەزا لە شەرع بکەن بە حاکم لەنێوان خۆیان حوکمیان بکات بە پێی شەرعی الله.

**پێنجەم:** گەر حوکمی غەیری الله موافقی حوکمی الله بوو ئەگەرچی لە حوکمی الله وەرنەگیرا بوو وەک (حلف الفضول)، وە هیچ ڕێگایەکی تریش نەبوو لە بەردەم موسڵمان جگە لە حوکم بردنەوە بۆی، ئەوا نابێتە تاوان بەو مەرجەی داوای زیاتر لەو حەقە نەکات کە شەرع بۆی داناوە، گەر لەوە زیاتری پێ درا قبوڵی نەبێت، وە داوای هیچ سزایەک نەکات کە پێچەوانەی شەرع بێت، وە نیازی لە حوکم بردنەوەکە تەنها وەرگرتنەوەی حەقەکەی بێت نەک سزا

دانراوەکانی مرۆڤ جێبەجێ بکات، لەم حاڵەتەدا موسڵمان یاسا و حاکمەکانی وەک هۆکارێک بەکارهێناوە تەنها بۆ وەرگرتنەوەی حەقەکەی کە مافی شەرعی خۆیەتی، بۆیە تاوانبار نیە گەر جگە لەم ڕێگایە هیچ ڕێگایەکی تری نەبێت.

**شەشەم:** گەر موسڵمان پابەند بێت بە حوکمی الله لە ناخ و ڕووکەشدا، وە بەری بێت لە هەموو حوکمێکی تر، بەڵام لەبەر ئارەزووی ماڵی دونیا و بەرژەوەندیەکانی حوکم بەرێتەوە بۆ غەیری شەرعی الله چونکە دەزانێت حوکمی غەیری الله لەم بابەتەدا لە بەرژەوەندی ئەودایە، وە حوکمی الله لەم بابەتەدا لە دژیەتی، ئەوا تاوانێکی گەورەی ئەنجام داوە بەڵام نابێتە کوفر.

**حەوتەم:** لەکاتی نەبوونی حوکمی ئیسلام، کە تەنها یاسا دانراوەکان هەبن، لایەنی بەرامبەر موسڵمانێک توشی مەحکەمەی طاغوتان بکات، یان موسڵمانەکە لایەنی بەرامبەر بانگ بکات بۆ شەرعی الله بەڵام ئەو بە دەمیەوە نەچێت بڵێ جگە لە یاسا بە هیچ شتێکی تر مامەڵەت لەگەڵ ناکەم، ئەوا نابێتە کوفر بەڵکو نابێتە تاوانیش گەر لایەنی بەرامبەر سکاڵات لەسەر تۆمار بکات و ڕات بکێشێ بۆ مەحکەمەی طاغوتان، وە ئەگەر حەقی موسڵمانەکە لای کەسەکە بوو بەڵام ئەو کەسە جگە لە یاسا بۆ هیچ شتێکی تر ملکەچ نەدەبوو، موسڵمانەکەش بە ناچاری حوکمی بردەوە بۆ یاسا ئەوا نابێتە کوفر، بگرە ڕەنگە تاوانباریش نەبێت گەر بابەتەکە شتێکی گرنگ و زەرورەت بێت کە بواری ئەوەی تێدا نەبێت لە کەسی بەرامبەر خۆش بێت و چاوپۆشی لێ بکات.

**هەشتەم:** گەر خودی یاساکە کوفر بوو ئەوا حوکم بردنەوە بۆی کوفرە.

ئەو بابەتانەی کە ڕاییکردنی مامەڵەیە (معاملات) ناچنە ناو بابەتی حوکم بردنەوە، بەڵام دەبێت سەیری مامەڵە بکرێ ئایا کوفر یان تاوانی تێدا نیە تاکو موسڵمان خۆی لێ بپارێزێ، چونکە هەروەک چۆن لەنێوان خەڵکیدا مامەڵە هەیە حەرامە، بە هەمان شێوە حکومەتەکانیش هەندێک مامەڵەی حەرام ئەنجام دەدەن ڕەنگە هەندێکیان کوفریش بێت.

وە پێویستە بزانرێ لە بابەتی حوکم بردنەوە بۆ غەیری شەرعی الله بواری تەکفیر دیاریکراوە کە کامە حوکم بردنەوە دەبێتە کوفر و کامەی نابێتە کوفر، بەڵام بواری تاوانباری فراوانترە و جێگای خیلافە، ئایا کەی موسڵمان عوزری هەیە و توشی تاوان نابێت، وە کەی عوزری نیە توشی تاوان دەبێت، جا ئاساییە خیلاف هەبێت دەربارەی ئەوەی موسڵمان لە حوکم بردنەوەیەکی دیاریکراودا بووترێ تاوانبارە یان تاوانبار نیە و عوزری هەیە، بەڵام بابەتی تەکفیر کردنەکە ڕوونترە کەی دەبێتە کوفر و کەی نابێتە کوفر، وە پێویستە لەکاتی نەبوونی هیچ چارێک لە بەردەم موسڵمان کە ناچار بوو حوکم بەرێتەوە بۆ لای یاسا پرسیار لە کەسانی شارەزا بکات کە ئایا لەو حاڵەت و ڕووداوەدا عوزری هەیە حوکم بەرێتەوە یان بە حوکم بردنەوەکەی تاوانبار دەبێت، چونکە کەسانێک هەن ڕەچاوی زەرورەت و زیانەکان ناکەن ڕەنگە لە پێناوی برە پارەیەکی زۆر کەم یان شتێکی زۆر بێ نرخ حوکم بەرنەوە بۆ لای یاسا، جا مادام ئەصل لە حوکم بردنەوە بۆ غەیری شەرعی الله تاوانە، زەرورەتیش تاوانەکان لادەبەن، ئەوا دەبێت ڕەچاوی مەفسەدە و مەصلەحە و مەرجەکانی زەرورەت بکرێن، وە پرسیار لە کەسانی شارەزا بکرێن کە کێ حاڵەکەی زەرورەتە و تاوانبار نابێت، وە کێ حاڵەکەی زەرورەت نیە و تاوانبار دەبێت.

وە ئامۆژگاری هەموو موسڵمانێک دەکەم لەکاتی هەبوونی هەر ڕووداوێکدا سەرەتا حوکم بەرنەوە بۆ لای شەرع و لایەنی بەرامبەر بۆ حوکمی شەرع بانگ بکەن، ئەگەرچی لایەنی بەرامبەر مورتەددیش بێت چونکە زۆربەی مورتەددەکانی ئەمڕۆ خۆیان بە موسڵمان دەزانن و قبوڵیان نیە پێیان بووترێ کافر، کەواتە دەتوانی سۆزی ڕابکێشیت بەوەی کە بووترێ: مادام هەردووکمان خۆمان بە موسڵمان دەزانین با حوکم بکەین بە شەرعی الله، وە پێویستە کەسانێکی شارەزا لە دین لە شار و گوندەکان حوکم کردن لەنێوان خەڵکی بگرنە ئەستۆ، هەروەک چۆن کەسانێک ناسراون بە ئەنجامدانی صولح و خەڵک دەچن بۆ لایان، با چەند مامۆستایەکی ئایینی و کەسایەتیەکی ناسراویش هەڵسن بە ئەنجامدانی حوکم کردن لەنێوان

خەڵکی ناکۆک بە پێی شەرعی اللە، وە کاتێک بە لایەنی بەرامبەر دەڵێی با بچین بۆ لای فلان مەلا با بە پێی شەرعی اللە حوکم بکات لەنێوانمان ئەوا ئەگەری زیاترە بە دەمتەوە بێت، وە لە حاڵەتێکدا کە دەزانیت بە پێی شەرع لایەنی بەرامبەر لەسەر حەقە ئەوا بە پێی شەرع حەقەکەی پێ بدە و دەمی دابخە تاکو توشی مەحکەمە و سکاڵات نەکات ئەوکات بە ناچاری بچیتە بەردەم حاکم حوکم بکات لەنێوانتان بە یاساکانیان و سزاشت بدات، وە ئەگەر حەق تۆ لای ئەو بوو بەڵام ئامادە نەبوو پێتی بدات هەوڵدە بە هەڕەشە یان بە زەبری هێز لێی بسەنی گەر زانیت ئەنجامدانی ئەم کارە سودی هەیە و زیانێکی گەورەتری دینی و دونیاییت توش ناکات، وە ئەگەر هیچ لەم ڕێگایانە سودی نەبوو، حەقەکە شتێکی بێ نرخ بوو لە پێناوی اللە چاوپۆشی لێ بکە، وە ئەگەر ناتوانی چاوپۆشی لێ بکەیت و تاکە ڕێگا حوکم بردنەوە بوو بۆ یاسا، هەوڵدە بە حاکمەکە بڵێی کە حوکم بکات لەنێوانتان بە شەرعی اللە، ئەوە نیشان بدەیت کە تۆ بە غەیری شەرعی اللە ڕازی نیت، واتا تۆ لەم کاتەدا حاکمەکە تەنها وەک هۆکارێک بەکار دەهێنیت کە بە زەبری هێز دەتوانێ حەقەکەت بۆ وەرگرێتەوە، وە ئەگەر هیچ لەمانە سودی نەبوو ئەوا إن شاء اللە عوزرت هەیە و تاوانبار نیت بەو مەرجانەی کە لە پێشوودا باسمان کرد، وە هەموو ئەم ووتانەی کە ئێستا باسم کرد لە بواری ئەوە بوو ئایا تاوانبار دەبیت یان نا، نەک لە بواری ئەوە بێت ئایا کافر دەبیت یان نا، وەک ووتمان مەرجەکانی تەکفیر ڕوونترن لەم بابەتەدا.

لە بەرواری ٢٠٢٠/٩/٣٠ دەستم کرد بە نوسینی ئەم کتێبە
لە بەرواری ٢٠٢١/١/٩ بە کۆتا هات

**وصلى الله على نبينا محمد وعلى آله وصحبه أجمعين**

# سەرچاوەکان


**(أ)**

١/ [الإبانة الكبرى - ابن بطة] ت: عادل آل حمدان / ط: دار اللؤلؤة (٢)

٢/ [أحكام القرآن - إلكيا الهراسي] ت: جماعة من العلماء / ط: دار الكتب العلمية (١)

٣/ [أحكام القرآن - الجصاص] ت: محمد الصادق قمحاوي / ط: دار إحياء التراث العربي - مؤسسة التاريخ العربي

٤/ [أحكام القرآن - القاضي بكر بن العلاء القشيري] ت: سلمان الصمدي / ط: جائزة دبي الدولية للقرآن الكريم (١)

٥/ [أخبار القضاة - وكيع القاضي] ت: عبدالعزيز مصطفى المراغي / ط: المكتبة التجارية الكبرى (١)

٦/ [استدراكات على تاريخ التراث العربي - حكمت بشير ياسين] ط: دار ابن الجوزي

٧/ [أصول السنة - ابن أبي زمنين] ت: أبو مالك الرياشي / ط: دار الفرقان (١)

٨/ [أضواء البيان - الشنقيطي] ط: دار عالم الفوائد (١)

٩/ [إعراب القرآن - النحاس] ت: خالد العلي / ط: دار المعرفة (٢)

١٠/ [الأموال - أبو عبيد القاسم بن سلام] ت: أبو أنس سيد بن رجب / ط: دار الهدي النبوي - دار الفضيلة (١)

١١/ [أنساب الأشراف - البلاذري] ت: سهيل زكار - رياض زركلي / ط: دار الفكر (١)

١٢/ [الإيضاح لناسخ القرآن ومنسوخه - مكي بن أبي طالب] ت: أحمد حسن فرحات / ط: دار المنارة (٢)

**(ب)**

١٣/ [بحر العلوم - السمرقندي] ت: عادل أحمد عبدالموجود - علي محمد معوض - زكريا عبدالمجيد النوتي / ط: دار الكتب العلمية (١)

١٤/ [البحر المحيط - أبو حيان الأندلسي] ت: عادل أحمد عبدالموجود - علي محمد معوض / ط: دار الكتب العلمية (١)

١٥/ [البداية والنهاية - ابن كثير] ت: التركي / ط: دار هجر (١)

**(ت)**

١٦/ [تاريخ - ابن خلدون] ت: خليل شحادة / ط: دار الفكر

١٧/ [التحرير والتنوير - ابن عاشور] ط: دار التونسية

١٨/ [تذكرة الأريب في تفسير الغريب - ابن الجوزي] ت: طارق فتحي السيد / ط: دار الكتب العلمية (١)

١٩/ [التسهيل لعلوم التنزيل - ابن جزي الكلبي] ت: محمد سالم هاشم / ط: دار الكتب العلمية (١)

٢٠/ [التصاريف - يحيى بن سلام] ت: هند شلبي / ط: مؤسسة آل البيت الملكية للفكر الإسلامي

٢١/ [تعظيم قدر الصلاة - المروزي] ت: عبدالرحمن بن عبدالجبار الفريوائي / ط: مكتبة الدار بالمدينة المنورة (١)

٢٢/ [تفسير - ابن أبي حاتم] ط: دار ابن الجوزي (١)

٢٣/ [تفسير - ابن كثير] ت: سامي بن محمد السلامة / ط: دار طيبة (٢)

٢٤/ [تفسير - ابن المنذر] ت: سعد بن محمد السعد / ط: دار المآثر (١)

٢٥/ [تفسير - أبي السعود] ط: دار إحياء التراث العربي

٢٦/ [التفسير البسيط - الواحدي] ت: مجموعة من الباحثين / ط: جامعة الإمام محمد بن سعود الإسلامية

٢٧/ [تفسير - البغوي] ت: محمد عبدالله النمر - عثمان جمعة ضميرية - سليمان مسلم الحرش / ط: دار طيبة (١)

٢٨/ [تفسير - البكري] ت: أحمد فريد المزيدي / ط: دار الكتب العلمية (١)

٢٩/ [تفسير - الثعلبي] ت: أبو محمد علي بن عاشور - نظير الساعدي / ط: دار إحياء التراث العربي (١)

٣٠/ [تفسير - الراغب الأصبهاني] نامەی ماجستێری قوتابی: هند بنت محمد بن زاهد سردار / جامعة أم القرى - كلية الدعوة وأصول الدين - قسم الكتاب و السنة (چاپ نەكراوە)

٣١/ [تفسير - السعدي] ت: عبدالرحمن بن معلا اللويحق / ط: دار السلام (٢)

٣٢/ [تفسير - سفيان الثوري] ت: امتياز علي عرشي / ط: مكتبة رضا

٣٣/ [تفسير - السمعاني] ت: أبو تميم ياسر بن إبراهيم / ط: دار الوطن (١)

٣٤/ [التفسير- من سنن سعيد بن منصور] ت: سعد بن عبدالله آل حميد / ط: دار الصميعي (١)

٣٥/ [تفسير- الطبري] ت: التركي / ط: دار هجر (١)

٣٦/ [تفسير- عبدالرزاق] ت: محمود محمد عبده / ط: دار الكتب العلمية (١)

٣٧/ [تفسير- عبد بن حميد] ت: مخلف بنيه العرف / ط: دار ابن حزم (١)

٣٨/ [تفسير القرآن العظيم - أبو منصور الماتريدي] ت: فاطمة يوسف الخيمي / ط: مؤسسة الرسالة ناشرون (١)

٣٩/ [تفسير- القرطبي] ت: التركي / ط: مؤسسة الرسالة (١)

٤٠/ [التفسير الكبير- الرازي] ط: دار الفكر (١)

٤١/ [تفسير- مجاهد] ت: محمد عبدالسلام أبو النيل / ط: دار الفكر الإسلامي الحديثة (١)

٤٢/ [تفسير- المراغي] ط: الحلبي (١)

٤٣/ [تفسير- مقاتل بن سليمان] ت: عبدالله محمود شحاتة / ط: مؤسسة التاريخ العربي (١)

٤٤/ [تفسير المنار- محمد رشيد رضا] ط: دار المنار (٢)

٤٥/ [تفسير- النسفي] ت: يوسف علي بديوي / ط: دار الكلم الطيب (١)

٤٦/ [التفسير الواضح - ابن وهب الدينوري] ت: عبدالله بن محمد الأمين الشنقيطي - رسالة الدكتوراه/ الجامعة الإسلامية بالمدينة المنورة

٤٧/ [تفسير- يحيى بن سلام] ت: هند شلبي / ط: دار الكتب العلمية (١)

٤٨/ [التمهيد - ابن عبدالبر] ت: بشار عواد معروف / ط: مؤسسة الفرقان للتراث الإسلامي (١)

٤٩/ [التوضيح عن توحيد الخلاق في جواب أهل العراق - محمد بن علي بن غريب] ت: أمين بن أحمد السعدي - عارف بن مزيد بن حامد السحيمي / ط: دار التوحيد (١)


**(ج)**


٥٠/ [جامع - الترمذي] ت: بشار عواد معروف / ط: دار الغرب الإسلامي (١)

٥١/ [الجامع في كتب الإيمان والرد على المرجئة] ج و ت: عادل آل حمدان/ ط: دار الأوراق الثقافية (١)

٥٢/ [جامع المسائل - ابن تيمية] ت: علي العمران / ط: دار عالم الفوائد

٥٣/ [جزء فيه مجلسان من إملاء النسائي - النسائي] ت: الحويني / ط: دار ابن الجوزي (١)

٥٤/ [جمهرة مقالات أحمد شاكر] ج و ت: عبدالرحمن بن عبدالعزيز بن حماد العقل / ط: دار الرياض (١)

٥٥/ [الجواب الصحيح لمن بدل دين المسيح - ابن تيمية] ت: علي بن حسن بن ناصر - عبدالعزيز بن إبراهيم العسكر - حمدان بن محمد الحمدان / ط: دار العاصمة (٢)

**(خ)**

٥٦/ [الخطط - المقريزي] ت: محمد زينهم - مديحة الشرقاوي / ط: مكتبة مدبولى (١)

**(د)**

٥٧/ [درة التنزيل وغرة التأويل - الخطيب الإسكافي] ت: محمد مصطفى آيدين / ط: جامعة أم القرى (١)

٥٨/ [الدرر السنية] ج و ت: عبدالرحمن بن محمد بن القاسم

٥٩/ [الدر المنثور - السيوطي ] ت: التركي / ط: مركز هجر (١)

**(ر)**

٦٠/ [الرسالة - الشافعي] ت: أحمد شاكر / ط: الحلبي (١)

٦١/ [رموز الكنوز - عز الدين الرسعني] ت: عبدالملك بن عبدالله بن دهيش / ط: مكتبة الأسدي (١)

٦٢/ [روح المعاني - الألوسي] ت: مجموعة من الباحثين / ط: مؤسسة الرسالة (١)

**(ز)**

٦٣/ [زاد المسير - ابن الجوزي] ط: المكتب الإسلامي - دار ابن حزم (١)

٦٤/ [زهرة التفاسير - محمد أبو زهرة] ط: دار الفكر العربي

**(س)**

٦٥/ [سبيل النجاة والفكاك - حمد بن عتيق] ت: الوليد بن عبدالرحمن الفريان (٢)

٦٦/ [السراج المنير - الخطيب الشربيني] ط: بولاق

٦٧/ [سنن سعيد بن منصور] ت: حبيب الرحمن الأعظمي / ط: دار السلفية (١)

٦٨/ [السياسة الشرعية - ابن تيمية] ت: علي العمران / ط: دار عالم الفوائد

٦٩/ [سير أعلام النبلاء - الذهبي] ت: مجموعة من المحققين - بإشراف شعيب الأرناؤوط / ط: مؤسسة الرسالة (١١)

٧٠/ [السيرة النبوية - ابن هشام] ت: عمر عبدالسلام تدمري / ط: دار الكتاب العربي (٣)

**(ص)**

٧١/ [صبح الأعشى - القلقشندي] ت: محمد حسين شمس الدين / ط: دار الكتب العلمية

٧٢/ [صحيح البخاري] ط: وزارة الأوقاف السعودية (١)

٧٣/ [صحيح مسلم] ت: محمد فؤاد عبدالباقي / ط: الحلبي (١)

٧٤/ [صفوة الآثار والمفاهيم - عبدالرحمن بن محمد الدوسري] ط: دار المغني (١)

٧٥/ [الصلاة - ابن القيم] ت: عدنان بن صفاخان البخاري / ط: دار عالم الفوائد

٧٦/ [صيانة مجموع الفتاوى من السقط والتصحيف - ناصر الفهد] ط: أضواء السلف (١)

**(ط)**

٧٧/ [طبقات الشافعية الكبرى : السبكي الصغير] ت: محمود الطناحي - عبدالفتاح الحلو / ط: الحلبي

٧٨/ [الطرق الحكمية في السياسة الشرعية - ابن القيم] ت: نايف بن أحمد الحمد / ط: دار عالم الفوائد (١)

**(ع)**

٧٩/ [العزلة - الخطابي] ت: ياسين محمد السواس / ط: دار ابن كثير (٢)

٨٠/ [عمدة التفسير - أحمد شاكر] ط: دار الوفاء (٢)

**(ف)**

٨١/ [فتاوى ورسائل محمد بن إبراهيم آل الشيخ] ج و ت: محمد بن عبدالرحمن بن قاسم / ط: مطبعة الحكومة بمكة المكرمة (١)

٨٢/ [فتح الباري - ابن رجب] ت: طارق بن عوض الله / ط: دار ابن الجوزي (١)

٨٣/ [فتح المجيد - عبدالرحمن بن حسن آل الشيخ] ت: الوليد آل فريان / ط: دار الصميعي

٨٤/ [الفصل في الملل والأهواء والنحل - ابن حزم] ت: محمد إبراهيم نصر - عبدالرحمن عميرة / ط: دار الجيل (٢)

**(ق)**

٨٥/ [القواعد النورانية الفقهية - ابن تيمية] ت: أحمد بن محمد الخليل / ط: دار ابن الجوزي (١)

**(ك)**

٨٦/ [الكتاب والسنة يجب أن يكونا مصدر القوانين في مصر - أحمد شاكر] ط: دار الكتب السلفية (٣)

٨٧/ [الكشاف - الزمخشري] ت: خليل مأمون شيحا / ط: دار المعرفة (٣)

٨٨/ [كشف غياهب الظلام عن أوهام جلاء الأوهام - سليمان بن سحمان] ط: أضواء السلف (١)

**(ل)**

٨٩/ [اللباب في علوم الكتاب - ابن عادل الحنبلي] ت: عادل أحمد عبدالموجود - علي محمد معوض / ط: دار الكتب العلمية (١)

**(م)**

٩٠/ [مؤلفات الشيخ الإمام محمد بن عبدالوهاب] ت: عبد العزيز بن زيد الرومي - محمد بلتاجي - سيد حجاب / ط: جامعة الإمام محمد بن سعود

٩١/ [مجموعة الرسائل والمسائل النجدية] ط: المنار (١)

٩٢/ [مجموع الفتاوى - ابن تيمية] ج و ت: عبدالرحمن بن محمد بن قاسم / ط: مجمع الملك فهد

٩٣/ [محاسن التأويل - القاسمي] ت: محمد فؤاد عبدالباقي / ط: الحلبي (١)

٩٤/ [المحرر الوجيز- ابن عطية] ت: عبدالسلام عبدالشافي محمد / ط: دار الكتب العلمية (١)

٩٥/ [مختصر الإيمان الكبير- محمد بن عبدالوهاب] ت: الشبراوي بن أبي المعاطي / ط: دار المنهاج (١)

٩٦/ [مختصر تفسير يحيى بن سلام - ابن أبي زمنين] ت: حسين بن عكاشة و محمد بن مصطفى الكنز/ ط: دار الفاروق الحديثة (١)

٩٧/ [مختصر تفسير يحيى بن سلام - هود بن محكم الهواري] ت: بالحاج بن سعيد شريفي / ط: دار الغرب الإسلامي (١)

٩٨/ [مدارج السالكين - ابن القيم] ت: محمد المعتصم بالله البغدادي / ط: دار الكتاب العربي (٧)

٩٩/ [مذكرة أصول الفقه على روضة الناظر- الشنقيطي] ط: دار عالم الفوائد (١)

١٠٠/ [مسائل الإمام أحمد رواية ابن هانئ] ت: زهير الشاويش / ط: المكتب الإسلامي (١)

١٠١/ [مسائل الإمام أحمد رواية أبي داود] ت: طارق بن عوض الله / ط: مكتبة ابن تيمية (١)

١٠٢/ [مسائل الإمام أحمد رواية الشالنجي] ت: عبدالرحمن بن أحمد الجميزي / ط: دار العاصمة (١)

١٠٣/ [مسائل الإيمان - القاضي أبو يعلى] ت: سعود بن عبدالعزيز الخلف / ط: دار العاصمة (١)

١٠٤/ [المستدرك على الصحيحين - الحاكم] ط: دار التأصيل (١)

١٠٥/ [مسند أحمد] ت: شعيب الأرنؤوط / ط: مؤسسة الرسالة (١)

١٠٦/ [مسند الدارمي] ت: نبيل بن هاشم بن عبدالله الغمري / ط: دار البشائر الإسلامية (١)

١٠٧/ [مصنف عبدالرزاق] ط: دار التأصيل (١)

١٠٨/ [معاني القرآن - النحاس] ت: محمد علي الصابوني / ط: جامعة أم القرى (١)

١٠٩/ [معاني القرآن وإعرابه - الزجاج] ت: عبدالجليل عبده شلبي / دار عالم الكتب (١)

١١٠/ [معجم متن اللغة - أحمد رضا العاملي] ط: دار مكتبة الحياة

١١١/ [المفهم لما أشكل من تلخيص كتاب مسلم - أبو العباس القرطبي] ت: محيي الدين ديب مستو - يوسف علي بديوي - أحمد محمد السيد - محمود إبراهيم بزال / ط: دار ابن كثير- دار الكلم الطيب (١)

١١٢/ [منهاج التأسيس والتقديس - عبداللطيف بن عبدالرحمن آل الشيخ] ط: دار الهداية (٢)

١١٣/ [منهاج السنة النبوية - ابن تيمية] ت: محمد رشاد سالم / ط: جامعة الإمام محمد بن سعود الإسلامية

١١٤/ [الموافقات - الشاطبي] ت: عبدالله دراز / ط: وزارة الأوقاف السعودية

**(ن)**

١١٥/ [الناسخ والمنسوخ - النحاس] ت: سليمان بن إبراهيم بن عبدالله اللاحم / ط: دار العاصمة (١)

١١٦/ [نشر طي التعريف في فضل حملة العلم الشريف - جمال الدين الحبيشي الوصابي] ت: عبدالله عبده عبدالله الوردي

١١٧/ [نكت القرآن - الكرجي القصاب] ت: علي بن غازي التويجري / ط: دار ابن القيم - دار ابن عفان (١)

١١٨/ [النكت والعيون - الماوردي] ت: السيد بن عبدالمقصود بن عبدالرحيم / ط: دار الكتب العلمية- مؤسسة الكتب الثقافية

١١٩/ [النوادر والزيادات - ابن أبي زيد القيرواني] ت: محمد الأمين بو خبزة / ط: دار الغرب الإسلامي (١)

**(هـ)**

١٢٠/ [الهداية إلى بلوغ النهاية - مكي بن أبي طالب] ت: مجموعة من الباحثين / ط: جامعة الشارقة (١)

**(و)**

١٢١/ [الوجيز في تفسير الكتاب العزيز - الواحدي] ت: صفوان عدنان داوودي / ط: دار القلم - دار الشامية (١)

١٢٢/ [الوسيط في تفسير القرآن المجيد - الواحدي] ت: مجموعة من الباحثين / ط: دار الكتب العلمية (١)